







بیروباوەڕ لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا

١

# بیروباوەڕبوون بە خوا

نووسینی
**د. عومەر سلێمان ئەشقەر**

وەرگێڕانی
**ئارامی گەلاڵی**



زنجیرەی:
بیروباوەڕ لەبەر رۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا
ناوی کتێب:
بیروباوەڕبون بە خوا
نوسینی:
دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر
وەرگێڕانی:
ئارامی گەلاڵی
ئەرکی چاپ:
پرۆژەی وەرگێڕان
پیتچنین:
نووسینگەی تەفسیر بۆ کۆمپیوتەر
چاپی یەکەم ١٤٢٠ک ٢٠٠٠ ز
چاپی عەرەبی حەفتەم/ ١٤١١ک ١٩٩١ز
چاپکردنی : چاپخانەی پەروەردە
تیراژ : ١٠٠٠
ژمارەی سپاردن : ٢٠٥ ساڵی ١٩٩٩



بیروباوەڕ لەبەر ڕۆشنایی

قورئان و سوننەتدا

# بیروباوەڕبوون بەخوا

نووسینی

**دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر**

وەرگێڕانی

**ئارامی گەلاڵی**

# پێشەکی وەرگێڕان

بیروباوەڕی ئیسلامی بناغەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە ، تا بەهێزتر بێ موسڵمانێتی بەرهەمدارترو بەرهەمی بەپێزترو پێزی فرەوانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی بو کەگەورەترین وەرچەرخانی بێوێنەی دەستە مێژوی مرۆڤایەتی، مرۆڤایەتی لە نشێوی‌و داڕوخان و وێرانی رزگار کرد، رەوشی ستەمئامێزی تارومار کرد، دەستی رەشی زۆردارانی بڕی، کۆیلەو چەوساوانی رەهاکرد، باڵی بەزەیی‌و دادگەری بەسەر جیهاندا راهێڵا‌و سەرجەم گەل و توێژی خەڵکی لەبەر سێبەرە فێنك و ئارامەکەی هەسایەوە، ئاگری خراپەکاری‌و کوشت وبڕو تالآن و بڕۆ و بەرهەڵدایی‌و بێنابڕویی کوژایەوە، روحی مرۆڤپەروەری‌و رێزی مرۆڤ ژیایەوە.

گەشانەوەی گوڵی چاکەکاری‌و خۆشی‌و دادو رێزو هێمنی‌و خۆشگوزەرانی‌و ئازادی‌و سەربەستی بەهۆی بیروباوەڕی ئیسلامییەوە دێتەدی، بەڵام تەقینەوەی بورکانی وێرانی‌و خراپەکاری‌و ناخۆشی‌و ستەم و بێهودەیی‌و نیگەرانی‌و تالگەردی‌و ژێر دەستەیی‌و کۆیلایەتیش بەهۆی بیروباوەڕی نائیسلامییەوە بەرپادەبێ، چونکە هەمویان لەسەرچاوەی هەواو هەوەست و ئاوەزی بەرژەوەندی‌ناسی و هزری کاریگەر بەدەوروبەرێکی دیاریکراو دێنەکایەوە.

بیروباوەڕ ئەگەر ئیسلامی نەبێ وێرانەو وێرانی دەنێتەوە ئەگەرچی بانگەشەی بنیات نان و چاکسازیش بکات. مێژو لەم وێرانکاریانە سیخناخ بوە کە هەرجارەی بیروباوەڕێکی قرپۆك پەیدابوەو مرۆڤایەتی کردۆتە قوربانی ، ئەدی بیروباوەڕە سەفسەطیەکەی نەسرانیەکان نەبو کەبەر لەئیسلام و تاکو ئێستاش کێشەیانە ئاخۆ (مەسیح) خوایە یان مرۆڤ! هەزاران هەزار مرۆڤی کردە قوربانی‌و سەدان شەڕو کوشتاری درێژخایەنی نایەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی ئەستێرەناسی گەندەڵی فیرعەونەکان نەبو کە هەزاران هەزار رەش و روت و هەژاری کردە کۆیلەو بەبێگاری گاشەبەردە زلەکانی ئەهراماتی پێ دەگواستنەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی شوفێنیزمی ئەوروپا نەبو کە دوجەنگی گەورەی جیهانی بەرپاکرد و بەملیۆنان مرۆڤیان کرد بە قوربانی ؟!، ئەدی هەر بیروباوەڕە شەیتانیەکان نیە کە وای کردوە هەمو رۆژێ بۆمبای ئەتۆمی‌و هایدرۆجینی‌و نیوترۆنی بۆ وێرانکردنی مرۆڤایەتی‌و زەوی وەبەرهەم بێ ؟!

چاك سازانەوەی رەوشی مرۆڤایەتی، رەوینەوەی ترسی وێرانی، گەڕانەوەی خۆشی‌و ئارامی، بەرپاکردنەوەی دادگەری لەسەرتاسەری جیهاندا؛ بەهۆی برافێکەوە دەبێ کە لەسەرر بیروباوەڕێکی پاك و بێگەرد دامەزرا بێ‌و لەقورئان و سوننەت هەڵێنجرا بێ، ئەگەر نا هەر وێرانی لەناو وێرانی بەرپادەبێ‌و مرۆڤایەتی وێرانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی کاریگەرێکی قوڵ و گەورەی لەخۆ گرتـوە، کاریگـەرێکی ئـەوتۆ کە ئەگەر مرۆڤ هەرچەندی تاوانکارو دڵڕەق و بێبەزەیی و وێرانکاریش بـێ، سـەرلەبەری کیانی ئەم مرۆڤە دەگۆڕێت، گۆڕانێك هـەمو لایەنـەکانی بگرێتـەوە، چونکـە بیروبـاوەڕی ئیسلامی چارەسەرو ئامۆژەکـانی بـۆ رەگ و ریشـاڵی مرۆڤـە، هـزرو نـاوەزو دەرونـی رێکدەخاتەوەو تەپ و تۆزی شەیتان و هەوەست و خۆپەرستی لەسـەر دەرونـی لادەدات و پـاکی دەکاتـەوە، ئـەمجار رێوشـوێنێکی راسـتاڵی بـۆ رادەنوێنـێ و پێـی دەڵـێ فـەرمو ئەمەش ژیانی خۆشبەخت و بێوێنەو نمونەیی.

هەر نوسەرێکی موسڵمان لەهەر دەرگایەکـەوە چوبێتـە نێـو ئـەم بیروبـاوەڕەوە یـان لەهـەر گۆشە نیگایەکـەوە تێـی روانیبـێ و خزمـەتێکی پێشـکەش کردبـێ و متمانـەی بەسەرچاوەی بێگەردو دور لە خورافات و شتی بێهودە کردبێ هەڵبەت کارێکی گـەورەی ئەنجام داوەو خزمەتەکەی بەشێکە لەم رزگاربونە سەرتاسەرییەی کە مرۆڤایەتی دەمێکـە بۆی عەودالە. دیارە ئەم زنجیرەیەی کە دکتۆر عومەر سلێمان الأشقر نوسیویەتی و ناوی ناوە ((العقيدة في ضـــوء الكتـــاب والســـنة)) بەشداربون و خزمـەتێکی گـەورەی ئـەم مەیدانەیـە، کـە متمانـەی کردۆتـە سـەر سـەرچاوەو ژێـدەرە رەسـەنەکانی بیروبـاوەڕو بیروباوەڕە پوکەڵ و لاڕێو ناتەواوەکانی لێ داوەشاندوەو پاك و پوختەکەی راگـەیاندوە، کە هەڵبەت ئەمە خاڵی هەرە سەرەکیە لەرانواندنی بیروباوەڕی ئیسـلامیدا، ئوسـلوبێکی سـادەو رێك و پێك و زانسـتیانەی بـەکارهێناوە بەتایبـەتی لەپەرتوکـەکانی دواییـدا، ناوەرۆکی پەرتوکەکـەش پـتر ئایـەت و فـەرمودەو دەقـی زانـا بـەرزەکانی هێناوەتـەوەو لەبەرتیشکی ئەم دەقانەوە بیروباوەڕەکەی رۆشن کردۆتەوە، ئەم زنجیرەیە کە بڵاوبۆوە موسڵمانان بەگـەرمی پێشـوازیان لێکـردو گـەلێ زانـاو نوسـەریش لـە نوسـراوەکانیاندا ئاماژەیان بۆ کردوە تا موسڵمانان بەهرەی لێوەرگرن، لەناو موسڵمانانی کوردیش سـەیر دەکەین چەندین نۆرە چاپی لێ دەردەکرایەوە، کە ئەمـەش بەڵگەیـە بـۆ چـاکی و سـودی ئەم زنجیرەیە، بەم پێودانگە پێمان وایە وەرگێرانی ئەم زنجیرەیە گەلێك پێویست بو بـۆ رابونی ئیسلامی لەکوردستان، تا گەلی کوردیش لەبیروباوەڕە سازگارەکەی خـۆی حـاڵی بێت و لاڕێ نەبێ، لەبەر گرنگـی و لەبـەر چـاکی و بـەهرەی ئـەم زنجیرەیـە، پشـت بـەخوا بڕیارمان دا وەری‌گێرینە سەر زمانی کـوردی، لەوەرگێرانەکـەدا هـەوڵمان داوە ئاسـتێکی زمانـەوانی باشـی پـێ‌بدەین و ئیشـکالات بـۆ خوێنـەر بەجێ‌نـەهێڵین، وا بەرهەمـەکان لەبەردیدی خوێنەرانـەو ئـەوان دەتوانـن وەرگێرانەکـە هەڵسـەنگێنن ، لـەخوا داواکـارین لەکارەکەماندا سـەرکەوتووبین و توانیبمـان خزمـەتێك بـەم رابونـە پـیرۆزەی کوردسـتان بکەین، خوا پاداشتی بەرهەراوی خۆی بەئێمەو ئێوەش ببەخشێ.

ژیوانی گەلالی و ئارامی گەلالی

مەبەست لەم زنجیرەیە

# زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

١. دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

٢. ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامیو سازێنەری بێداریو رابوونی ئیسلامیی پیرۆزن.

٣. شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت وبەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتیو تاکڕەویو رەوتگەرایی.

٤. بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆرانکاریانەی هەبێ کە خودای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین.

با دەستووریشمان لەوەرگرتن فەرمایشتەکەی خودای پەروەردگار بێت.

﴿ الذّينَ يَستَمعونَ القَولَ فَيَتبَعونَ أحسَنَهُ. أولئِكَ الذّينَ هَداهُمْ الله وَأولئِكَ هُمْ أولُوا الالبابْ ﴾. (زمر –١٨)

نووسینگەی تەفسیر

# ڕێخۆشەکی

" إن الحمد لله نحمده نستعينه ونستغفره ونستهديه ونتوب إليـه ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنـا، مـن يـهده الله فلا مضل له ومن يضلل فـلا هـادي لـه، وأشـهد أن لا إلـه إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله . "

## خوێنەری خۆشەویست!

ئەو پەڕتوکەی لەبەردەستت دایە بیروباوەڕی ئیسلامی ڕۆشن دەکاتـەوەو لـە بارەی بابەتەکانی دەدوێ. لـە خـودا دەخـوازم نوسـەرو بڵاوکـارو خوێنـەرانی پـێ بەهرەمـەند بکـات، بیکاتـە کردەوەیـەك پـاك لـە پێنـاوی ئـەودا بێـت، بیکاتـە پاشەکەوتی ڕۆژی ژیانەوەم.

ئەم پەڕتوکە هەر لە ناوەکەیرا دیـارە دەربـارەی بیروبـاوەڕی ئیسـلامیەو لـە هـەردو ژێـدەری قورئـانو سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ سـەرچاوەی گرتـوە. ئـەو دو ژێدەرەی کە نەوەی یەکەمی ئەم نەتەوەیە بیروباوەڕیان لێ وەرگرتبو.

پێـم وا نیـە کـەس گومـانی لـەوەدا هـەبێ کـە بیروبـاوەڕی ئـەم پیـاوە هەڵکەوتوانە، وەکو ئاوی دەریایەکی ئارام هێندە زوڵاڵ و، وەکو شاخی نەلەخشـاو هێندە سەقام و، وەکو ڕێسمانی سفت هێندە پتەو نەبوبێ.

خودا بە سایەی ئەو بیروباوەڕمەندانەوە ڕێڕەوی مێـژوی مرۆڤایـەتی گـۆڕی، کەواتە بۆچی ئەگەر بیروباوەڕمان لەو کانیاوە سازگارە ئاودێر بکەین کە پیاوچاکە پێشوەکانمان لێیەوە تێراوو پاراو بون سەرزەنشت بکرێین؟!.

زۆر کەسو کۆمەڵ هەن لە وتەو وتارو نوسینەکانیان بانگەشەی گەڕانەوە بۆ قورئانو سوننەت دەکەن، کەچی لە بواری بیـانوبڕیو بەڵگـە خوازیـداو لـە بـواری کارپێکردنو ڕێ پێ بەدیکردندا سەرپێچی تێدا دەکەن.

هەیانە راو بۆچونی کەسان بە پێش دەقە قورئانیو فەرمودەییەکان دەخەن، هەیانە لە ئاکار ڕەفتاردا بە ڕێنمایی دیکەی نائیسلامی دەگوزەرێنن.. لەبەر ئـەوە

له پێشەکی ئەم کتێبەدا پشیم درێژ کردۆتەوە گوتومە بوار نیەو هەر دەبێ رو بکەینە ئەو دو ژێدەرەکە قورئانو سوننەتە تەواوەکانو لەوانەوە بیروباوەڕو شەریعەت وەرگرین. هەروەها گومانەکانی هەندێ لەو کەسو کۆمەڵانەشم خستۆتە رو کە لەگەڵ سوننەتدا نەیارن.

پێشەکیەکە جگە لەم بابەتە چەندین توێژینەوەی دیکەشی لە ئامێز گرتوە، وەکو پێناسینی بیروباوەڕو رونکردنەوەی شوێن پایەی لە شەریعەتو بڕوادا، حوکمی ئەوانەشم دەرخستوە کە لالوتی لە هەمو یا لە بنەڕەتێکی ئەم بیروباوەڕە دەکەن. هەروەها رەوشی گومانەکانی ئەو کۆمەڵانەشم رون کردۆتەوە کە خەڵکانیان تەنها بە ئەنجامدانی گوناهان کافر کردوە.

دیسان هەر لەو پێشەکیەدا لە یادم نەکردوە تیشك بخەمە سەر ئەو رێوشوێنە ئیمانیە قورئانیەی کە ئیسلام دایڕشتوەو، چۆن چۆنیش لەگەڵ رێوشوێنی فەلسەفی- کەلامناسیدا تەکولۆیە کە هەزارو یەك مەرگەساتی جەرگبڕی بەسەر ئەم نەتەوەیەدا هێناوە.

خوازیارم لە بەدەرخستنی جیاوازی نێوان ئەو دو رێوشوێنەدا هەڵەم نەکردبێو کامگار بوبم، چ لە بابەت کانگاو ژێدەرەکانیانەوە بێ یان لە بابەت رێگەی بەڵگە خوازی بێ یان لە بابەت رێو پەیڕەوە بێو یاخود لە بابەت پێ بەخشینەوە بێ هەتەرم.

لەو ناوەداو لە میانەی ئەو رونکاریانەدا ناوازەیی رێوشوێنی قورئانو تایبەتمەندییەکانی وەك مانگی چواردە درەخشانە.

لە بەشی *"بڕوا بون بە خودا"* ئەو بەڵگانەی تێدا دەدۆزیەوە کە بونی خودا دەسەلمێننو گومانی بێبڕوایان دەپوچێنتەوە، هەروەها بەرپەرچی ئەوانەشی تێدا دەدرێتەوە کە دەڵێن بونەوەر بە *(رێکەوت)* هاتۆتەدی یان پێیان وایە (سروشت) ئەفراندویێتی. پاشان هاتوینە سەر ئەو دو رێگەیەی خودامان پێ دەناسێنێ. بۆ هەموشیان، دەقی قورئانو فەرمودانمان هێناوەتەوە.. جێباسەکانی ئەم بابەتە کرۆكو ناوەرۆکی ئەم پەرتوکەیە.

دیارە ئەم بابەتە چەندە جێبایەخو گرنگە، دیارە هەر ئەوەشە هەردی فرەرێ بونی ئەم نەتەوەیە، بۆیە بە پەسەندو پێویستم زانی باسی ئەو بنەڕەتانەش بکەم کە لەبەر رۆشناتیاندا واتای ئەو دەقانە ئاشکرا دەبێ کە ناو و سیفەتەکانی خودامان پێ دەناسێنێ، هەروەها باسی ئەو بنچینە گرنگانەش بکەم

که ئەو کێشـەیە رۆشـن دەکاتـەوەو بەرپـەرچی لاڕێ بوانـی رێـی ئیمـانی قورئـانی دەداتەوە.

لە کۆتاییەکەشدا چەمك و چۆنیەتی هاتنەدی یـەکخوا ناسـیم خسـتۆتە رو کـە دروشمەکـەی (لا إلـه إلا الله)یـە، هـەروەها واتـاو مـەرج و هەڵوەشـێنەرەوەو هاودژەکانیشم رون کردۆتەوە.

پاشان هەندێکیشم لە بابەت مێژوی بیروباوەڕی پەرستراوێتی بـاس کـردوەو کرچ و پوچـاتی دیـدەوەری پەرەسـەندنی بیروبـاوەڕ (نظریـة تطـور العقیـدة)م رون کردۆتەوە.

بۆ گەلاڵە بونی ئەم پەڕتوکە پشتم بە چەندان پەڕتوك و نوسراوی کۆن و تازە بەستوەو بەپێی ئەو ناونیشانەش سودم لێیان وەرگرتـوە کـە لەسـەر بـەرگی ئـەم پەڕتوکە نوسراوە، لە پاشبەندیشدا هەندێکیانم نوسیوە.

رەنگە خەڵکانێك هەبن بەم پەڕتوکـەم شـادمان و خۆشـنود بـن، کۆمـەڵێکیش هەبن نیگەران و توڕەو تۆراو، بەڵام خودا دەزانـێ کـە ئـەو دێرانـەم نوسـیوە تەنـها خۆشنودی ئەوم لەبەر نیاز گرتوە. وەنـەبێ مەبەستم پاکانـە بـێ و هـەرچی تێیـدا نوسرابێ دروست و بێ هەڵە بێ، چونکە زۆر جـاران پێنـوس هەتـەر دەکـات و، بـیر لەنگەری دەشکێ و پەرتەوازە دەبێ و، هزر دۆش دادەمێنێ. هەرگیز نیە بێ هەڵەو پەڵەو بێ خەوش بێ، مەگەر پەیامبەری ئازیزمان ﷺ. جا ئەگەر ماموو نەمردم ئەوا هەرچی هەڵەیەو لەگەڵ فەرمودەکانی خواو پێغەمبەر ﷺ ناسـازە لێـی پەشـێمانم و بەیارمەتی خودا هەرکە پێی بزانم راستی دەکەمـەوە، خـۆ ئەگـەر مردیشـم و نـەکرا راستی بکەمەوە، وتەکەی شافیعیی پێشـەوا -بەرمیـهری خـوا بـێ- دەهێنمـەوەو دەڵێـم: "هـەر فەرمودەیـەك رەوا بـێ راڕەوی منـە، هەرکـە بینیتـان وتەیـەکی مـن پێچەوانەو دژی فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ ، بیگرن و بە دیواری دادەن".

جگە لەم پەڕتوکە -*بە یارمەتی خوا*- لە ژێـر هـەمان ناونیشـان و بـە هـەمان پێودانگ بەرگی دیکەش دەربارەی بنەڕەتەکانی بیرو باوەڕ دەردەچێ.

لە خوا دەخوازم کارم راسـت بێنـێ و یارمـەتیم بـدات، چونکـە هـەمو جمـان و جولەیەك پێزی خوای گەرەکە.

**عومەر سلێمان ئەشقەر**

کوێت ۱۸/ رەجەب/۱۳۹۸ك

۲٤/ یۆنیۆ/۱۹۸۷ز

# بیروباوەڕ

"پێناسەو ڕونکردنەوە"

خەڵك زۆرجاران لە وتوێژو ئاخاوتندا وشەی بیروباوەڕ بەکار دێنن بۆ نمونە دەڵێن: (بە بیروباوەڕی من...، هەرامە کەس بیروباوەڕەکەی چاکە...، بیروباوەڕی ئیسلامی لە هەمو شوێنکاتێکدا بەهێزترینو کاریگەرترین ئەنگێزە بوە لەو سەرکەوتنە مەزنو بالآیانەی موسوڵمانان وەدەستیان هێناوە...، لەڕاستیدا شەڕی نێوان ئێمەو جولەکان شەڕی بیروباوەڕە.. تاد).

ئاخۆ خەڵکان مەبەستیان لە وشەی "بیروباوەڕ" چ بێ؟ ئایا لە زماندا واتاکەی چیە؟ ئاخۆ شەرع چی پێ مەبەست بێ؟

بیروباوەڕ ئەو شتانەیە کەنەفس بەڕاستی دەزانێو دڵ ئۆقرەی پێ گرتوە، بیروباوەڕمەندەکەش ئاوەڕێکی ئەوتۆی پێ هێناوە کە هیچ گومانو سۆی لەگەڵدا ئاوێتەو نەبوبێ[1].

کەدەڵێن *(عَقد الحبل)* پێك هۆنینەوەیەکی سفتی ڕێسمانیان پێ مەبەستەو پێچەوانەی ڕیزاڵ ریزاڵ کردنە. لە زماندا ماددەی *(عقد)* لە دەوری واتاکانی پێ پابەند بونو تەواو دوپات کردنەوەو بەستنو گرێدان دەخولێتەوە. قورئان دەفەرموێ ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ﴾ سورەتی مائیدە/٨٩.

کەواتە سوێند بەستن بە ویستو مەبەستی دڵ دەبێ، بە پێچەوانەی ئەو سوێندە سەرزارەکیانەی هەر بەسەر زماندا ڕەت دەبێو ویستو مەبەستی دڵ لێی بێبەشە.

*(عقود)*یش: سفت ترین *(عهود)* دگرێتەوە، لەو سۆنگەوە خودا فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾ سورەتی مائیدە/١.

---

[1] رسالة العقائد: سەرنج بدە مجموع الرسائل لاپەڕە ٤٢٩. زانایانی موسوڵمانی پێشانو ئێستاش ئەم زانستەیان بە (عەقائید) ناودێر کردوە، کەچی وشەی (عەقیدە) نە لە قورئان و نە لە سوننەتیشدا دەکار نەهاتوە.

عارەبیش دەڵێن: *(أعتقد الشيء)* مەبەستیان ئەوەیە شتەکەیان تۆکمەو پتەو کردوە[٢].

لە ئیسلامدا بیروباوەڕ هەمبەری شەریعەتە، چونکو ئیسلام بیروباوەڕو شەریعەتە، شەریعەتیش ئەو ئەرەکە کردەکیانە دەگرێتەوە کە ئیسلام لە عیباداتو موعامەلاتدا هێناویەتی.

بیروباوەڕ کردەکاری نیە بەڵکو زانینکاریەو لەسەر موسوڵمانیش واجبە بە دڵ وەریگرن، چونکە خودا یان لە رێگەی قورئانەوە یان لە رێگەی سروشەوە رایگەیاندوە.

بنەڕەتەکانی بیروباوەڕیش کە خوا فەرمانی پێ کردوین بە بیروباوەڕ وەریگرین، پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودە ناسراوەکەی جبریلدا دیاری کردونو فەرمویەتی: ((**الإيمان: أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر والقدر خيره وشره من الله تعالى**)) موسلیم گێڕاویەتیەوە، واتە: بڕوا ئەوەیە، بڕوا بێنی بە خوداو بە فریشتەکانو پەرتوکەکانو پێغەمبەرانو رۆژی دوایىو قەدەری خێرو شەڕ لە لایەن خوداوەیە.

کەواتە بیروباوەڕ ئەوەیە لە دەوری چەند بابەتێکی دیاری کراوەوە دەخولێتەوەو خوداو پێغەمبەریش پێی راگەیاندوین. هەر ئەوەندەیەو شتی تر ناگرێتەوە.

ئەوانەش تا ببنە بیروباوەڕ مەرجە باوەڕێکی وای پێ بێنین هەرگیز گومانی تێوە نەگلابێ. خۆ ئەگەر گومانو سۆی لەگەل دابێ ئەوا دەبێتە (وابزانم)و قەت نابێتە (بیروباوەڕ)، بەڵگەش بۆ ئەمە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا﴾ سورەتی حوجورات/١٥. واتە: بڕواداران ئەوانەن بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوەو پاشان لێی دڕدۆنگو بە گومان نەبون. هەروەها دەفەرموێ: ﴿الم ۞ ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ سورەتی بەقەرە/١-٢ واتە: ئەم قورئانە پەرتوکێکە هیچ گومانو دودڵی تێدا نیە. هەروا دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ سورەتی ئالی عیمران/٩، واتە: خودایە تۆ

[٢] لسان العرب: عقد.

خەڵك لە رۆژێك كۆ دەكەیەوە هیچ گومانی تێدا نیە. لە سورەتی تەوبە/ئایەتی(٤٥)دا سەركۆنەی هاوبەشپەرستە درۆدۆنگەكان دەكاتو دەفەرموێ: ﴿وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ﴾ واتە: دڵیان لە دودڵی دایەو لە نێو دودڵیەكەش سەرگەردانن.

لێرەدا تێبینی دەكرێ ئەو بابەتانەی پێویستە بە بیروباوەڕ وەرگیرێن چەند شتێكی پەنامەكینو هیچیان بەرچاوەكی نین. هەر ئەوەشە كە خوا مەبەستیەتیو بڕوادارانی پێ ستایش دەكاتو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ﴾ سورەتی بەقەرە/٣، واتە: ئەوانەی بڕوا بە پەنامەكی دەهێنن. خودا پەنامەكیە، فریشتەو رۆژی دواییش هەروا، بەڵام پەڕتوكو پێغەمبەران رەنگە لە هەوەڵ زەیندا بگوترێ بەرچاوەكینو بە بینایی دەبینرێن، كەچی لێرەدا مەبەست ئەوەیە بڕوایان پێ بهێندرێت لە لای خوداوە رانێردراونو خودا ئەو پێغەمبەرانەی هەناردوەو پەڕتوكەكانیش هەر لە لای ئەو دابەزیون.. ئەوەش كارێكی پەنامەكیە.

## بیروباوەڕی دروست و بیروباوەڕی گەندەڵ

بیروباوەڕ شتێك نیە تەنیا بە ئیسلامەوە تایبەت بێ، بەڵكو پەیڕەوانی هەمو دینو ڕاڕەوێك دەبێ بیروباوەڕێكیان هەبێو شیرازەی ژینیانی پێ هەڵچنرابێ ئەمەش چۆن لەسەر كۆمەڵان دێتە دی لەسەر تاكانیش دێتە دی. بیروباوەڕیش هەر لە سەرەتای دەست پێكردنی ژیانەوە تا رۆژی دوایی لە دو جۆران تێناپەڕێ:

جۆری یەكەم: بیروباوەڕی دروستو تەواو، بریتیە لەو بیروباوەڕەی كە پێغەمبەرانی بەڕێز لە هەر شوێنكاتێكدا بە خەڵكیان راگەیاندوەو هەموشی هەر هەمان بیروباوەڕەو جیاوازیان نیە، چونكە سەرچەمیان لە لای خودای زاناو شارەزا دابەزیوەو ئاوەزیش هەڵیناگرێ بیروباوەڕ لە پێغەمبەرێكەوە بۆ پێغەمبەرێكیتر جیاوازیان هەبوبێ جا لە هەر شوێنكاتێكدا بێ.

جۆری دوەم: هەمو بیروباوەڕێكی گەندەڵ دەگرێتەوە ئەگەر چی زۆرو فرەداریش بن، بۆیە گەندەڵن چونكە زادەو بەرهەمی هزرو ئاوەزی مامۆتكو بیرمەندانی مرۆڤە. مرۆڤیش هەر چەندی دانابێو بگاتە هەر ئەندازەیەكی زیرەكیو كارزانی، هەمبێزی هزری هەر تەنگەبەرو سنوردارەو پابەستو كارتێكراوی كۆتی نەریتو بیری دەوروبەریشە.

ڕەنگە گەندەڵی بیروباوەڕ لە ئـەنجامی گۆڕیـنو کـەمو کۆتێداکردنـەوە بێـت، وەکـو جولەکـەو دیانـەکانی ئەوڕۆکە کــە هــەر لــە دێرینــەوە بیروباوەڕەکــەیان دەستکاری تێدا کـراوە، کەواتـە گـەندەڵی بیروباوەڕەکــەیان بــە هــۆی دەسـت تێوەردانو گۆڕینەوەیە ئەگەر چی لە بنەڕەتدا راستو دروست وتەواویش بوە.

## بیروباوەڕی راست و دروست ئەمڕۆکە لە کوێیە؟

ئەمڕۆکە بیروباوەڕی راستو دروست ئارای نیە مەگەر لە ئیسلام، چونکە هەر ئیسلامە خودا پاراستنەکەی بە خۆی تەرخان کردوە: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ سورەتی حیجر/٩، واتە: ئێمە خۆمان قورئانمان هەناردۆتە خوارەوە، هەر بە خۆشمان دەیپارێزین. بیروبـاوەڕی نائیسـلامی ئەگـەرچی هـەندێکیان کـەم ئەندازێك رەواشی تێدا بێ  بـەڵام هـەر ناکـا هیـچو نوێنەرایـەتی ڕەوایـەتی ناکـاتو رەوای تێدا رەنگ ناداتەوە.

ئەگەر یەکێك بە ئەزرەتی بیروباوەڕێکی ساغو رەوان بێ، با سـوڕ بزانـێ نـە لە ئاینی جولەکانو نە لە ئاینی دیانانو نە لە گوفتی پیتۆڵان چنگی ناکەوێ بەڵکو تەنهاو تەنها دەتوانێ لە دو ژێدەرە رەسەنو رەوانەکەی ئیسـلام بەدەسـتی بێنـێ کە قورئانو سوننەتی پێزدارو پاراوو سازگارو پرشنگدارن، بە هێنانـەوەی بەڵگـە؛ بە هــزرو بـیر دەسـەلمێنێو دڵ پـڕ لـە بـڕواو ئـاوەرو رونـاکیو زیندەگـی دەکـات: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَهْدِي بِهِ﴾ سورەتی شوڕا/٥٢، واتـە: هــەروەها بـۆ پێغەمبـەرانی پێشینیش سروشمان ناردو بـۆ تـۆش روحێکمـان (کـە قورئانـە) نـارد لـە فـەرمانی خۆمان، تۆ نەتدەزانی بڕوا چیەو لە ناوەڕۆکی قورئان بـێ ئاگا بـوی، بـەڵام ئێمـە ئەوەمان کردە نورێك بە هۆیەوە هەر بەندەیەکمان مەبەست بێ رێنوێنی دەکەین.

# بیروباوەڕ بۆچی؟

بیروباوەڕی ئیسلامی وەك ئاوو هەوا بۆ مرۆڤ پێویستە، ئەگەر نەبێ مرۆڤ سەرگەردان و ناگزور دەبێ و خۆی بزر دەکات. تەنیا بیروباوەڕی ئیسلام وەڵامی ئەو پرسیارە دێرینانە دەداتەوە کە تا ئێستاش هزری مرۆڤی پێ خەریك و کاسە. لە کوێوە هاتوی؟ ئەم گەردونە لە کوێ هاتوە؟ وەدیهێنەر کێیە؟ ناو سیفەتەکانی چیە؟ لە پێناو چدا ئێمەو گەردونی ئەفراندوە؟ ئەرك و رۆڵی ئێمە لەم بونەوەرەدا چیە؟ پەیوەندیمان لەگەڵ ئەفرێنەرمان دەبێ چۆن بێ؟ ئایا لە پشت ئەم جیهانە بەرچاوەکیەدا جیهانی دیکەی نادیار هەیە؟ ئایا جگە لە مرۆڤ ئەفراوی دیکەی ژیرو بیرەوەر لەم بونەوەرەدا هەیە؟ ئاخۆ لە پاش ئەم ژیانەدا ژیانی تر هەبێ سەرەنجاممان پێی بگات؟ باشە ئەگەر هەیە دەبێ چۆن بێ؟ ئەم پرسانەو چەندانی دیکەش.. تەنها بیروباوەڕی ئیسلامی پێزی وەرامدانەوەیەکی راست و راستەقینەو دڵنیا بەخشی هەیەو هیچ بیروباوەڕێکی دیکە ناتوانێ وەرامیان بداتەوە. خۆ ئەگەر هەر کەسێك بە بیروباوەڕی ئیسلامی بەهرەمەند نەبو، ئەوا ژیواری لە ژیواری ئەم شاعیرە کڵۆڵ و سەرگەردانە[٣] چاکتر نابێ کە هیچ شتێك نازانێ.. شاعیر دەڵێ:

جئـت، لا أعلـم مـن أيـن، ولكـني أتيـت
ولقـد أبصـرت قـدامي طريقـاً فمشـيت
وسـأبقى سـائراً إن شـئت هـذا أم أبيـت
كيـف جئـت؟ كيـف أبصـرت طريقـي؟

لست أدري؟!

هاتم و نازانم لە کوێ، کەچی ئەوەتانێ هاتوم. لەبەر پێی خۆمدا رێگەم بینی و پێیدا گوزەرم کرد. بمەوێ یا نەمەوێت هەر دەبێ لەم رێیەدا بم. چۆن هاتم و چۆن ئەم رێگەیەم بینی؟... نازانم.

---

[٣] ئەو شاعیرە (ئیلیا ئەبا ماضي)یە لەیەك لەچامەکانی وەرگیراوە بە ناوی (الطلاسم) لە دیوانەکەی (الجداول)ی دا لاپەرە /١٠٦.

أجديـــد أم قـــديم أنـــا في هــــــذا الوجـــــــود؟
هـــل أنـــا حـــرّ طليـــق أم أســـير في القيـــــود؟
هـــل أنـــا قـــائد نفســـي في حيـــاتي أم مقـــــود؟
أتـــمنى أنـــني أدري ولـــكـنـــــي

لســـت أدري ؟!

ئاخۆ نوێ بم یـان دێرینـم لـەم بونـەدا؟. ئـاخۆ ئـازادو سەربەسـتم یـاخۆ بـێ دەستی خۆم دەهاژورێم؟. ئایا جلەوی خۆم لە دەست خۆمە یا لـە دەسـتی یـەکێ ترە؟. حۆزگە دەمزانی کەچی بە داخەوە ... نازانم.

وطريقـــي مـــــا طريقـــــي؟ أطويـــــل أم قصـــــير؟
هـــل أنـــا أصعـــد أم أهـــــبط فيـــــه وأغــــور؟
أأنـــــا الســـائر في الـــــدرب تـــســــــير؟
أم كلانـــا واقـــــف والـــــدهر يـــــجري ؟!

لســـت أدري؟!

ڕێگەی من، ڕێگەی من چیە؟ دورە یا نزیك؟. ئاخۆ بەرەو هەورازم یان نشـێو یاخۆ بەرەو ڕۆچونم؟. ئاخۆ من لەسەر ڕێگە گوزەر دەکەم یاخۆ ڕێگە لە ژێر پێمدا ڕادەبورێ؟. یاخۆ هەردوکمان وەستاوین‌و ئەوەی دەڕوا گەردونە؟... نازانم.

أتـــراني قبـــــلما أصبــــحت إنســـاناً ســـــويّاً
كنـــت محـــواً أو محـــالاً أم ترانـــــي كنـــت شــــيئاً
ألــــهذا اللـــغز حـــلّ؟ أم سيـــبقى أبديـــــاً
لســـــت أدري... ولـــــماذا لســـــت أدري ؟

لســـت أدري؟!

خۆزگە لـە جیهانی پەنامـەکی ئـارامدا دەبـوم، ئـاخۆ دەمزانـی مـن لـەوێدا شـراوەم؟ یـاخۆ دەمزانـی دێمـە ئـاراو دێمـە بـون؟ یـان هـەروا دەبـوم‌و هیچـم نەدەزانی؟... نازانم.

ليت شعري وأنا في عـــالم الغيـــب الأمـــين
أتـــراني كنـــت أدري أنـــني فيـــه دفـــين
وبأني ســـوف أبـــدو وبـــأني ســـأكون
أم تـــراني كـــنت لا أدرك شيـــئـــاً؟

لست أدري؟!

ئاخۆ بەر لەوەی ببمە مرۆڤێکی ئاسایی. هەر نـەبوبوم یـا مـەحاڵ بـوم یـاخۆ شتێك بوم؟ ئایا ئەم مەتەڵـە شـیکاری هەیـە؟ یـا تاهەتایـە وا دەمێنـێ؟. نـازانم.. ناشزانم بۆ نازانم؟ چونکە... نازانم.

ئـای لـەم هـۆت بونـە!.. ئـەم هـەمو نەزانراوانـە شـتێ نیگـەرانیو پەشـێوی دەئاخنێتە نەفسی مرۆڤایەتی؟! ئایا نـەوەکانی ئـەم سـەدەیە شـایانی ئـەوە نـین بیروباوەڕی ئیسلامییان پێ ئاشنا بکرێ؟ کە لـە هەقیقەتـە گـەورەکان بێئاگـان.. ئەو هەقیقەتانەی مایەی راستەڕێبونی ژیانیانە. ئایە شایەنی ئەوە نیە بیروبـاوەڕی ئیسلامیان پێ بناسرێنرێ؟ تا بەڵکو ئەو هەمو تەمتومانو خەمخەیاڵـە برەوێتـەوە کە نەفسی داگیر کردونو بوەتە مایەی تەنینەوەی سفتو سـوێو ناسـۆری جـۆراو جۆرو گرێی دەرونی؟!

موسـوڵمان لـە کـوێو ئـەوان لـە کـوێ؟! موسـوڵمان زۆر بـە رونـی دەزانـێو هەقیقەتەکان بە دڵنیاییەوە دەناسێ. بە هۆیەوە لە فێنکێیی ئاوەردا دەسێتەوە، دڵی سرەوتو ئارامە. لە رێگایەکدا دەڕواو بەرەو ئامانجێك هەڵدەزنێ کە نەخشەی بۆ کێشراوەو بە ئەدگارەکانی زانیارە ودەزانێ چی دەوێت و چی ناوێ.

دە وەرە گوێ بگرەو بزانە شاعیری بەدبەختو کلۆڵ چۆن چۆنـی لـە بـارەی مردنو سەرەنجام دەدوێ:

إن يـكُ المـوت قصاصـاً! أيُّ ذنـب للطـهارة؟
وإن كـان ثـواباً، أيُّ فـضل للدعـارة؟
وإذا كـان ومـا فـيه جـزاء أو خسـارة
فـلـم الأسـمـاء إثـم وصـلاح ؟

لست أدري؟!

ئەگەر مردن تۆڵەبێ! ئەدی کام گوناهـ بۆ پاك بونەوە بێ؟. ئەگەر پاداشتیش بێ، کام پلەو پایە بۆ بێ شایرویی بێ؟ ئەگەر ئەوەی تێیدایە جەزاو خەسارەتمەندی بێ. ئەدی ناونانی تاوانو چاکە سازی بۆ چیە؟ ... نازانم.

إن يـك المـوت رقـاداً بعـده صحـو طويـل
فلمـاذا ليـس يبقـى صحونـا هـذا الجميـل؟
ولمـاذا المـرء لا يـدري متـى وقـت الرحيـل؟
ومـتى يـنكشـف الـسـتر فيـدري؟

لست أدري؟!

ئەگەر مردن خامۆشی بێو لەپاشانیش رابونێکی ئیجگاری بێ. باشە بۆچی ئەو رابونەی ئێستامان هەر بە جوانی نامێنێتەوە؟ ئەدی باشە پیاو بۆ نایزانێ کەنگێ کاتی کۆچ کردنە؟ ئاخۆ کەنگێ پەردە هەڵدەدرێتەوەو ئەو شتانە بزاندرێ؟... نازانم.

إن يـك الموت هجـوعاً يمـلأ النفـس سـلاماً
وانعـتاقـاً لا اعتـقالاً وابتـداء لا ختامـاً
فلمـاذا لا أعشـق النـوم ولا أهـوى الحمامـا؟
ولـمـاذا تـجـزع الأرواح مـنـه؟

لست أدري؟!

ئەگەر مردن خەوی رەهای شەوگارێ بێو نەفس پڕ بکات لە ئارامی. ئەگەر مردن رەها بون بێ نەك کۆتبەندی، سەرەتا بێ نەوەك کۆتا. ئێ باشە بۆ حەزرەتی ئەو خەوە نیمو ئاوات بە مردن ناخوازم؟ ئەی باشە بۆ رۆح لە بەریدا دەلەرزێتو سام دەیگرێ؟... نازانم.

أوراء الـقـبر بـعـد المـوت بعـث ونشـور؟
فحـياة، وخـلود، أم فـناء فـدثـور؟
أكـلام النـاس صـدق أم كـلام النـاس زور؟
أصـحـيـح أن بـعـض النـاس يـدري؟

لست أدري

ئاخۆ لە پاش مردن رابونو جەمبون هەبێ؟ ئاخۆ ژینەوە هەبێو بۆ هەمیشە بێ، یاخۆ تونابونو نەمانە؟ ئاخۆ قسەی خەڵکان راست بێ یاخۆ درۆ؟. ئاخۆ راست بێ کەسانێ هەن بیزانن؟... نازانم.

إن أكــن أُبعَــثُ بعــد المــوت جثمانــاً وعقـــلاً
أتـــــرى أُبعـــث بعضـــاً أم تـــرى أُبعـــثُ كـــلاً
أتــرى أبعــث طفــلاً أم تــرى أبعــث كـــهلاً؟
ثــــم هــــل أعــــرف بعــد البعــــــث ذاتي؟

لست أدري؟!

ئەگەر لە پاش مردن بە جەستەمو بەهزرەوە بژیمەوە، ئاخۆ بەشێکم زندو بێتەوە؟ یاخۆ تەواو و هەر هەموم؟ ئاخۆ بە منداڵی یاخۆ بە پیری زندو دەکرێمەوە؟ پاشان لە دوای پەسەڵان ئاخۆ خۆم بناسمەوە؟ ... نازانم.

شاعیر نازانێ بەرەو کوێیەو خەمو مشور بۆ سەرەنجامی مرۆڤایەتیش دەخوات، گەرەکیەتی لەو سەرەنجامە دڵنیا بێت. چاك هەست دەکەین شاعیر شتۆ حەژمەتو ئەفسوسان هەڵدەکێشێ لەبەر ئەوەی نازانێ سەرەنجام بەرەو کوێیەو؟! چ رودەدات؟!.

بەڕاستی ئەمە گومڕاییە.. سەرگەردانبونی دور لە هەقیقەتە، کلۆڵیە، کلۆڵبونی دڵی تریسكو پڕ لە ناسۆز، تەواو تەواو کەشەنگ بوەو برستی لێ براوە. ئەفسوس! هی وەکو شاعیری کلۆڵو سەرگەردان زۆرن، هەیانە ئەو نەگبەتیو سەرەنگرێبونە لە کۆڵ خۆی دەکاتەوەو ئاهی هەقیقەتی دێتەوە بەرێو لەو هۆت بونو کاسانە رزگاری دەبێ. بەڵام داخ! بۆ ئەوانەی هەر لە گێژاوو گێژەنی حەسرەت لول دەخۆنەوەو کۆتی ئەرژەنگی ئەو نەفسە کلۆڵەیان هەپرون ناکەنو هزریان هەر بە زیندانی کایەی نەفس دەمێنێتەوە.

"نازانم"یان کردۆتە وەرامی پرسیارە دێرینەکان، وەنەبێ هەر ئەم شاعیرە وای گوتبێ، تەنانەت "سوقرات"یش کە بە یەکێك لە پیتۆڵە بلیمەتەکان هەژمار دەکرێ، زۆر بە ئاشکرایی دەڵێ: (شتێك تا ئێستا نەیزانم ئەوەیە نازانم)٤، بەڵکو

---

[1] الدين—ى دراز/ل٦٩.

"نازانم–یزم" هەر خۆی راڕەوێکی فەلسەفی دێرین بوەو ئێستاش تاکولۆکی لێ ماوە.

بەڵێ، تەنها ئیسلام وا لە مرۆڤ دەکات بزانێ لە کوێ هاتوەو، سەرەنجام بەرەو کوێیە؟، بزانێ بۆ بوەو لەم بونەوەرەدا ئەرکو رۆڵی چیە؟.. زۆر بە رونو راستەقینەیی دەزانێو ئاوەرێکی رەهای پێ هەیە. جودای نێوان ئەو کەسەی دەیزانێو نایزانێ ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِ أَهْدَىٰ أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ سورەتی مولك/٢٢ واتە: ئایا ئەو کەسەی بە دەمەوە کەوتوەو بەرێدا دەڕوات رێنوێنترە؟ یان ئەو کەسەی لەسەر پێ راوەستاوەو راست بە پێی خۆی بە رێدا دەڕوات!.

## بیروباوەڕو بڕوا

ئەو بڕوایەی خودا لە قورئاندا بە ستایشەوە ناوی هەڵناوەو بڕوادارانی پێ پەسەند کردوە لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ﴾ سورەتی موئمینون/١، واتە: بڕواداران رزگارن ﴿أُولَٰئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ سورەتی بەقەرە/٥، واتە: ئەوان (مەبەستی بڕوادارانە) لەسەر رێنوێنیی پەروەردگاریانن‌و هەر ئەوانن رزگار بوان. هەروەها بەڵێن‌و هەرێی پێداون بەهەشتی بن ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ ۞ الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ سورەتی موئمینون/١٠–١١ واتە: هەر ئەوان میراتگرانن کەسانێ بەهەشت بە میرات بەدەست دێنن‌و بۆ هەمیشە لەوێدان... ئەو بڕوایە هەر تەنها بیروباوەڕ نیە، چونکە بیروباوەڕ بناروبنەڕەتی بڕوایە. بەڵکو بڕوا: بیروباوەڕێکەو لە دڵدا ئۆقرە دەگرێو لێی جوێ نابێتەوەو هەر لەگەڵیدا دەبێ، بڕوادار ئەو بیروباوەڕە ئۆقرە گرتوەی نێو دڵی بە زمان دەردەبڕێو بڕیارو باوەڕمەندێتیو دەربڕینەکەشی بە گوێرەی داخوازیەکان بە کردەوە دەسەلمێنێ.

ئەو بیروباوەڕەی تەنها لە نێو دڵدا خۆی حەشاردەدات‌و لە ئارادا رەنگوڕوی نابینرێ، ئەوا بیروباوەڕێکی ساردو سڕو سست‌و خاوەو، شایەن نیە پێی بگوترێ بیروباوەڕ. خۆ زۆر خەڵك ئەم هەقیقەتە دەزانن بەڵام ناژنەوێن‌و گەردەن کەچ نابن

و، ژیانیان بە پێوەندگی ئەو ناگوزەرێنن، بەڵکو بەیداخی نەیارێتیشی لە دڵدا هەڵدەدەن و، دوژمنایەتی ئەو رەوایەش دەکەن کە دڵنیان هەقیقەتە. ئەوتانێ ئیبلیس تەواوی هەقیقەتە مەزنەکان پڕ بە دڵ دەناسێ؛ خودا دەناسێ، دەزانێ پەیامبەران و پەرتوکەکان راستن، کەچی لەگەڵ هەندێشدا خۆی بۆ دژایەتی ئەو هەقیقەت و رەوایانە تەرخان کردوە.

فیرعەون ئاوەرێکی تەواوی بەو موعجیزانە هەبو کە پێغەمبەر موسا رایدەهێڵاو سوڕ دەیزانی لە لای خوداوەیە، کەچی نەیسەلماندو نەیسەلماند، وەکو خودا لە بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ سورەتی نەمل/١٤، واتە: لە دڵەوە ئاوەریان بە نیشانەکان هەبو کەچی لەبەر خۆ بەزل زانی و ستەم لوت بەرزییان دەکردو ملکەچ نەبون.

پێغەمبەر موسا بە فیرعەونیشی گوتوە: ﴿قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنزَلَ هَؤُلَاءِ إِلَّا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ بَصَائِرَ﴾ سورەتی ئیسراء/١٠٢، واتە: تۆ سوڕ دەزانی ئەم نیشانانە لە لای خودای ئاسمانەکان و زەویەوە دابەزیون، تا ببنە رونکەرەوەو مایەی چاوساغی.

نامەوەرانیش موحەممەدیان دەناسی و دەیانزانی پێغەمبەرەو لە لای پەروەردگار رەوانە کراوە: ﴿يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ﴾ سورەتی بەقەرە/١٤٦، واتە: نامەوەران پێغەمبەر وەکو منداڵەکانیان دەناسن راستە، کەچی لەگەل ئەوەشدا دانیان پێدا نەدەنا.

ژنەوتی (ئەبا تالیب) بە چۆن چۆنی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەدوێ و تەوازۆ بۆ بێ بڕوایی خۆی دەخوازێ:

ولقد علمت بأن دين محمد — من خير أديان البريـة دينـاً
ولولا الملامة أو حذار مسبة — لوجدتني سمحاً بذاك مبيناً

واتە: بێ گومان دینی موحەممەدی لە باشترین دینەکانی خەڵکە. خۆ ئەگەر لەبەر سەرکۆنەو لە شەرمی قورەیشیان نەبوایە ئەوا بێ گرێ و گاڵ فەرمانبەری دینەکەیم دەکرد وبڕوام پێی دەهێنا.

کەواتە بڕوا هەر ئەوە نیە بە ویست خوا بناسێ، یان ناسینێك بێ دڵەکەچی بۆ نەکاتو دانی پێدا نەنێ. یاخود بۆ حوکمو فەرمانەکانی نەژنەوێو گەردەنی کەچ نەکات. بەڵکو بڕوا بیروباوەڕێکە دڵی بڕواداری پێ خۆشنودەو بەزمانیشی راگەیاندوەو پابەندو خۆشنودی ئەو رێوشوێنەشە کە خودا بۆ ئەو بیروباوەڕە دایڕشتوە.

هەر بۆیەشە زانایانی پێشینان فەرمویانە: (بڕوا: باوەڕ کردنی نێو دڵو دەربڕینی زمانو کردەوەی جەستەیە)٥.

## پەیوەندی نێوان بیروباوەڕو بەرنامە

وەکو پێشتر گوتمان بڕوا بیروباوەڕێکی رەگاژۆیەو لە دڵ ئۆقرە دەگرێ، هەورەها کردەوەی ئەندامەکانی جەستەشە، ئەگەر هەر یەك لەم دو روکنەی لەگەڵدا نەبێ ئەوا بڕوایەکە یان هەر نامێنێ وهەڵدەوەشێتەوە یا ئەوەتە لەنگەری نامێنێو شپرزە دەبێ، چونکە پەیوەندی نێوانیان گەلێ پتەو وتوکمەندەیە.

بڕوا وەك ئەو درەختە وایە کە رەگوڕیشاڵەکانی بە نێو زەمینێکی ئاداںو بە پێزدا رەگاژۆ کردبێو بە ئاسمانیشدا قەدێکی بالاو لك وپۆپو پەلوپۆیەکی زۆر تێکچڕژاو و بە بەروبومو گەلاداری هەبێ و، هەمو وەختێك بەودمی خودا بەر بگرێ.

رەگوڕیشاڵەکان بیروباوەڕەکەیەو ترنجاوەتە نێو دڵی بڕوادارەکە. قەدو پەلوپۆو بەروبومەکەش کردەوەیە، هەڵبەت ئەگەر رەگوڕیشاڵەکان هەڵبکێشرێن یان بڕزن درەختەکە وشكو شەمزاو و بێبەر دەبێو لە ئاخیریشدا تونا دەبێ. بڕواش بەم جۆرەیە ئەگەر بیروباوەڕی لێ هەڵتەکێ بونی نامێنێ. بەلام ئەگەر قەدو پەلوپۆکانی بقرتێنرێو چەندی لێ بروشێنرێ یان هەڵپاچێنرێ ئەوا درەختەکە بێهێزو بێ پێز دەبێ، رەنگە وشکیش بێ. چونکە بونی ئەم لكو پۆپو گەلایانە زۆر پێویستنو ماکی زیندەگی درەختەکەن. کردەوەش بەم جۆرەیە بۆ بڕوا. ئەگەر هەندێکی لێ ئەنجام نەدرا یان هەر هیچی نەکرا ئەوا بڕواکە یا لاواز دەبێ یا هەر نامێنێ.

---

٥ ئەوە وتەی سەرجەم پێشینانە، ئەحمەد و مالك و شافیعی ئەوانیش هەمان بۆچونیان هەیە، بەلام ئەبا حەنیفە دەڵێ: بڕوا باوەڕی دڵ و دەربڕینی زمانە، کردەوە دەچێتە خانەی داخوازی و پێداویستیەکانی بڕوا نەك بڕوا بێ. جورهومی و ئەشعەریەکان دەڵێن: بڕوا بەڕاست دانانە، ئەگەر چی دەربڕین و کردەوەشی لەگەڵدا نەبێ. کەرامیەکان دەڵێن: بڕوا تەنها بەدەم دەربڕینە. هەڵبەت لە میانەی خواسەکانمان بەرپەرچی ئەم بۆچونانەمان داوەتەوە.

## گرنگیدان بە کردەوە

کەواتە پێویستە بایەخێکی تەواو بە ئەنجامدانی ئەو کردەوانە بدەین کە خودا لەسەری واجب کردوین یان هانی داوین بیانکەین، واز لەو کردەوانەش بێنین کە "نا"ی لێ کردوین چونکە ئەوە بەشێکی بڕوایە. وازهێنان لە کردەوەیەکی چاك ئەگەرچی بچوکیش بێ بە ئەندازەی خۆی کار لە بڕوایەکە دەکاتو کەمی دەکاتەوە. لەبەر ئەوە ئەو کەسانەی بەبێ بایەخ دەڕواننە کارپێ کردنی سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ دەبێ زۆر ئاگادار بنو هەڵوێستەکەیان گەلێك ترسناکە. تەنانەت هەندێك وایان لێهاتوە چەشنە سوننەتێك بە توێکڵو توێژ بزان!

لە خودا دەخوازین لەو جۆرە کەسانە ببورێو کاریان ڕاست بێنێ، ئاین هەر هەموی کاکڵو کڕۆکەو توێکڵی تێدا نیە، ئەگەر چی هەندێ فەرمان لە گرنگیدا لە پێشەوەی هەندێ فەرمانی دیکەوەیە. وتەکەی ئێمەش وا ناگەیەنێ ڕەچاوی ڕێسای سەرانگاهی لە زانستو کردارو بانگەوازدا ناکەین، ڕەچاو کردنی ڕێسای گرنگترین و گرنگترو گرنگ بابەتێکە بڕاوەتەوەو هیچ قسەی لەسەر نیە، ئەوەی جێی نکۆڵی ئێمەیە کاری کەسانێکە وازیان لە کارە وردەکیەکان هێناوەو سەرزەنشتی ئەوانەش دەکەن کە پابەندی وردو درشتی فەرمانەکانی ئیسلامو سوننەتەکانی پێغەمبەرن ﷺ. وای ئەو هەڵوێستەی عومەر خوا لێی ڕازی بێت کارم تێ دەکات، کاتێ بە برینە سەختەکەی مەرگی زامداریان کردبو، کە لەو دەمەدا گەنجێك هاتەلایو بەچەند قسەیەکی شیرین دڵی دایەوە، گەنجەکە پشتی هەڵکردو ڕۆیشت بچێتە دەرەوە، عومەر دیتی کراسەکەی هەندێ شۆڕە، بانگی گەنجەکەی کردو پێی گوت: "برازای خۆشەویستم! کراسەکەت درێژەو کورتی بکەوە، شمەکت وەها پاکترەو خوداش پێی خۆشنودترە". عومەر خۆشنودی خودای پێشکەش ئەگەر چی مەرگ یەخەی گرتبوو برستی لێ بڕیبو بەڵام هەر فەرمانی پێکردو ئەو سەرنجەی فەرامۆش نەکرد. ڕەنگە زۆر کەس ئەم کارە لە توێکڵی ئاین هەژمار بکەن!.

# بڕواو بێبڕوایی

نسطماندنی بیروباوەڕ :

هەرکەسێك تەواوی بیروباوەڕی ئیسلامی نەسەلمێنێو لالوتی لە هەموی بکات وەکو کۆمۆنیزمەکان کە بونی خوا ناسەلمێننو پێغەمبەرانو پەڕتوکەکان بە درۆ دەزاننو بڕوایان بە ژیانەوەو پاداشتو سزا نیە. یان هەر یەکێك لالوتی لە بەشێکی ئەم بیروباوەڕە بکات ئەوا بێبڕوایەو موسوڵمان نیە. پێویستە بزاندرێ بیروباوەڕی ئیسلامی یەك پارچەیەو هەرگیز پارچە پارچەیی قبوڵ ناکات. یەکێ بڕوای بە خودا هەبێ دەبێ بڕوای بە فریشتەو پەڕتوكو پێغەمبەرانو ڕۆژی دواییش هەبێ، ئەوەی بڕوای بە پەڕتوکەکان هەبێ دەبێ بڕوای بە بنەڕەتەکانیش هەبێ، بڕوا بونیش بە پێغەمبەر ﷺ واتای بڕوا هێنانە بەوانی دیکەش... بۆیە خودا ئەوانەی بە بێبڕوا هەژماردوە کە تەنها بڕوایان بە یەك بنەڕەتیش نەبێ. خودا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا ۞ أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا﴾ سورەتی نیساء /١٥٠-١٥١، واتە: بەڕاستی کەسانێ بە خواو پێغەمبەرەکانی بڕوا ناهێننو دەیانەوێ لە نێوان خواو پێغەمبەرانیدا جیایی بخەنو دەڵێن: بڕوامان بە هەندێ هەیەو بڕوامان بە هەندێ نیەو، دەیانەوێ لە نێوان ئەم دوانەدا ڕێگایەك بۆ خۆیان بگرنە بەر، ئەوانە بێبڕوای تەواون.

هەروەها ئەگەر کەسێك لە بنەڕەتەکانی بیروباوەڕدا بڕوای بە بەشێك نەبێ ئەگەر چی وردیش بێو بەدرۆی بزانێ، ئەو بەشەش لە قورئانو سوننەتدا بە شێوەیەکی تەواوو گومان هەڵنەگر سەلمێنرابێ ئەوا بە بێبڕوا هەژمار دەکرێ، بۆ نمونە یەکێك بڕوا بە یەك لە پێغەمبەران نەهێنێ یان بڕوا بە جبریلی فریشتە نەکات.

## ئەو کردارو ڕەفتارانەی بە بێبڕوایی هەژمار دەکرێن

بێبڕوایی هەر ئەوە نیە لالوتی لــە یـەك یـان زیـاتری بنەڕەتـەکانی بیروبـاوەڕ بکات، بەڵکو چەند کردارێك هەن ئەگەر ئەوانیش ئەنجام بدرێن بێبڕواییــە، دەکرێ بە یەك گوزارشت دیاری بکرێو پێی بڵێین: (پەرستنی نا خودا) پەرستن تەنها مافی خودایەو ئاراستە کردنی بۆ غەیری خودا هاوبەشپەرستیە، وەکو نوێژو قوربانیدانو پاڕانەوە ئەگەر بۆ غەیری خودا بێ.

هەندێ گوفتاریش هەن دەبنە مایەی بێبڕوایی، وەکو جوێندان بـە خـوداو بـە ئیسلامو بە پێغەمبەر ﷺ یان گاڵتە کردن بە ئیسـلام، یـان بـە باشـتر دانـانی ڕێو پـەیڕەوە گومـڕاو نائیسـلامیەکان وەکـو کۆمۆنـیزمو بورژایـەتی، یـان هـەر دینێکـی دەست تێـوەردراوی دی وەکـو جولەکایـەتیو گـاورێتی، یـاخود ئیسـلام بـە کـەمو کورتیو کۆن بونو بێ سود بون تۆمەتبار بکات.

## حوکمی بێبڕوایان

لەسەر هەمو موسوڵمانێك پێویستە وەك چـۆن ڕکـی لـە بێبڕوایی دەبێتـەوە، ئاوەهاش دژایەتی بێبڕواکان بکاتو ڕکەبەرایەتیان لەگەڵدا بەرپا بکات. لـە هـەمان کاتیشدا بانگیان بکات بۆ ڕێی ڕاستی ئیسلامو ، گومڕاییو سـەرەنگرێ بونەکـەیان بۆ شی بکاتەوەو بەپاکی هەقیان بۆ ڕون بکاتەوە تا بەڵکو ژیوان ببنــەوە. چونکـە ئێمە لەگەڵ ئەوەی ڕکمان لە بێبڕوایان دەبێتەوە لە هەمان کاتیشدا حـەز دەکـەین لەم گومڕاییە ڕزگاریان بێو تەمای ڕاستەڕێبونیان بۆ دەخوازین.

لە پەڕتوکە (فیقهی)یەکاندا زۆران حوکمی دیکە لەسەر ئـەو بێبڕوایانـە هەیـە وەکو ژنو ژنخوازی نەکردن لەگەڵیان دا مەگەر لەگەڵ نامەوەرەکان، مردوەکانیان نەشۆین و نوێژیان لەسەر نەکەین....

## بێبڕوایان لە لای خودا

ئەو کەسەی بانگەوازی ئیسلامی پێ گەیشتوەو بە عیلمـەوە قبوڵـی نـەکاتو ڕەتی بکاتەوە، ئەوا بێ باوەڕەو بۆ هەمیشە لە ئاگری دۆزەخـدا دەمێنێتـەوەو لـە ڕۆژی ژیانەوەشدا هیچ بیانویەکی نابێ.

بەڵام ئەوانەی ئیسلامیان پێ نەگەیشتبێ، جا لەبەر هەر هۆیـەك بێـت، لەبـەر دوری مەڵبەندو نیشتمانیان بێت، یان لەبەر کەڕو کوێری بـێ، یـان لـە پیریـەکی وا

ئیسلامیان پـێ گەیشتبێ فامیـان نـەمابێو ژیرییـان کـوڵ بوبـێ، ئەوانـە لـە ڕۆژی ژیانەوەدا سزا نادرێنو ناخرێنە دۆزەخەوە تا دەئزموێنو تاقی دەکرێنەوە، چونکە ئەوانـە بیانویـان نـەبڕاوە، خـوداش دەفـەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا ﴾ سورەتی ئیسراء/١٥، واتە: ئێمە سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبـەرمان بۆ ناردوە.

بەڵگەش لەسەر ئەزمونو تاقیکردنەوەیان ئـەو فەرمودەیـەی پێغەمبـەرە کـە ئەسوەدەی کوڕی سەریع گێڕاویتیەوەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویـەتی: ((**أربعة يحتجون يوم القيامة: رجل أصم لا يسمع شيئاً، ورجلٌ أحمق، ورجل هرمٍ، ورجل مات في الفترة، فأما الأصم فيقول: رب جاء الإسلام وما أسمع شيئاً، وأما الأحمق فيقول: رب قد جاء الإسلام والصبيان يحذفونني بالبعر وأما الهرم فيقول: رب لقد جاء الإسلام وما أعقل شيئاً، وأما الذي مات في الفترة فيقول، رب ما أتاني من رسول. فيأخذ الله مواثيقه طيعنّه، فيرسل إليهم إن دخلوا النار، فوا الذي نفسي بيده لو دخلوها لكانت عليهم برداً وسلاماً**)) رواه أحمد في مسنده وصححه البيهقي. بگـەڕێوە سـەر تەفسیری إبـن كثـير لـە تەفسیری ئایەتی ١٥ی سورەتی ئیسڕاء).

واتـە: چـوار جـۆرە کـەس لـە ڕۆژی ژیانـەوەدا بیـانوو پاسـاو دەهێننـەوە: یەکێکیان کەڕەو چرپەی گوێ لێ نابێ، یەکێکی تریان گێلو گەمژەیە، یەکێکی تـر پیرە، یەکێکی تریان لەسەردەمی بێسروشیدا مردوە.

کەڕەکە دەڵێ: خودایە! ئیسـلام هـاتو ئـەمن هیچم لێ نەبیست. گەمژەکـە دەڵێ: خودایـە! ئیسـلام هـاتو منیـش منـداڵو هورتکـەو وپورتکـە پشـقڵیان تـێ دەگرتم. پیرەکە دەڵـێ: خودایـە! کـە ئیسـلام هـات مـن ئـەقڵم نـەمابوو هیچـی لێ نـەفامیوم. ئـەوەی لەسـەردەمی بێسروشـیدا مـردوە دەڵـێ: خوایـە! ئـەمن هیـچ پەیامبەرێکم بۆ ڕەوان نەکراوە.

خودا تەوازۆیان وەردەگرێو پەیمانو بەڵێنیان لێ وەردەگرێ بەرفەرمانی بن، ئەنجا پەیامبەریان بۆ دەنێرێو فەرمانیان پێ دەکات بچنە ناو ئاگر.

ئێ بەو خودایە! ئەگەر بچن نایانسوتێنێ چونکە ئاگرێکی فێنكو بێ ئازارە.

## نەکردنی واجبان و کردنی حەڕامان

هەڵبەتە ئەو کەسەی نافەرمانی بکات وەکو نەدانی زەکاتو ڕۆژو نەگرتنو حەج نەکردنو چاکە نەکردن لەگەڵ دایكو باوکدا، یان حەڕامی وەکو زیناو ڕبێدەو خواردنی ماڵی هێتیم بکات، ئەوا ڕوی بڕوایەکەی ناشیرین دەکاتو دەیشێوێنێ، بڕواکەی بە ئەندازەی نافەرمانیو حەڕام کردنەکەی کەم دەکات. بەڵام ئایا کە فەرمانەکان ناکات لەبەر بڕوا پێ نەبونی نەبێو کە گوناهەکانیش دەکات لەبەر ئەوە نەبێ بە حەڵاڵیان دەزانێ، ئایا ئەو کەسە بە کافر دادەنرێ؟

لەو دەقانەی لەبەر دەستمان دا هەیە بۆمان دەفامرێتەوە موسوڵمان بە نەکردنی فەرمانەکانو کردنی گوناهان کافر نابێ، بەڵام بڕوایەکەی کەم دەکات. خوداش بە ویستی خۆیەتی ئەگەر بیەوێ لێی خۆش دەبێ، ئەگەر مەبەستیشی بێ سزای دەدات، بەڵگەی ئاشکاریش لەو بارەوە زۆرن ، بۆ نمونە :

خودای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾ سورەتی نیساء/٤٨، واتە: خودا لەوە خۆش نابێ هاوبەشپەرستی بۆ پەیدا بکرێ بەڵام لەخوار هاوبەشپەرستی لە هەرچیەکی بیەوێ لێی خۆش دەبێ. کەواتە ئەوەی بواری لێبوردنی نیە تەنها هاوبەشپەرستیە.

زۆر فەرمودەش هەن فامی ئەم ئایەتە دەدەنەوە، یەکێك لەوانە فەرمودەیەکی (قودسی)یە دەفەرموێ: **((إبن آدم لو لقيتني بقراب ملء الأرض خطايا ثم لقيتني لا تشرك بي شيئاً أتيتك بقرابها مغفرة))** واتە: ئادەمیزاد! کە پێم دەگەی ئەگەر بە پڕایی زەوی گوناهت هەبێو تەنها هاوبەشپەرستیت بۆ من پەیدا نەکردبێ منیش بە هەمان پڕایی لێبوردنت پێ دەبەخشم.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: **((من مات لا يشرك بالله شيئاً دخل الجنة))** واتە: هەر یەکێك بمرێو هاوبەشپەرستی بۆ خودا بڕیار نەدابێ دەچێتە بەهەشتو بەهەشتیە. هەروەها دەفەرموێ: **((إن الله حرم على النار من قال لا إله إلا الله يبتغي ذالك وجه الله))** واتە: ئەوەی پاك لە بۆ خودا بڵێ لا إله إلا الله خودا ئاگری لێ حەڕام کردوە.

لە فەرمودەی تکاخوازیشدا خودا بە فریشتەکانی دەفەرموێ: **((أخرجوا من كان في قلبه مثقال حبة خردل من إيمان))** واتە ئەوەی بە قەد سەنگی دەنکە خەردەلێکیش بڕوای لە دڵدا هەبێ لە دۆزەخی دەربهێنن.

ئەبا سوفیان دەڵێ: ( ماوەی شەش مانگان لە مەککەدا هاودەمێتی (جابری کوڕی عبدالله)م کرد، جارێکیان پیاوێك لێی پرسی: ئێوە ئەهلی قیبلەتان کافر دەکرد؟ گوتی: پەنا بە خودا! گوتی: پێتان دەگوت هاوبەشپەرست؟ گوتی: نەخێر)[٦].

ئەم دەقانەو هاوشێوەیان بونەتە مایەو بەڵگەی زانا بلیمەتو زۆرزاناکانی پێشین، لە ئاست ئەو بڕوادارانەی گوناه دەکەنو فەرمانەکان جێبەجێ ناکەن بڵێن: ( بە هۆی بڕواکەی بڕوادارەو بە هۆی گوناهە گەورەکانیشەوە فاسقە) ئەوان بڕوایان بۆ ئەو جۆرە کەسانە سەلماندوە، بەڵام نەك ئەو بڕوا تەواوەی بە کردنی فەرمانو نەکردنی گوناهان دروست دەبێ. بەڵکو بڕوایەکی وا گرفتاری ئەو گوناهە گەورانە بوبێ کە ئەنجامی داوە.

## ئەوانەی بە هۆی گوناهانەوە خەڵکی بە کافر دادەنێن

لەگەل ئەوەی راستیەکە بەم جۆرەیە، کەچی کۆمەڵێك هەن خەڵك بەوە کافر دەکەن ئەگەر گوناه بکەن یان کەمتەرخەمی لە راپەڕاندنی واجبان بکەن، بە داخەوە ئێستاکەش کەسانێك هەن هەر زوزو خەڵك بە کافر دادەنێن. یەکەمین کەسانێك ئەو بیرۆکەیان پیادە کردبێ خەواریجەکان بون ئەوانیش کۆمەڵێك بون لەو کاتەوە لە لەشکرەکەی عەلی کوڕی ئەبا تالیب جیا بونەوە کە ئەبا موسای ئەشعەریو عەمری کوڕی عاص لە ناو بڕی یەکلایی کردنەوەی ناکۆکی نێوان عەلیو موعاویە شکستیان هێنا.

خەواریجەکان وایان دادەنا نابێ مرۆڤ حوکمگێڕی بکاتو پێیان وابو بە پێی شەرع هەڵەیەو بە کوفریشیان هەژمار دەکرد، تەنانەت ئەوانەشیان بە کافر دادەنا کە ملکەچی ئەم حوکمگێریە دەبونو پەسەندیان دەکرد، خۆشیان بە کافر دانابوو پاشان سەرلەنوێ بڕوایان هێناوەتەوە، داوایان لە ئیمام عەلیش دەکرد بەو مەرجە دەگەڕێنەوە نێو لەشکرەکەی ئەگەر خۆی بە کافر دابنێ.

ئیمام عەلی بە مەبەستی رێ پیشاندانەوەیان عەبدوڵلای کوڕی عەبباسی بۆ ناردن، ئەویش بیانوی بڕینو بۆ چونەکەیانی پوچاندنەوەو لە ئەنجامدا چو .

---

[٦] ئەبا عوبێد: قاسمی کوڕی سەلام لە پەرتوکی (الإیمان)ەکەی گێڕاویەتیەوە، بە تەحقیقی شێخ ناصر الدین ی ئەلبانی، شێخ ئەلبانی لە بارەیەوە گوتویەتی: إسنادە صحیح علی شرط مسلم. ئەبا سوفیانیش بگێڕەوەی فەرمودەکەیە کە یەکێکە لە شوێن کەوتوان.

هەزاریان لێ گەڕایەوە، دو هەزار کەسیش پێگیربیان کردو لەسەر قسەی خۆیان نەهاتنە خوارەوە، ئیمام عەلیش شەڕی لەگەڵدا کردن تا هەموویانی لە ناو برد. بەڵام بۆ چونو راڕەوەکەیان بڵاوەی ستاندو لەپاش خۆیاندا خەڵکێکی زۆری پێ گرفتار بو، تا ئێستاشی لەگەڵ دابێ بەرماوەیان هەر ماوە.

خەواریجەکان[٧] پێیان وایە گەر یەکێك تاوانی گەورە بکات، کافر دەبێو لە ئیسلام دەشۆرێتەوە، خوێنو ماڵیشی حەڵاڵە، بۆ هەمیشەش لە ناو ئاگری دۆزەخدا دەبێ. بۆ ئەو بۆچونەیان چەند بەڵگەیەك دەهێننەوە لەوانە:

١- دەڵێن: ئێوەش لەگەڵمانن کردەوە تێکەڵی بڕوایە، چونکە بڕوا بیروباوەڕو گوفتارو کردارە، کەواتە ئەگەر "بڕوا" بەشێکی لێ بڕوات ئەوا تەواوی بڕواکە نامێنێ.

٢- بیانوی ئەوە دەهێننەوە خودا هەندێك گوناهی بە فیسق ناوبردوە وەکو دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا﴾ سورەتی حوجورات/٦، ئەگەر رامێنین دەردەکەوێ مەبەست لە "فاسق" درۆزنە. دەڵێن: پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((**سباب المسلم فسوق وقتاله كفر**)) رواه مسلم. واتە جنێو دان بە موسوڵمان فیسقەو شەڕ لەگەڵدا کردنیشی کوفرە.

هەروەها دەڵێن: خودا هەندی گوناهی بە ستەم ناوزەد کردوە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا﴾ سورەتی نیساء/١٠، واتە: ئەوانەی بە ستەم ماڵی هەتیوان دەخۆن ئەوا با بزانن ئاگر دەخۆنو دەیخەنە هەناویان.

دیسان دەڵێن: هەرکەسێك ئافرەتێك لە ماڵی خۆی دەربکات مێردەکەی مردبێ لە پێش تەواو بونی ماوەی دیاری کراوی عیددەکەی بە ستەمکار دادەنرێت چونکە سنوری خوای بەزاندوە. ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ

---

[٧] کۆمەڵێکی دی هەن پێیان دەڵێن (موعتەزیلە) شوێنکەوتوانی (واصلی کوڕی عطاء)ن، دەڵێن: ئەگەر یەکێك تاوانێکی گەورە ئەنجام بدات نە بڕوای دەمێنێ و نەکافریش دەبێ، بەڵکو لەو نێوانەدا دەمێنێتەوە.. ئەوە لە دنیا بەڵام لە ئاخیرەتدا حوکمی هەتا هەتایی چونە ناو دۆزەخیان بۆ بڕیار دەدرێ.

نَفْسَهُ﴾ سورەتی تەلاق/١، واتە: لەخوا بترسنو ژنان لە مالّی خۆیان دەرمەکەنو ئەوانیش لە دەورانی عیددە نەچنە دەرێ، مەگەر کاری خراپی ئاشکرا بکەن ئەمانە ئەحکامو کەوشنی خودانو هەرکەس لە کەوشنی خودا تێ پەڕێ ستەمی لە خۆی کردوە.

دەلّێن: کەواتە ئەگەر گوناهەکان فیسقو ستەم بن فاسقو ستەمکاریش بە پێی دەقی قورئانی کافرن دەفەرموێ: ﴿وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٤ واتە: کافرەکان ستەمکارن، ﴿وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ سورەتی نور/٥٥ واتە: ئەوانەی لە پاشان کوفریان کرد، بەلّێ ئەوانن فاسق.

٣- دەلّێن: چەندین دەقی دیکە لەو بارەوە هاتوە بڕوا لەوانە دادەمالّێ کە گوناه دەکەن. لەوانە ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ بوخاریو موسلیم گێڕاویتیانەوە: ((**لا یزنی الزاني حین یزني وهو مؤمن، ولا یسرق السارق حین یسرق وهو مؤمن**)) واتە: ئەو دەمەی زیناکارێك زینا دەکات بڕوادار نیە، ئەو دەمەی دزێك دزی دەکات بڕوادار نیە.

هەروەها فەرمویەتی: ((**لا یبغض الأنصار أحد یؤمن بالله ورسوله**)) رواه مسلم. واتە: ئەگەر یەکێك بڕوای بە خواو بە پێغەمبەر ﷺ هەبێ رکی لە پشتیوانان نابێتەوە.

هەروەها دەفەرموێ: ((**والذي نفسي بیده لا تؤمنوا حتى تحابّوا**)) أخرجه مسلم واتە: بەو خودایەی گیانی منی بە دەستە بڕوا ناهێنن تا یەکتریتان خۆش دەوێت.

٤- دەلّێن: پێغەمبەر ﷺ پاکانەی خۆی لەو کەسانە دەربڕیوە کە چەند جۆرە گوناهێکیان ئەنجام داوە، وکو فەرمویەتی: ((**من غشّنا فلیس منّا**)) أخرجه مسلم. واتە: ئەوەی ساختەو پاختەمان لەگەڵدا بکات لە ئێمە نیە.

((**من حمل علینا السلاح فلیس منّا**)) أخرجه مسلم. واتە: ئەوەی چەك لە دژی ئێمە هەڵگرێ لە ئێمە نیە.

((**ليس منّا من لم يرحم صغيرنا**)) أخرجه أحمد من حديث إبن عمر مرفوعاً وصححه الحاكم ووافقه الذهبي. واتە: ئەوەی بەزەیی بە منداڵان نەیەتەوە لە ئێمە نیە.

٥- دەڵێن: هەندێ گوناه بە کوفر ژمێردراوە: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾ سورەتی آل عیمران/٩٧، واتە: خودا حەجی لەسەر ئەوانە واجب کرد دەتوانن بچن. ئەوەی بێبڕواییش بکات ئەوا با بزانێ خودا بێ نیازە لە جیهانیان.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((**لا ترجعوا بعدي كفاراً يضرب بعضكم رقاب بعض**)) متفق عليه. واتە: لە پاش مەرگم کافر نەبنەوە ملی یەکتر بپەڕێنن.

دەفەرموێ: ((**من قال لصاحبه كافر فقد باء بها أحدهما**)) متفق عليه.

واتە: هەرکەسێ بە برادەرەکەی بڵێ: کافر! ئەوا بەسەر یەکێکیاندا دەشکێتەوە.

ئەوانەی لە سەرەوە خستمانە ڕو، ئەو بیانوانە بون کە خەواریجەکان کردویانە بە بەڵگەی بە کافر دانانی گوناهبارو تاوانکاران. ئێمەش هەوڵ دەدەین هەڵەو ناتەواوی ئەو بیانوانە وەدەرخەین:

١- ئەوان بەڵگەی ئەوە دەهێننەوە کە کردەوە تێکەڵە لەگەل بڕوا، نکوڵیان لێ ناکەین، بەڵام هەڵەکەیان لەوەدایە کردەوەیان کردۆتە مەرجی بڕوا هێنان. ڕاستیەکەش بەم جۆرە نیە، بەڵکو کردەوەکە ئیمانەکە ناکام دەکات، واتە ئەگەر ئەو بەشە کردەوەی تیادا نەبێ ئەوا بڕواکە بە ئەندازەی ئەو کردەیە کورتی دێنێ. هەروەکو جەستەی مرۆڤ ئەگەرچی دەستو پێی بپەڕێ یان چاوی هەڵڕژێ یان گوێی بقرتێ، ئەوا مرۆڤەکە هەر بە مرۆڤ دەمێنێتەوە ئەگەرچی کەم ئەندامیش بوە، بەڵام ئەگەر دڵی لێ کرێتەوە یان سەری ببڕدرێو لە جەستەی جیا کرێتەوە ئەوا دەمرێ.

بەم جۆرە نەمانی دەستو پێو چاوو گوێ وەك نەکردنی هەندێ کردەوە وایە بڕواکەی پێ لاواز دەبێ، بەڵام نەمانی دڵو سەر وەك نەمانی بیروباوەڕ وایە دەبێتە مایەی تونا کردنی تەواوی بڕواکە.

٢- دەڵێن فیسقو ستەم بێبڕواییە ئەوەش فامرانەوەیەکی هەڵەیەو لێتێنەگەیشتنێکی دروستە. فیسق واتای دەرچونە لە فەرمانەکانی خودا، دەرچونیش سنورێکی دیاری کراوی نیە، دەرچون هەیە بێبڕواییە، ڕەنگە

بێبڕواییش نەبێ، گەر یەکێك نکوڵی لەوە بکات فریشتە خـودا ناپەرسـتن، ئـەوا لـە فـەرمانی خـودا دەرچـوەو دەرچونەکەشـی بێبڕواییـە، خـۆ ئەگـەر یـەکێك عـەرەق بخواتەوە ئەگەر چی لە فەرمانی خودا دەرچوە بەڵام دەرچونەکەی بێبڕوایی نیـە، بەڵکو گوناهێکە.

ستـەمیش بـەم جـۆرە، زۆر جـۆرە، ستـەمی وا هەیـە رەنگـە بگاتـە پلـەی بێبڕوایی، هەیە لە خوارترە.

بۆ پـتر تێگەیشـتن دەتوانـین وێنـەی دو لاکێشـە بکێشـین، بچوکەکـەیان بێبڕوایی دەنوێنێ، گەورەکەشیان کە بچوکەکەیانی لە کۆش گرتوە: فیسقو ستەم دەنوێنێ. کەواتە بێبڕوایی بە ستەمو فیسق هەژمار دەکرێ بەڵام فیسقو ستەم بە بێبڕوایی هەژمار ناکرێ، چونکە فیسقو ستەم بواریان فرەوانترە.




٣- هەرچی ئەو دەقانەشن کە دەیکەنە بەڵگـەی نـەمانی بـڕوا بـە سـەبارەت گوناهان، یان پێغەمبەر ﷺ پاکانەی لە هەندێ گوناهان دەربڕیوە، یان بە بێبڕوایی ناوی بردوە؛ ئەوانە هیچیان وا ناگەیەنن بڕوا بە سەبارەتی گوناهو نافەرمانی تونـا ببێو مۆری بێبڕوایی لێ بدرێ.

بەڵکو مەبەست لەوەیە بڕواکە ئەو کامو هەقیقەتەی نامێنێ خـودا بڕوادارانـی پێ ستایش کردوەو لە هەندێ جێگەشدا مەرجی بـۆ دانـاون. دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ

اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ فَاسْتَبْشِرُوا بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ۝ التَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ الرَّاكِعُونَ السَّاجِدُونَ الْآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللَّهِ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ۝﴾ سورەتی تەوبە/١١١-١١٢ واتە: بەڕاستی خودا گیانو ماڵی بڕوادارانی کڕیوە تا بەهەشتیان بداتێ لەبەر ئەوەی لە ڕێگای خودا جەنگ دەکەن، دەکوژنو دەکوژرێنەوە، ئەمە بەڵێنێکی هەقەو خودا لە تەوراتو ئینجیلو قورئاندا باسی کردوەو، چ کەسێ لە خوا بە بەڵێنی خۆی وەفادارترە؟، مزگێنیان بێ بۆ ئەو کڕینو فرۆشتنەی لەگەڵ خوادا کردوتانەو هەر ئەمەشە دەستکەوتێکی گەورە(١١١) بڕواداران کەسانێکن تۆبەکارانو عیبادەتکارانو سوپاسوێژان، سەیرانکەران بۆ زانین، کڕنوشو سوژدەبەران، فەرماندەران بە چاکەو بەرهەڵستیکەران لە خراپەو، پارێزەرانی سنورو کەوشەنی خواو، بە بڕوادارانێکی ئاوا مزگێنی بدە(١١٢).

دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ۝ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ۝ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ۝ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ۝ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ۝﴾ سورەتی موئمینون/١-٥، واتە: هەڵبەت بڕواداران ڕزگارن(١) کەسانێ لە نوێژ کردندا خۆشکێنو خۆ بە کەم زانن(٢)و کەسانێ لە کردەوەی بێ کەڵكو بەتاڵ ڕوسوڕێنەرن(٣)و ئەوانەی زەکات دەرن(٤) کەسانێ پارێزەری داوێنو پاکی خۆیانن(٥).

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ سورەتی ئەنفال/ ٢-٣ واتە: بڕواداران کەسانێکن هەردەمێك ناوی خوا ببردرێ بە دڵ ترسیان لێ دەنیشێ، کاتێ ئایاتی خوایان بەسەردا

دەخوێندرێتەوە بڕوایان زیاد دەبێ‌و تەنیا پشت بە خوا دەبەستن(٢) ئەوانەی نوێژ بەجێ دێنن‌و لەوەی بژێویمان پێداون دەیبەخشن(٣).

ئەبا عوبێد: قاسمی کوڕی سەلام [٨] پاش هێنانەوەی ئەم ئایەتانە دەڵێ: " ئەو ئایەتانە شەریعەتەکانی ئیسلام ڕۆشن دەکەنەوە کە لەسەر موسوڵمانان فەرز کراوە، هەرچی گوناهەو تاوانە لە (بڕوا)ی داماڵیوە، ئەو فەرمودانەش کە لە سوننەتدا لە بارەی بڕواوە هاتونەتەوە، لەبەر ئەوەی -وەکو گوتراوە- ئەو سیفەت‌و ئاکارانە مەرجی بڕوا نین پێی بناسرێتەوە، بۆیە ئەگەر گوناهو تاوانیش لەگەڵ بڕواکە تێکەڵ ببێ ئەوا بڕواکە تونا نابێ‌و هەقیقەتەکەی هەر دەمێنێ‌و ناوەکەی ناسڕێتەوە".

پاش ئەوە وتوێژی لە بارەی گومانی ئەو کەسانە کردوە کە دەڵێن: چۆن ڕەوایە بە یەکێك بگوترێ بێبڕوایە بڕواکەشی هەر مابێ‌و تونا نەبوبێ؟. بەو بەڵگەیەی کە قورئان بە زمانی عارەبی‌و شێوازەکانی ئەوان دابەزیوە دەڵێ: (کە زمانی عارەبی لەسەر کارێك یەکێك سەرکۆنە دەکات مانای وانیە هەقیقەتی ئەو کردەوەیە نەسەلمێنێ. بۆ وێنە دەڵێنە وەستایەك بە پوختەیی کارەکەی ئەنجام نەدابێ: هیچت نەکردوە، لێرەدا مەبەست لە پوختە نەکردنی کارەکەیە نەك نەکردن).

هەروەها ئەوەشی ڕون کردۆتەوە عارەبەکان بە توندتریش دەئاخێون (بۆ وێنە کوڕێك زۆر ئازاری باوکی بدات، پێی دەڵێن ئەوە کوڕ نیە، خۆ دەشزانن کوڕیتی. بە هەمان شێوەقسەش لە بارەی براو ژن‌و بەندەکان دەدوێن ئەگەر ئەرکی برایەتی‌و ژنایەتی‌و ڕاژەکاری ئەنجام نەدەن. کەوا دەڵێن دەزانن نەژادو نیکاح‌و بەندایەتیەکەی هەر دەمێنێ‌و بەو قسەیە تونا نابێ).

پاشان بە هەمان پێودانگ ئەو دەقانە ڕون دەکاتەوە کە نەمانی بڕوا دەگەیەنن‌و دەڵێ: (ئەو گوناهانەی وا دەزانرێ بڕوا ناهێڵن‌و هەڵی دەوەشێننەوە، وا نیە بەڵکو تەنها ئەو هەقیقەتانە تونا دەکەن کە بڕواکەی پێ وەسف کراوە نەك ناو و ئەحکامەکانی بڕوا). پاشان ئەو ئایەتەی سورەتی (ئالی عیمران) دەهێنێتەوە کە دەربارەی نامەوەران دەدوێ، کاتێ خۆی خودا پەیمانی لەوانە وەرگرت کە

[٨] ئەم دەقانە لە وتەکانی ئەبا عوبێد لە پەرتوکەکەی بە ناوی (الإیمان) وەرگیراوە، لە میانەی ئەو چوار پەیامە دایە کە نوسیویەتی‌و، شێخ ناصر الدین ئەلبانیش تەحقیقی کردوە، لاپەڕە (٩٠-٩٦).

پەڕتوکو پەیامی خوا وەردەگرن: بۆ خەڵك رونــی بکەنـەوەو هیچی لێ نەشـارنەوە کەچی ئەوان فەرامۆشیان کردو خۆیان لە سالۆزیدا لەگەڵ هەندێش خودا هــەر بـە نامەوەر ناوی بردونو خواردنو ژن لێخواستنیشیانی بۆ حەڵاڵ کردوین.

پاشان دەڵێ: (هەرچـەندە ئەوانـە لـە هەقیقەتـەکانی پـەڕتوکو پەیمانـەکاندا تەکولۆ بون، بەڵام لە حوکمو ناودا هەر بە نامەوەر هەژمارن).

ئەو فەرمودەش دەربارەی یەکێکە هەڵەو پەڵەی لە نوێژدا دەکردو بوخـاریو موسـلیم گێراویتیانـەوە، پێغەمبـەر ﷺ پێـی دەفـەرمو: ((**إرجـع فصـلِّ فـإنك لم تصل**)) واتە: بگەڕێوەو نوێژەکـەت دوبـارە بکـەوە چونکـە تـۆ نوێـژت نـەکردوە. چەند جارێك وای پێ فەرمو کەچی هەمو جارەێش نوێژەکـەی دەکـرد. کەواتـە بـە ناو نوێژەکەی کردوە گەرچی هەقیقەتی نوێژەکەشی ئەنجام نەداوە.

## مەبەستی ئەو دەقانەی پێغەمبەر ﷺ تێیدا پاکانەی خۆی لە تاوانان دەربڕیوە:

ئـەبا عوبێـد دەڵـێ: (لـەو فەرمودانـەدا پاکانـە دەربڕیـن ئـەوە ناگەیـەنێ لـە شـوێنکەوتنی پێغەمبـەرو نەتـەوەی ئیسـلام داشـۆرابێ، بـەڵکو ئێمـە پێمـان وایـە مەبەست ئەوەیە: ئەژنەوای ئێمە نیە، یان پابەندی نیە بە ڕێوشوێنی ئێمەو لەسەر شەریعەتی ئێمە لاڕێیی هەیە).

## مەبەستی ئەو دەقانەی بە سەبارەتی گوناهانەوە گوناهبارانی پێ کافر کردوە:

ئـەبا عوبێـد دەڵـێ: (ئـەو فەرمودانـەی بـە سـەبارەتی گوناهـەوە بێـبڕواییو هاوبەشپەرستی دەسەلمێنن، ئەوا لـە لای ئێمـەدا بـەو بێـبڕواییو هاوبەشپەرستیە هەژمار ناکرێ کە گوناهکارەکەی پێ ببێتە بێبڕوا یان هاوبەشپەرسـت و، بڕواکـەی تونـا بکـات. بـەڵکو وای لێـك دەدەینـەوە ئـەو گوناهانـە لەبـەر ئـەوە بـەو جـۆرە سەرکۆنە کراون چونکـە لـەو سروشـتو رەوشـتانەن کـە بێـبڕواو هاوبەشپەرسـتان شەقڵیان پێوە گرتوە ....).

ئەوەشی رون کردۆتەوە ئەو گوناهانەی بە بێبڕواییو هاوبەشپەرسـتی نـاودێر کراون لەبەر ئەوەیە چونکە (رەوشـتو ئـەدگارو ڕێوشـوێنو وتـەو ئـەحکامو شـتی دیکەی هاوبەشپەرستەکانە).

بۆ پەسەندی، وتەکەی کوڕی عەبباسی بە بەڵگە هێناوەتەوە کەلەتەفسیری ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ سورەتی مائیدە/٤٤، واتە: ئەوەی حوکم بە هەناردراوی خودا نەکات کافرە. گوتویەتی: (ئەو کوفرە کوفرێك نیە لە نەتەوەی ئیسلام هاوێری بکات). (عطاء)یش گوتویەتی: (کوفرێکە لە خوار کوفرە)، لێکۆڵەرەوەی پەرتوکەکەش (کە شێخ ئەلبانیە) لە بارەی گوزارەکەی کوڕی عەبباسەوە دەڵێ: (أخرجه المستدرك من طريق طاوس عن إبن عباس وصححه هو والذهبي).

حوکم نەکردن بە هەناردراوی خودا ئەگەر چی بە بێبڕواییش هەژماردکراوە بەڵام بێبڕواییەك نیە کابرای لە ئیسلام پێ داشۆرێو لە نەتەوەی ئیسلامی هاوێر بکات. دینداریەکەی هەر دەمێنێ ئەگەرچی ئەو گوناهەشی لەگەڵ دا تێکەڵ بێ.

واتاکەی دەبێ بەم جۆرە: بێ حوکم نەکردن بە هەناردراوی خودا ڕێو پەیرەوی بێبڕوایانە، چونکە بێبڕواکان یەکێك لە ڕێو پەیرەوەکانیان حوکم نەکردنە بەو پەیامانەی خودا ناردویەتی.

ئەدی نەتبیستوە خودا دەفەرموێ: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ سورەتی مائیدە/٥٠ واتە: ئایا ئەوان حوکمی نەفامییان گەرەکە؟! پاشان دەڵێ: (لە لای تەفسیر ناساندا وایە ئەگەر کەسێك حوکم بە هەناردراوی خودا نەکات ئەوا هەر لە ریزی نەتەوەی ئەم ئیسلامە دەمێنێتەوە بەڵام ڕەفتارێکی وەك ڕەفتاری نەفامانی ئەنجامداوە چونکە نەفامان بەو جۆرە حوکم دەکەن. ئەوەش وەکو ئەو فەرمودەیە کە دەڵێ: ((**ثلاثة من أمر الجاهلية: الطعن في الأنساب والنياحة والأنواء**)) (حديث صحيح رواه الطبراني وغيره) واتە: سێ ڕەفتار هی نەفامێتیە یەك: تەشەرگرتن لە نەژادی یەکتری. دو: یەخە دادڕینو شین و ڕۆڕۆ کردن. سێ: ئەستێرەگەریی.

هەروەها دەفەرموێ: ((**آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب وإذا وعد أخلف وإذا أوتمن خان**)) متفق عليه. واتە: نیشانەکانی دوڕوان سێیە: گەر قسە بکات درۆ دەکات، گەر بەڵێن بدات دەیشکێنێ، گەر ڕاسپاردەیەکی پێ بدرێ گزی لەگەڵدا دەکات.

ئەبا عوبێد دەڵێ: (ئەم گوزارانە وایان لێ نافامرێتەوە بکەری ئەم گوناهانە نەفام بێ یان بێبڕوا بێ یان دوڕو بێ، چونکە ئەو بڕوای بە تەواوی هەناردراوەکانی خودا

هەیەو فەرزەکانیش جێبەجێ دەکات، بەڵکو مەبەست ئەوەیە رون بکرێتەوە ئەم تاوانو گوناهانە ئاکارو رەفتاری بێبڕواکانەو لە قورئان سوننەتیشدا حەرامن)، تا بەڵکو موسوڵمانان خۆیان لێ بپارێزنو لاسای بێبڕوایان نەکەنەوە چ لە خورەوشتو چ لە شەریعەتەکانیان.

فەرمودەیەکیشی هێناوەتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**إذا استعطرت المراة ثم مرّت بقوم يوجد ريحها أنها زانية**)) رواه أبو داود والترمذي وصححه.
واتە: هەر ئافرەتێك گوڵاو لە خۆی بداتو بەلای کەسانێکدا بڕواتو بۆنەکەی بکەن ئەوا زینای کردوە... باشە ئایە مەبەست لێرەدا ئەو زینایەیە کە حەددی لەسەرە؟.

رەنگە ئەبا عوبێد لەو قسەیەیدا: (حوکم نەکردن بە هەناردراوی خودا کوفرێك نیە لە نەتەوەی ئیسلامی هاوێر بکات). مەبەستی حوکمی ئەو دادوەرو حاکمە موسوڵمانە بێ کە لە کێشەکەیدا بە ئارەزوی خۆی حوکم دەکات، لەگەڵ ئەوەی لە هەمو کێشەکانی دی حوکمی خودا پیادە دەکات.

بەڵام ئەوانەی ئەمڕۆکە یاسای بێبڕواکانیان هێناوەو بە ئاگرو ئاسن بەسەر گەلانی موسوڵمانی پیادە دەکەن، لەو پێناوەشدا دژایەتیو بەرانگڕی هەمو ئەوانە دەبنەوە کە بانگەشەی پیادە کردنی حوکمی ئیسلام دەکەن.. ئەوانە فریان بە ئیسلامەوە نیەو لێی داشۆراون ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ۝﴾ سورەتی نیساء/٦٥ واتە: سوێند بە پەروەردگارت بڕوا ناهێنن تا ئەو کاتەی لە ناکۆکیەکاندا ئەتۆ دەکەن بە دادوەرو کە حوکمیشت بۆ دان لە نەفسیاندا هیچ تەنگیو ناڕازیبونێك نەبێو بەتەواوی بەرفەرمان بن.

## ئەوانەی دەڵێن ئەنجامدەری گوناهی گەورە بڕواکەی تەواو و بێ کەمایەسیە

خەواریجەکان یەك لایان لە دەقەکان وەرگرتوە، ئەو دەقانەی کە بڕوا دەشێوێننو لێی کەم دەکەنەوە، پەیان بەوە نەبردوە کە ئەم دەقانە هەمو بڕواکە

تونا ناكەن. لە بەرانبەر خەواريجانيشدا كۆمەڵێكی ديكە [٩] پـەيدا بـون پێيـان وابـو بكەری گوناهی گەورە بڕواكەی هەر بە تەواوی دەمێنێتەوە.

بڕياريان دابو (بڕوا بە سـەبارەتی گوناهـان زيـانی لیٚ ناكـەویٚ). ئـەو كۆمەڵـە ديانگوت: (بڕوا بیروباوەڕی نـاو دڵو دەربڕيـنی زمانـە. كـردەوەش پـەيوەندی بـە بـڕواوە نيـە). هـەروەها دەيـانگوت: (بـڕوای نێـو دڵ يـەك پارچەيـەو هـەمو خـەڵك بڕوايان وەكو يەكە بیٚ جياوازيی). بۆ ئەو بۆچونانەشيان ئەو دەقانەيان بـە بەڵگـە دەهێنايەوە كە باس لە چونە بە هەشتی ئەو بڕوادارانە دەكات ئەگەر چی گونـاهی گەورەشيان ئەنجام دابیٚ.

بۆ وەلامدانەوەيان چـەندان دەقمـان هەيـە دەيسـەلمێنیٚ كـردەوە بەشـێكی بڕوايـە. بـۆ وێنـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمویٚ: ((**الإيمـان بضـع وسـبعون شـعبة: أعلاها قول "لا إله إلا الله" وأدناها إماطة الأذى عن الطريق، والحياء شعبة من الإيمان**)) متفق عليه. واتە: بڕوا هەفتاو هەندیٚ لكی هەيە، بەرزترين لكی وتنی "**لا إله إلا الله**" يەو نزمترين لكيشی لادانی ئازارێكـە وەكـو بـەردو دڕكو شـتی تـر لەسەر ڕێگەی خەڵكی.

ئـەم فەرمودەيـەش بەرپـەرچيان دەداتـەوە كـە هەڕەشـەيەكی تێدايـە: ((**لا يزنـي الزانـي حين يزنـي وهـو مؤمـن، ولا يشـرب الخمر حين يشربها وهـو مؤمن**)) متفق عليه واتە: زيناكار لەو دەمەی زينا دەكـات بـڕوای نيـە، عـەرەقخۆر لەو دەمەی عەرەق دەخوات بڕوای نيە.

ئەو دو كۆمەڵەش (خەواريجو مورجيئەكان) چەندين ئاسەواری خراپو بەديان لێتەنيوەتەوە، خەواريجەكان كە خەڵك بە بێبڕوا دادەنێـن توشـی دڵ سـاردیو بـیٚ هومێدييان دەكەن. مورجيئەكانيش خـەڵك تيـخ تيخـە دەدەن تـا گونـاهو تاوانـان ئـەنجام بـدەن. بـەلام زانايـانی پێشـين لەناوەڕاسـتی هـەردوكيان دان لـە دنيـادا بڕواكـەيان بـە گوێـرەی گوناهـەكانيان تەماشـا دەكـەنو پێيـان وايـە لێـی كـەم دەكاتەوە، لە ڕۆژی ژيانەوەشدا حەواڵەی خودای دەكەن، گـەر خـوا بيـەویٚ لێيـان خۆش دەبیٚ گەر نەشيەویٚ سزايان دەدات.

---

[٩] بەو كۆمەڵە دەڵێـن (مورجيئـەكان)، چونكـە كردەوەكانيـان لەگـەڵ ئيمـاندا بەپاشاخستوە، مورجيئـە لـە (إرجـا) هـاتوە بەواتای دواخستن دێت.

# بیروباوەڕو فەلسەفەو کەلامناسی[7]

هەرچەندە ئەو بابەتەی فەلسەفە دەیەوێ تاووتوێی بکاتو تێیدا بگاتە ئامانج، هەمان بابەتە کە دین تاووتوێی دەکات. فەیلەسوفەکان دەڵێن تۆژینەوەکانمان بەو ئامانجەیە ماکو مەبەستی بون بناسین، هەروەها ئەو ڕێگەیەش بناسن کە-ئێستا بێ یان لە داهاتودا بێ-، ئاسودە بونی مرۆڤایەتی پێ وەدی دێت. ئەم دو ئامانجە بابەتی فەلسەفەزانیە بە هەردو بەشە زانستیو ئەزمونیەکەی، هەر ئەو دوانەشن بابەتی ئاینزانی[10]، هەرچەندە ئەو جیاوازیەی لە نێوان ئاینو فەلسەفەدا هەیە جیاوازیەکی زۆر گەورەو فرەوانە. چونکە لە هەر روێکەوە بیگری جیاوازە.. لەروی کانگاو ژێدەریان بێ، لە روی شێوازو ڕێگاکانی بەڵگە هێنانەوە بێ لە روی کاریگەریو دەسەڵاتەوە بێ، یا لەروی ئاسەوارەکانیان بێ... لە هەر هەمویان جیاوازیەکی فرەوان هەیە.

تەقەلا دەدەین هەمو ئەوانە ڕۆشن بکەینەوە، تا ئەو پێکەڵیەی لەنێوان ئاینو فەلسەفەدا دروست بوە، نەمێنێ.

## ١- ژێدەرو کانگا:

فەلسەفە لەهەمو شێوەکانیدا "کردەیەکی مرۆڤانیە" هەرچی لە سروشتو ڕێکخستی مرۆڤ دایە کاری تێدەکات. وەك بیرتەسکیو سنورداری توانا، بەرەبەرەیی گەیشتن بە نەناسراوەکان، بەرتوان بونی بۆ گۆڕان وشێوان، هەڵبەزینو دابەزین لە نێوان ڕێنوێنیو گومڕاییدا، هەروەها کەم و زۆر نزیك بونەوەو دورکەوتنەوە لە پلەی تەواویدا.

هەر بۆیەشە پیتۆڵو زۆرزانانی فەلسەفە نەیانتوانیوە لەو کاریگەرییانەی لە ژینگەو دەوروبەریاندا هەن خۆ هەڵبوێرن[11]، لەبەر ئەوە تێڕوانینو بیروباوەڕەکانیان ڕەنگدانەوەیەکی فرەوانی دەوروبەری بەسەرەوەیە.

ئێستاکە ئەگەر (ئەفلاتون) بە وێنە بێنینەوەو بڕوانینە بەرهەمەکانی بە ئاشکرا دیارە ئەفسانەکانی هاوسەردەمی کاوێژ دەکاتەوە، بەڵکو خۆشی

[10] الدين-دراز/٥٩-٦٠.

[11] الدين-دراز/٧٣.

ئەفسانەی دادەڕشت‌و بیروباوەڕو بیرۆکەکانی تێ دەئاخنی، تەنانەت چەندین بیروبۆچونی هەیە هەر هەمان ئەو ئەفسانانەن کە لەو سەردەمیدا هەرمێنی هەبوە.

با گوێگرینە (عەققاد) بزانین لە بارەی ئەفلاتونەوە چ دەڵێ: (ئەفلاتون بە پێی نەریتی باوو ئاشنا بونی بە شتە هەست پێکراوەکان، ژینگەی (بتپەرستی)ی بەسەردا زال بوە، بۆیە پەروەردگاران‌و نیو پەروەردگارانی وای خستۆتە نێو بیروباوەڕەکەی هەرگیز شوێنێکی نیە لە ئاینەکانی یەکخواناسیدا)[12].

پاشان عەققاد وەکو بەڵگە دیدەوەریەکەی ئەفلاتون لە بارەی (بون) دەخاتە رو و دەڵێ: (لە بۆچونی ئەفلاتوندا بون دو چینی هەمبەری هەیە: چینی ئاوەزی رەهاو چینی ئەنبوژەنی سەرەتایی یان (هەیولی: چڵمۆکە)، تەواوی توانست لە ئاوەزی رەهاوەیە، تەواوی دەسەوسانیش لە چڵمۆکەوەیە. لەنێوان هەردوکیاندا چەندین بونەوەر هەن کە بەپێی بەهرەمەند بونیان لەو ئاوەزە: بەرز دەبنەوەو، بەپێی بەهرەمەند بونیشیان لەو چڵمۆکەیە: نزم دەبنەوە، ئەو بونەوەرانەی لە نێوانیشیان دان: هەندێکیان پەروەردگارن، هەندێکیشیان نیو پەروەردگارن، هەندێکیشیان: مرۆڤەکانن)[13].

ئەو هۆیەی ئەفلاتونی رازی کردوە (پەروەردگاری ناوەڕاستی) هەبێ هەروەکو عەققاد دەڵێ: (ویستویەتی پاساوی ئەو بەدی‌و کەمایەسی‌و ژوارەی لە جیهاندا هەیە، بداتەوە. چونکە ئاوەزی رەها تەواوو بێکەمایەسیەو شوێنکات تخوبرێژی ناکات و، تەنها چاکە دەبەخشێ. پەروەردگارە ناوەڕاستیەکانیش پێناوکاری لە نێوان خواوەندی بە توانا‌و هەیولیدا ئەنجام دەدەن، کەواتە بونی بەدی‌و کەمایەسی‌و ژان‌و ژوار لە ئاکامی ئەو پێناو کاریە دایە)١٤. ئاشکراشە ئەفلاتون بڕوای بە (تەناسوخی ئەرواح) هەبو... ئەوەبو ژێدەری فەلسەفە.

بەڵام بیروباوەڕی ئیسلامی سروشی ئەو خودایەیە کە هەرچی سیفەتەکانی خواوەندێتیە هەیەتی‌و وتەکانیشی بەرتوانی گۆڕان نیەو هێند راستە قەت ناڕەوای لەگەڵدا تێکەڵ نەبوەو نابێ. بیروباوەڕی ئیسلامی (بەخششێکی بەڕێزی)

---

[12] الله– العقّاد/١٢٩.

[13] الله – العقّاد /١٢٩.

[14] هەمان سەرچاوە.

پەورەردگارە کە بەندە زۆر بە سانایی‌و بێ گرێ‌و گرفت‌و رەنج‌و شەکەتی وەریدەگرێ‌و لە ماوەیەکی زۆر کورت‌و لە چاوتروکانێکدا دڵیان روناك دەکاتەوە[١٥].

## ٢- رێوشوێن و رێباز[١٦]:

رێوشوێنی فەلسەفی هەر لە سەرەتای رێگەوە تا کۆتایی لەگەڵ رێوشوێنی ئیسلامی جیاوازی هەیە. زۆرینەی فەیلەسوفەکان بە توێژینەوەی نەفسی مرۆڤایەتی دەست پێ دەکەن‌و دەیکەنە بنەڕەت بۆ بنیادنانی بیرۆکەکانیان. بە گوێرەی پەی بردنیان بە زانیاری ئاخافتونە، ئەوجا جار هەیە بە هەست بوە، جاریش هەیە بە ئاوەزو، جاریش هەیە بە هەردوکیان.

پیتۆلان زانستەکانی بەر هەست‌و بەڵگە نەویستیان کردۆتە مایەی پەی بردن بە کاروبارەکانی سروشت‌و ژمێرکاری‌و رەوشت. ئەم سێ هینەیان بۆ هەر هەمو زانستەکانی دیکە بە بنەڕەت داناوە.

ئەوەشیان لە بنەڕەتەکانی کەلامناسیدا رەنگرێژ کردوە بۆیە دەڵێن: یەك نیوەی دوە، هیچ تەنێك لە دو شوێندا نابێ، دو هاودژ کۆ نابنەوە، وەکو رەش‌و سپی.

زۆریشیان رەوشتی وەکو دادو داوێنپاکی لە بنەڕەتەکان هەژمێر ناکەن بەڵکو لە لکەکانیان دادەنێن‌و دەڵێن پێویستیان بە بەڵگەیە.

زۆربەی نوسەرەکانی بواری فەلسەفە بە ژێربێژی پاشان بە سروشتی‌و بیرکاری دەست پێ دەکەن ئینجا دەچنە سەر بابەتی زانستی پەرستراوێتی. نوسەرانی بواری کەلامناسیش بەچەند پێشەکیەك لەبارەی: سەرنجدان‌و زانست‌و بەڵگە دەست پێ دەکەن-کە لەبابەتەکانی ژێربێژی دان- پاشان دەچنە سەر بابەتی پەیدا بونی جیهان‌و سەلماندنی بونی پەیداکەرەکەی هەشیانە لە دابەشکاری زانیاریەکان دەچنە سەر بابەتی هەبون‌و نەبون‌و بەشەکانیان، هەروەکو فەیلەسوف (پیتۆل) کە لە یەکەمین زانستی خواوەندیدا پێدا دەچێ.

زۆربەی پیتۆڵەکان زۆر تر بە کاروباری سروشت پێدادەچن تا دەگەنە باس‌و خواسی گەردونناسی. ئەوانەی لە بارەی پەرستراوو خواوەندی دەدوێن باسی

---

[١٥] الدین دراز/٧٣.

[١٦] بۆ ئەم بابەتە بگەڕێوە سەر (مجموع الفتاوی)ی شێخی ئیسلام (٢/١-٢٥)، ئەوەی ئێمەش بە کورتی باسمان کردوە و سەلماندومانە بنەڕەتێکی مەزنەو بەڵگەیە ل ەسەر فیقهە فرەوانەکەی.

(واجب الوجود) دەکەن‌و پاشان باسی ئاوەزو نەفس. هەیانە لەسەرەتاوە (واجب الوجود) دەسەلمێنێ، چونکە دەڵێن مادەم بون هەیە بوار نیە دەبێ پەیداکەرێکی هەبێ.

ئەو کەلامناسانەی دان بە یەکخواناسی دادەنێن‌و لە پەرتوکە کەلامیەکانیاندا باسیان کردوە مەبەستیان تەنها ئەوەیە تاکایەتی‌و بێ هاوبەشی خودا بسەلمێنن، واشدەزانن مەبەست لە وتەی لا إله إلا الله تەنها ئەوەندەیە.

ئەو رێوشوێنە فەلسەفە کەلامییە، توێژەرەوەکەی هێند خەریك دەکات تەنانەت هەمو تەمەنی بۆ تەرخان بکات هێشتا لە خەمی نارەخسێ‌و تەواوی ناکات، بەڵکو واشی لێ دەکات گومان لە ئاوەر پەیدا بکات، ئەوجا دەکەوێتە ناو گێژاوی سەرگەردانی‌و دڕدۆنگی‌و هۆتبونەوە.

بەڵام رێوشوێنی قورئانی سەرەتای بانگەوازەکەی‌و هی هەر هەمو پەیامبەرانیش بانگەواز بۆ پەرستنی تەنها خودا دەکەن ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ سورەتی ئەنبیاء/٢٥، واتە: هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێ، سروشمان بۆ کردوە هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نیە تەنها خودا نەبێ‌و هەر ئەویش بپەرستن، هەمو پێغەمبەرانیش لە سەرەتای بانگەوازەکانیان بانگی گەلەکەی خۆیان کردوە خودا بپەرستن‌و گوتویانە: ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ﴾ سورەتی موئمینون/٢٣. داوایان لە گەلەکەیان کردوە بە دڵو زمان‌و جەستە خودا بپەرستن، پەرستنی خودا ناسین‌و یادکردنەوەش دەگرێتەوە.

بنەڕەتی زانست لە لای پێغەمبەراندا هەبونی زانیاریە دەربارەی خودا. هەر خودا یەکەمەو بونەوەری ئەفراندوە، پایانەو رودانەکان بۆ ئەو دەگەڕێتەوە. خۆی سەرچاوەی هەمو زانیاریەکە، یاد کردنەوەی سەرچاوەی هەمو یادێکە، سەرچاوەی هەمو کردەوەیەکە کە بۆی ئەنجام دەدرێ، زانیاریەکان لە زانیاری هەبون لە بارەی خواوە لك‌و پۆپیان لێ دەبێتەوە. پەرستن‌و پێ مەبەست بونی خودا؛ لەنیازو مەبەستە چاکەکان سەرچاوە دەگرن، دڵیش ئەگەر متمانە بکاتە سەر خودا سەقامگیرو خۆگر دەردەچێ.. چونکە کەناری تەقەت‌و بەڵگەی رێڕون‌و

سەلماندنی تۆکمە هەر لە لای ئەو دایە، حالیش وایە: یان زانیاری‌و بڕوای لە زۆریدا دەبێ، یان لە بێبڕوایی‌و نەفامیدا دورو سەلامەت دەبێ.

هەبونی زانیاری دەربارەی خودا مەزنترین ڕێوشوێنی ناسینی خوداو ژیان‌و نەفسی مرۆڤایەتی‌و بونەکانە.

کوڕی ئەبا حاتەم دەڵێ: (هەمو شتێکمان بە هۆی خواوە ناسی)، لە کوڕی عەبباسیشیان پرسی: چۆن پەروەردگارت ناسی؟ گوتی: ئەوەی بیەوێ بە پێوانەکاری دینی خۆی بناسێ تا دەمرێ هەر لە ڕەشکەو پێشکە کردندا دەژێ، بەردەوامیش لاڕێ دەبێ‌و لارو وێری دەکات. وای دەناسم کە خۆی پێمان ناساندوە، واشی وەسف دەکەم کە بە خۆی خۆی وەسف کردوە).

پێغەمبەریش ﷺ موعاذی کوڕی جەبەلی نارده یەمەن تا خەڵك بۆ دینی خوا بانگ بکات، پێی گوت: تۆ دەچیە ناو هۆزێکی نامەوەر، فەرمانی پێ کرد یەکەم شت بانگیان بۆ بکات: پەرستنی خوا بێت، ئەگەر ئەوەیان زانی فەرزەکانیان پێ ڕابگەیەنێ.. فەرمودەیەکی تەواوەو بوخاری گێڕاویەتیەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ نەکرد خەڵکەکە بۆ گومان‌و سەرنج‌و ئەو شتانە بانگ بکات هەروەکو لە ڕێبازی کەلامناسیدا بەدی دەکرێ.

هەر بۆیەشە پێشەوا بوخاری -بەر میهری خودا بێ- لە پەڕتوکەکەیدا بە بنەڕەتی زانست‌و بڕوا، بە ناوی (سەرەتای دابەزینی سروش) دەستی پێ کردوە.. باسی چۆنیەتی دابەزینی زانست‌و بڕوای کردوە کە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ دابەزیوە، ئەنجا پاشان بە بابەتی "بڕوا" کە بەڕاست سەلماندنی هەناردراوەکانە، ئەنجا بە بابەتی "زانست" کە ناسینی هەناردراوەکانە، پەڕتوکەکەی بەو ڕیزبەندیە ڕێکخستوە نیشانەی زانایی‌و دانایی ئەو پێشەوا بەڕێزەیە -بەر میهری خودا بێ-. خودا لە ڕۆژی دواییدا کە خەڵك کۆدەکاتەوە لە بارەی زانستی بەرهەستی‌و بەڵگە نەویستی‌و ژێربێژی‌و سروشتی پرسیارو وەلامیان لەگەڵ دا ناکات، بەڵکو پرسیاری ئەوەیان لێ دەکات ئایا بە پیر بانگەوازی پێغەمبەران چوینە یان نا؟ ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ۞ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ ۞ وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ ۞ فَاعْتَرَفُوا بِذَنبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَابِ السَّعِيرِ ۞﴾

سورەتی مولك/٨-١١ واتە: هەرچەند دەستەیەك فڕێ بدرێنە ناویەوە دەرگەوانەكانی دۆزەخ پرسیاریان لیّ دەكەن: ئایا لە دنیادا پێغەمبەرێكی ترسێنەرتان بۆ نەهاتوە؟(٨) دەڵێن: بەڵێ بۆمان هاتوە، بەلام بە درۆمان دەزانیو، پێمان دەگوتن: خودا هیچی نەناردۆتە خوارەوە، ئێوە لە گومڕابونێكی گەورەدان (١٠) دەڵێن: ئەگەر قسەی پێغەمبەرانمان ببیستبایە، یان تێگەییبان، ئەمڕۆ لە دۆزەخییان نەدەبوین(١١).

بیانوبڕیش تەنها بە ناردنی پێغەمبەران دەبێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ سورەتی ئیسراء/١٥، واتە: ئازارو سزای هیچ گەلێكمان نەداوە تا پێغەمبەرمان بۆ ناردوە. هەروەك چۆن خاڵی دەست پێكردنو سەرەتایی لە رێوشوێنی قورئاندا پەرستنی خوداو ناسینیەتیو هەر هەمو زانستەكان لەویەوە سەرچاوە دەگرن، خاڵی كۆتاییو لێبونەوەش هەر ئەو پەرستنەیە كە تێیدا پێویستە خودا بناسرێو یەكخواناسیی بۆ ئەنجام بدرێ. كەچی ئەوپەڕی خواستی كەلامناسان هەر ئەوەیە دان بەتاكێتی خودا بنێنو بە ئافەریدگاری تەنیای بزانن. رێوشوێنی قورئان ئەوە بە بەشێك دەزانیو هەر بەوەندە ناوەستێ. هاوبەشپەرستەكانیش هەر ئەوەندەیان لیّ قبوڵ نەكراو دادیشی نەدان. ئاشكراشە چەندان شەڕیان لەگەڵ دا كراوە ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ سورەتی لوقمان/٢٥ واتە: گەر لێیان بپرسی كێ ئاسمانەكانو زەوی ئەفراندوە دەڵێن: هەڵبەت خودا، ﴿قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ۞ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾سورەتی موئمنون/٨٦-٨٧ واتە: گەر لێیان بپرسی كێ پەروەردگاری حەفت ئاسمانەكانو پەروەردگاری بارەگای مەزنە دەڵێن خودا.

بەلام پیتۆلەكان لە بارەی ئاوەزو نەفسی مرۆڤیان كۆڵیوەتەوە، سەرشێتانە پەلەقاژە دەكەنو هەرجارەی هەرایەك ساز دەكەن،باشترین بەڵگەش لەسەر دەسەوسانو گەڕەلاوژێیان ئەو پێشكەوتنە زانستیەیە كە لەو سەردەمەدا تا بڵێی سەمەرە، كەچی تا ئێستا هەقیقەتی نەفسی مرۆڤایەتی ئاشكار نەكردوە.

(مرۆڤ كردو كۆشێكی بێ ئەندازی لە پێناو ناسینی خۆی تەرخان كردوە، كەچی ئێمە لەگەڵ ئەوەی خاوەنی هەمبانەبۆرینەیەكین لەو سەرنجو تێ بینییانەی

زانــاو پیتــۆڵو شــاعیرو روحانیــەکان کــە لــە هــەمو ســەردەمە جیاوازەکــاندا بەخشیویانە.. لەگەڵ ئەوەشدا تەنها لە چەند لایەنێکی دیاری کراوی نەفسمان تــێ دەگەین‌و وەکو مرۆڤێکی تەواو لە خۆمان نەفامیوین...

ئێمە هەر ئەوەندە لە مرۆڤ دەگەین کە لە چەند بەشێك پێك دێـت، تەنانـەت ئەو بەشانەش بە هۆی کەرستە بەردەسـتەکان دۆزراونەتـەوە! . هـەر یەکـەمان لـە ئاپۆرەیەك مۆتەکە پێکهاتوە، کەس نازانێ چۆن چۆنیە.

لە راستیدا نەزانینەکەمان شتێکی پیادە کراوە، چونکە زۆربـەی هـەرە زۆری ئەو پرسیارانەی روبەڕوی ئەوانـە دەکرێتـەوە کـە خـەریکی توێژینـەوەی رەگـەزی مرۆڤن بێ وەڵام دەمێننەوە، لە بەرئەوەی هێشـتا چـەندان شـوێنی بـێ سـنور لـە ناوەوەماندا هەیە نایناسین (لە پەرتوکی –العلم یدعوا للإیمان– وەرگیراوە).

جا ئەگەر ناسینی توێژینەوەکانی سەدەی بیستەم هەر ئـەوەندە بـێ! ئـاخۆ چۆن دەکـرێ نەفسـی مـرۆڤ بکرێتـەوە بنـەڕەتو سـەرچاوەی چەکـەرە کردنــی زانیاری؟.

با ئەودیوی سروشتیش هەر بوەستێ کە فەلسـەفە تێـیدا وەهـا گومـڕا بـوەو پەلەقاژەی تێدا کردوە بیر لە بەریدا ئەنتیکەی پێ بێ.

## ٣- تاوی کارتێکردن[١٧]:

بیروبـــاوەڕ دەســـەڵاتێکی زۆر بـــەهێزو زاڵـــی بەســـەر نەفســـی بیروباوەڕمەندەکانەوە هەیـە. بـەڵام فەلسـەفە لـەو بەهرەیـە بێبەشـەو قـەت بـۆی نـاکرێ وابـێ، ئەگـەر نـا سـنوری خـۆی دەبـەزاندو لەگـەڵ خۆشـیدا ناسـاز دەبـو. هۆیەکەش ئەوەیە فەلسەفە بە گوێرەی توانستی مرۆڤایەتی لە ناسـین‌و هەقیقـەت دەکۆڵێتەوە، پاشان ئەو ئەنجامانە رادەگەیەنێ کە لە هەندێ لایەنی ئەو هەقیقەتە پێی گەیشتوە. پیتۆلان یەکەمین کەسن هەست بە کەمایەسـیو کورتـبڕی ئـاوەزی مرۆڤـو هــەرچی لـە مرۆڤدایـە، دەکـەن‌و دەزانـن ناتـەواوە. بۆیـە خۆبەکـەمگرتن‌و سـەرکز کردنـی زانسـتانەیان لـە دیـارترین تایبەتمەندیەکانیانــە. سـوقڕات لــەنێو پیتۆلاندا ناسراوو جێ دیارە دەڵێ: (ئەو شتەی تا ئێستا چاك دەیزانم ئەوەیە هیچ نازانم).

---

[١٧] بۆ ئەم بابەتە بگەڕێوە سەر پەرتوکی (الدین)ی دەراز/ لاپەڕە ٦٩ بەرەو سەرەوە.

بەڵام خـاوەنی بیروبـاوەڕ وەهـا نیـە، بـەڵکو دەزانـێ ئـەو بیروبـاوەڕەی ئـەو هەڵیگرتوە سەرچاوەکەی لەو خودایەیە کەهەرچی نهێنیـە پێـی زانیـارەو زانسـتی بەسەر هەمو شتێکدا هەیە بۆیە دەزانێ زۆر راستو بێ خەوشو بێ پەڵەیە.

سروشـتی بیروبـاوەڕ وایـە گـەردن بـە خاوەنەکـەی کـەچ دەکـاتو پابـەندی دەکـات، مشـتومڕو دەمەوەریشـی لێ قبـوڵ ناکـات، بـەڵکو رەواشـی پـێ نـادات لێکۆڵینەوەی لەسەر بکاتو لێی دو دڵ بێو بکەوێتە راڕایی، خۆ ئەگەر لە بابـەتێك وای کرد ئەوا لەو بابەتەدا نابێتە دینـدار بـەڵکو دەبێتـە فەلسـەفی تـا ئـەو کاتـەی لەسەر "را" یەك سەقام دەگرێو ملکەچی دەبێ، ئەو کات منجـەمنجو لێکدانـەوە هەڵناگرێ؛ بەڵکو دەبێتە بیروباوەڕێکی ئەو تۆ و دڵسۆزیەکی وای بـۆ دەنوێنـێ لـە ئاسا بەدەر بێ. تەنانەت پێی ئاسـایی دەبـێ لـە پێنـاویدا سـەرگەرد ببـێو ببێتـە قوربانی. خەریکە بڵێین لە هیچ بیرۆکەیەگی دی ئەم جۆرە دەسەڵاتە نابینرێ کـار بکاتە سەر نەفسی مرۆڤ جا زانستی بێ یا سیاسی بێ یان هەر جۆرێکی دی بێ.

شێخ محمد عبدالله دراز نهێنی ئەم دیاردەیە ئاشـکار دەکـاو دەڵـێ: (نـهێنی ئەو دیاردەیە هێزو تاوی دەسەڵاتی بیروباوەڕە، فەلسەفە نیەتیو لێی بێبەشە).

جیاوازیەکە لەنێوان هەقیقەتی ناسینو هەقیقەتی بڕوایە.. لە نێوان ئەو تـاوە نەفسیەیە کە ناسین پێی هەڵدەستێ لەگەل ئەو هێزە نەفسییەی بڕوا دەیبەخشێ. هی وا هەیە باسی برسێتیو تێنوێتی بۆ بکەی هەرچەندە ئازارەکەشی نەچەشـتبێ تێی دەگات. رەنگە لە واتای تاسەو خۆشەویستی بگات ئەگەرچی لەوانیش نەبێ.

ئەگەر لە بەردەم دەستکردێکی نایابی هونەر بوەستێ لە نهێنیـەکانی بگـاتو بزانێ چ وردەکاریەکی تێدایە کەچی چێـژی لێ ناکـاتو پێـی کەمـەند کێـش نابـێ. رەنگە بزانێ فلان کەس زیرەکایـەتی هـەبێ یـا ئـەدیب بـێ یـا سیاسـەتمەدار بـێ، کەچی سۆزو پەرۆشی بۆ نابزوێ... ئەوانە چەند وێنەیەك بون لە ناسینو زانین دا، هەسـت یـان بـیرو بەڵگەنەویسـتی پێمـان ئاشـنا دەکـات. نەفسـیش وەك ئـەوەی شتێکی نامۆی دیتبێ هەستی پێ دەکات یان هەر بە خێرایی بەسەریدا تێدەپەڕێو بە ئاستەم کاری تێدەکات، ناگاتە بۆتکەکەیو کاری تێبکات، یـان وەری دەگـرێو پەزمەندەی دەکات بەڵام هەرسـی ناکـاتو مـل کـەچی نابـێ، جـا هـەر حاڵـەتێکی دەرونی ئەگەر هزرو رێبیرەکان لەو ئاستەدا راگرێ ئەوا هیچ پەیوەندی بـە بـڕواوە نیە، چونکە بڕوا لـە قوڵایـی ویژدانـدا وەڵامدانـەوەی هەیـە لەگـەڵ پـەردەکانی دڵ ئاوێتە دەبێو سینەی پێ تەنگو تریسك نابێ بەڵکو پێی فرەوانو گوشـاد دەبـێ،

نەفس فێنك دەكاتەوەو ئاوەری پێ دەبەخشێ. بڕوا لە ئاسمانی ئاوەزدا بیرۆكە وەردەگرێو دەیخاتە بۆتكەی دڵو دەیكاتە نانو ئاوی نەفس، دەبێتە رەگەزێكی ژیانی. بڕوا هزر بۆ هێزێكی پاڵنەرو كاراو ئەفرێنەر دەگۆڕێو لەو گەردونەدا مەرد نیە بیتەكێنێتەوە بەڵكو هەر گاڵتەشی پێی دێت. ئەوەبو جودای نێوان ئاینو فەلسەفە. ئامانجو مەبەستی فەلسەفە ناسینە، ئامانجو مەبەستی ئاینیش بڕوایە، خواستی فەلسەفە هزرێكی وشكەو لە وێنەیەكی بێ براوتو شەختە كردودا رەنگ رێژ دەبێ بەڵام خواستی ئاین روحێكی جمێنەرو هێزێكی بزوێنەرە.

(دەراز) ئەوەشی تێبینی كردوە كە فەلسەفە كار لەسەر یەك لایەنی نەفس دەكات كەچی ئاین سەرپاكی نەفس دادەگرێتەوە، فەلسەفە تێبینی دانو شیكردنەوەو رێكخستنەوەیە، دەست سازیەكە رەگو ریشەی هەقیقەت هەڵدەكێشێو روحی لێ پەرەم بە پەرەم دەكات، پاشان سەر لە نوێ بە نەشمێكی دەستسازی پارچەكان بەیەكەوە دەلكێنێتەوەو لەسەر ئاوێنەی ژیری رایدەنوێنێ، ئینجا توێژێكی وشك لەسەر روی نەفس دەنیشێنێ. بەڵام ئاین سرودێكە سەرپاكی هەقیقەتی لە ئامێز گرتوەو توێژەكەی دەبڕێ تا دەچێتە نێو قوڵایی‌و بۆتكەی دڵ و، نەفسیش تەواوی خۆی پێ دەبەخشێو رێشمەكەی دەگرێتە دەست.

لێرەدا دەراز جیاوازیەكی ورد دەخاتە رو كە لە نێوان ئاینو فەلسەفەدا تێبینی كردوەو دەڵێ مەبەستی فەلسەفە تەنها دیدەوەرێتیە تەنانەت لە بەشە كردەكیەكەشیدا بەڵام ئاین مەبەستی كردەكاریە تەنانەت لە بەشە دیدەوەرێتیەكەشیدا. ئەوپەڕی خواستی فەلسەفە ئەوەیە هەقو خێرمان پێ بناسێنێ كەچینو لە كوێن؟

پاشان پێی گرنگ نیە هەڵوێستمان لە ئاست ئەو هەقەدا چۆن بێ كە دەیناسێنێ یان لە ئاست ئەو خێرەدا سنوری بۆ دەكێشێ.

بەڵام ئاین هەقمان پێدەناسێنێ نەك بۆ ئەوەی تەنها بیناسین، بەڵكو تا بڕوای پێ بێنینو خۆشمان بوێو رێزو شكۆی بگرین، واجبەكانیشمان پێ دەناسێنێ تا بیانكەینو، نەفسمان بە هەقیقەتەكەی تەواو بكەین.

بۆ زیاتر رون بونەوە بەراوردێكی لە نێوان ئاسەوارە كردەییەكانی ئاینو فەلسەفەدا كردوە. دەراز ئەوەشی رۆشن كردۆتەوە ئاین سەرنج بۆ ئەوە هەڵدەنێ

تا مـرۆڤ ئافـەریدگاری خـۆی بناسـێ‌و خۆشـی بـوێ‌و بـە پـیرۆزی بگـرێ، کـەچی مەبەستی فەلسەفە تەنها ئەو ناسینەیە کە هۆو هۆکار بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

هەروا ئەوەشی رون کردۆتەوە بیروباوەڕی ئاینی لە گۆڕەپانی کۆمەڵایەتیەوە هەڵدەقوڵێ‌و خاوەنەکەی دەهەژێنێ‌و دنەی دەدا تا ئامانجەکانی بە بڵاوکردنـەوەو بانگـەواز بێنێتـە دی، کـەچی فەلسـەفە بڵاوکردنـەوەی نەکردۆتـە خـەم بـەڵکو رژدییەکیش توشی خاوەنەکانی دەکات‌و وایان لێ دەکات ئەو زانیاریانە هەر لە لای خۆیان گڵ دەنەوەو کەسی تر لێی بەهرەمەند نەبێ.

٤- نەشـم و شـێواز[١٨]:

ئەو شێوازەی بیروباوەڕی ئیسـلامیی پـێ داڕێـژراوە، شـێوازێکی تایبەتیـەو، بەوە جیا دەکرێتەوە کە زندوەو رەزمی هەیە، هەورەها تێسرەوانێکی راستەوخۆو فروسمانی هەیە، فروسمانی ئەو هەقیقەتە گەورانەی کە دەستەواژە توانای نیە لـە خۆی بگرێ بەڵام دەتوانێ بیانفروسمێنێ.

هەروەها بـەوە جیـا دەکرێتـەوە کـە بەتەنـها هـزری مـرۆڤ نادوێنـێ، بـەڵکو لەگەڵ هەمو کەنارو وزەو دەروازەکانی ناسینی کەینونەی مرۆڤ دەدوێ.

بەڵام فەلسەفە نەشم‌و شێوازێکی دی دەگرێتە بەر، تەقـەڵا دەدات هەقیقـەت لە دەستەواژە کۆکاتەوە، جا کاتێك دوچاری هەقیقەتێك دەبێ ناکرێ بخرێتـە نێـو چوارچێوەی دەسـتەواژەوە –ئەمـە بـێ لـەوەی ئـەو هەقیقەتانـە چەندین لایـەنی بنچینەییان هەیە زۆر گەورەترو فرەوانترن لەو هەمبێزەی هـزری مـرۆڤ دەیـبڕێ– ئەوا چاری ناچار فەلسەفەکە توشی ئاڵۆزکـاویی‌و تێکـەڵ‌و پێکـەڵی‌و وشـکی دەبـێ ... ئالێرەدا نابێ بیروباوەڕی ئیسلامی بـە نەشـم‌و شـێوازی فەلسـەفی دەربـبڕدرێ، چونکە دەیمرێنێ‌و پرشنگ‌و فروسمانەکەی خامۆش دەکات، جگە لەمـە لەیـەك لـە کەنارەکانی کەینونەی مرۆڤی دەئاخنێ‌و پەنگی پێ دەخواتەوە.

لـێرەوە هـەمو ئاڵۆزکـاوی‌و شکسـتی‌و کەمایەسـی‌و لاڕێ بونـەکانی ئـەو توێژینەوانە دەردەکەوێ کەویستویانە بیروبـاوەڕی ئیسـلامی بـەو نەشـم‌و شـێوازە غەوارەو نامۆیە رانوێنن‌و، بیئاخننە نێو ئەو دو توێیە روبەر تەسـکەی کـە ناتوانـێ ماف خۆی بداتێ. رێوشوێنی قورئانی پیرۆز بۆ رونکردنەوەی بیروباوەڕی ئیسـلامی بـەوە ناسـراوە زۆر سـادەو سـاناو رۆشـنە، ئەمـەش وای کـردوە خـەڵك بـە هـەمو

---

[١٨] بگەڕێوە سەر خصائص التصور الإسلامي سيد قطب /ل١٦.

ئاستێکەوە هەرچەندە ژیری‌و درك پێ کردنیان جیاواز بێ، بە ئاسانی لێی تێبگەن. هەر یەکەو بە ئەندازەی توانای بیر کردنەوەو بۆ رەخسانی لێی بەهرەمەند بێ. بە پێچەوانەی ئەو نەشم‌و شێوازە فەلسەفی‌و کەلامییە ئالۆزکاوانەی پڕن لە زاراوەی قورس‌و گرانی ئەو تۆ مەگەر کەسانێکی کەم لێی تێبگەن.

٥- رێگەی بەلگەخوازی:

لەو لایەنەشەوە قورئان لەگەڵ فەلسەفەو کەلامناسیدا جیاوازی هەیە، دەتوانین ئەم جیاوازیانە لە چەند خاڵێکدا رون بکەینەوە:

أ- قورئان‌و فەلسەفەزان‌و کەلامناسەکانیش بۆ سەلماندنی تاکێتی خودا بەلگەیان بە گەردون هێناوەتەوە. بەڵام رێگەی قورئان لەگەڵ رێگەکانی فەلسەفەو کەلامناسی زۆر جیاوازی هەیە.

قورئان بە هەمان ئەو نیشانانە بەلگەی هێناوەتەوە ئەگەر بزاندرێن ئەوا پێویست دەکا بشزاندرێ خاوەن‌و دروستکارێکی هەیە، وەکو زانینی تیشکی خۆر کە پێویست دەکات خۆر (رۆژ)ی پێ بناسرێ، بێئەوەی ئاتاج بەو هەمو پێوەرانە بکات کە کەلامناسەکان وەکو بەلگە پێهێنانەوە بۆ پەیدا بونی جیهان دایانرشتوە. چونکە لە رێختەوە دەزاندرێ ئەم هەمو بونەوەرە، ئەفرێندراوەو مشوری بۆ خوراوە.. ئەوە پێویست بە هێنانەوەی بەلگەو سەلماندن ناکات. مرۆڤ لە رێختی خۆیەوە دەزانێ ئەو گەردونە ئاتاجی ئافەریدگارێکەو دەبێ خودایەك هەبێ مشوری بخوات‌و بەڕێوەی ببات. هیچ پێویست بەوە ناکات بێین بسەلمێنین، ئەم بونەوەرە پەیدا بوەو یەکێکیش دەبێ هەبێ پەیدای کردبێ.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلاَ يُؤْمِنُونَ ۞ وَجَعَلْنَا فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلاً لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ۞ وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ ۞ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ۞ ﴾ سورەتی ئەنبیاء/٣٠-٣٣، واتە: ئایا ئەوانەی وا بێبڕوا بون، نەیان دی ئاسمانەکان‌و زەوی پێکەوە لکابون ئێمە لە

یەکترمان جیا کردنەوە؟ و هەمو شتێکی زندومان لە ناو گرواند، جا ئایا ئێستا بڕوا ناهێنن (٣٠) لەم زەویـەدا گـەلێ کێـوی مەحکـەمو پتـەومان دانـا تـا بـەوان ئۆقـرە بگرێو نەلەرزێو، لەم زەویەدا دۆڵو دەرەو ڕێگا گەلێکمان سازدا تـا ڕێنوێنـی بـن (٣١) ئاسمانمان کـردە مێچێکـی پـارێزەرو پتـەو، بـەڵام ئـەوان ڕوسـێنەر بـون لـە نیشانەکانی ئێمە (٣٢) خودا شەو ڕۆژو خۆرو مـانگی ئـەفراندوەو هەریەکـەیان لـە خولگەیەك دەخولێنەوە(٣٣).

ب- ئـەو بەڵگـە ئاوەزیانـەی١٩ قورئـانی پـیرۆز خواستویەتی لـە گـەورەیی‌و هەیبـەتی خـودا دەوەشـێنەوە، قورئـان پێـوەری هـەموگرو پێـوەری پێچواندنـی نەهێناوەتەوە کە ئافەریدگار دێنێتە ڕێزی ئافەریدان.

بـەڵکو پێـوەری ئـەو یەکەمینـەی بـەکار هێنـاوە کـە هـەمو تەواوییـەك بـۆ ئافەریدگار دەسەلمێنێ‌و بە هیچ جۆرێـك کەمایەسـی ئافـەریدان بـۆ خـودا دانانـێ. ئافەریدگار شایەنترە بە تەواومەندێتی وەسف بکرێ نەك ئافـەریدە، چونکـە خـودا ئەو هەمو تەواوییـەی بـە ئافـەریدان بەخشـیوە، چونکـە ئەگـەر ئافـەریدگار هـەمو سیفەتێکی تەواوی بۆ نەسەلمێندرێ دەبێ ئەگەر هـەبێ یـەکێکی دی لـەو تـەواوتر بێ‌و کەمایەسـی نـەبێ، ئـەوەش مەحاڵـە. خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى﴾ سورەتی نەحل/٦٠ وێنەی هەرە بەرز بۆ خودا دەهێنرێتەوە.

هـەر کەمایەسیەك ئافـەریدە لێـی بێبـەش بـێ، ئافـەریدگار شـایەنترە لێـی بێبەشتر بێ.

ج- تێبینی ئـەوەش دەکرێ قورئـان بـەڕەوانترین‌و پوختـترین دەسـتەواژە، بەڵگە ئاوەزیەکان دەهێنێتەوەو دەبێتە مایەی سەلماندنی هەقەکە. کەچی زۆربەی بەڵگە ئاوەزیەکانی فەلەسەفەو کەلامناسی شایەنی بەڵگە پێهێنانـەوە نـین‌و لەبـەر لاوازییان جۆرەها گومان‌و دودڵی‌و سەرگەردانییان لێ دەپشکوێتەوە.

---

[19] زۆر لە کەلامناس و فەلسەفەزانەکان بە هەڵە وا تێگەییون بەڵگەکانی قورئان و سوننەت تەنها لە ڕێی هەواڵ پێدانەوەیە، ڕێی نەبردۆتە بەر بەڵگە ئاوەزیەکان. ڕاستیەکەشی ئەوەیە قورئان هەندێ بەڵگەی ئاوەزی وای لە بارەی خودلو تاکێتیەکەی هێناوەتەوە کە هیچ کامێك لەوان ناتوانن بەو جۆرە باسی لێوە بکەن. ئـەو شتانەی کەلامناسـەکان لـە ئاخیری کـرد و کۆشەکانیان پێی دەگەن: قورئانی پیرۆز پوختەی ئەوانەی زۆر بە جوانی ڕانواندوە وەکو ئـەو وێنـەو نمونانـەی لـە قورئـاندا فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَذَا الْقُرْآنِ لِلنَّاسِ مِنْ كُلِّ مَثَلٍ﴾ سورەتی کەهف/٥٤، وێنەو نمونەکانیش واتە (بەڵگەی ئاوەزی).

بەڵکو دەبێتە مایەی رەت کردنەوەی هەقەکەش، بابای دژمەند بە ئاسانی دەتوانێ بەڵگەکان بسوێنێ، جا لەگەڵ رەتکردنەوەی بەڵگەکە هەقەکەش رەتدەکاتەوە کە بۆ خۆی زۆر بەهێزە، ئەوەش لەبەر ئەو لاوازیەی بەڵگەکە هەیەتیو دەیەوێ هەقەکەی پێ بسەلمێنێ.

بۆیە کەلامناسەکان لە هەمو خەڵك زیاتر قسەی خۆیان دەگۆڕنو لە زۆر جێیان قسەکانی خۆیان پوچ دەکەنەوە، بەڵکو زۆر جاران هەندێ قسە بە کوفر دادەنێن کەچی لە هەندێ شوێندا خۆشیان وایان گوتوە. بە پێچەوانەی بەڵگەکانی قورئانو سوننەت کە خاوەنەکانیان سەقامیان لەسەر دەگرنو لێیان ناکەونە دودڵیو منجەمنجەوە[٢٠].

د- دیسان تێبینی دەکەین هەندێ بەڵگە هەن کەلامناسەکان دەیانهێننەوە، وا دەکات دان بە ناهەقان دابنرێ، دەبێتە مایەی رەتکردنەوەی هەندێ هەقی سەلمێنراوی قورئانو سوننەت.

ئەو دەقانەیان رەتکردۆتەوە کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی خودا لە ئاسمانێ دایە، گوایا خودا نابێ لە هیچ جیهەتێکەوە بێ چونکە لە جیهەتدا بونی خوا بە تەحەییوز هەژمار دەکرێ. کەچی دەقەکان بە راشکاوی رایدەگەیەنن خودا لە ئاسمانێ دایە. هەڵەکەیان لەوە دایە ئەگەر بڵێن لە ئاسمانێ دایە، واتای ئەوە بگەیەنێ ئاسمان لە خۆی گرتوە، هەروەها لەوەش هەڵەیان کردوە پێوەرە بەشەریەکانیان بەسەر زاتی خودا پیادە کردوە.

٦- پێبەخشین:

جیاوازیەکی دیکە ئەوەیە قورئانی پیرۆز بروایەکی تێرو تەسەڵ دەبەخشێ، هەروەکو جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا دەڵێ: (یەکەمجار فێری بڕوا بوین پاشان فێری قورئان بوین ئینجا بڕوامان پتر بو).

قورئان وا وەسفی پەروەردگارمان بۆ دەکات کە رو و دەستو بیستنو بینینی هەیە، ناوو سیفەتە جوانەکانیمان بۆ هەژمار دەکاتو پێمان دەڵێ: خودا (الرحمن الرحيم، الملك القدوس السلام المؤمن المهيمن العزيز الجبّار... تاد)، هەروەها کردەو ئەفرێنراوەکانیمان پێ دەناسێنێ، باسی رۆژی ژیانەوەو بەهەشتو دۆزەخمان بۆ دەکات وەك بە بینایی خۆمان ببینین.

---

[٢٠] مجموع الفتاوى إبن تيمية /٤/٥٠.

بەڵام ڕێبازی کەلامناسەکان ئەوپەڕی مەبەستیان هەر بروایەکی سەرپاکیەو نەزانیاریەکی پڕ بە پڕ دەبەخشێ نە تێڕوانینێکی ڕۆشن.

## ژوان نیە:

ئاین‌و فەلسەفە، ژوانیان نیە، چونکە دو ڕێوشوێنی لە یەك جودان: لە سەرەتاو دەست پێکردن‌و کۆتایی‌و تەواو بون، لە ڕێبازو نەشم شێواز، لە کارتێکردن‌و پێبەخشین لە پێش ئەوانە هەر هەموی، لە ژێدەرو کانگادا، تەواو تەواو لە یەکتر جودان.

ئیسلام ئاتاجی بە کەس نیە بیروباوەڕو شەریعەتەکەی بۆ تەواو بکات. چونکە خودای زاناو لێزان تەواوی کردوە: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي﴾ سورەتی مائیدە/٣، واتە: ئەوڕۆ دینی ئێوەم تەواو کردو بەخششی خۆمم بە تەواوی پێ بەخشین. پێویستمان بەوە نیە لە نێوان ئاینی ڕاست‌و فەلسەفەدا یان لەگەڵ ئاینی جولەکەو دیاناندا، یان لەنێوان ئاین‌و کۆمۆنیزم‌و سۆسیالیستیدا گونجانێك دروست بکەین چونکە دینی ئیسلام هەقەو ناهەقی تێدا نیە: ﴿لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ﴾ سورەتی فوصیلەت/٤٢، بێ لە ئیسلامیش یان ناهەقەو یان هەق‌و ناهەقی ئاوێتە کردوە، ئیسلام بۆ ئەوە نەهاتوە هزری مرۆڤ تەحەککومی پێ بکات، بەڵکو بۆ ئەوە هاتوە لەسەر ژیان دەست ڕۆیشتو بێت‌و بیروباوەڕو بیرۆکەی لارو وێر ڕاست بکاتەوە.

لەسەرمان پێویستە هەروەکو خودا دەیەوێت بیروباوەڕو شەریعەتەکەمان بە جیاوازو پاك‌و سازگاری بپارێزین: ﴿قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٦، واتە: ڕێی ڕاست‌و ڕێی گومرایی هاوێر بون‌و هەردوکیان ڕۆشن بونەوە. ئەگەر ئێمە ئیسلاممان بە ڕێوشوێنی تر ئاوێتە کرد، ئەوا خودا وەکو نامەوەرەکان سەرکۆنەمان دەکات ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ﴾ سورەتی ئالی عیمران/٧١، واتە: ئەی نامەوەران بۆچی هەق‌و ناهەق تێکەڵ دەکەن.

## هەڵوێستی زانایان لەئاست کەلامناسیدا

لەبەر ئەوەیە زانایان داکۆکیان لەوە کردوە نابێ بیروباوەڕ تێکەڵ بە فەلسەفە بکرێ. ئەو تێکەڵیەی پیتۆڵەکانی ئیسلام پەیدایان کردوە وەکو ئیبن سینا. هەروەها زاناکان دژایەتی ئەوانەشیان کردوە کە بەو فەلسەفانە کارتێکراو بوینە کە بە کەلامناسی ناوی دەرکردوە.

زانا بلیمەتە ناودارەکان دوبەش بون: بەشێکیان هەر لەسەرەتادا هەستیان بە ترسناکی ئەو رێوشوێنە کردو دژایەتی ئەو رەوتەیان کرد وەکو پێشەوا ئەحمەد –بەرمیهری خودا بێ–، هەروەها پێشەوا شافیعیش دەڵێ: (حوکمی من بۆ کەلامناسان ئەوەیە بە قامچیو پێڵاوان لێیان بدرێ،بەسەر هەمو تیرەو هۆزەکانیش بیانگێڕن‌و پێیان بڵێن: ئەوەیە سزای ئەوانەی قورئان‌و سوننەتیان جێهێشتوەو رویان کردۆتە کەلامناسی).

بەشەکەی تریشیان خۆیان وەکو کەلامناسەکان سەرگەرم‌و خەریك کردو رێیان لەبەردا تەسك بۆوەو خوری تەمەنیان هێدی هێدی بەرەو ئاوابون هەڵدەنیشت.. پاش ئەو هەمو جەنجاڵیە پەنجەی پەشێمانیان دەگەستو تازەش کار لە کار ترازاوەو هەر ئەوەندەیان بۆ ماوەتەوە خەفەت وئاخان هەڵکێشن‌و لە خوا بپاڕێنەوە لەو رابردوەیان خۆش ببێ، ئاگاداری ئەوانەشیان کردۆتەوە ئەو رێوشوێنە لارو وێرەی ئەوان نەگرن‌و خۆیان بەو شڕو پەشێویە خەریك نەکەن.

یەکێك لەوانە ئەبا عەبدوڵلا: محمدی کوڕی عومەری رازیە کە لە پەڕتوکی (أقسام اللذات)دا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| نهاية أقدام العقول عقال | وغاية سعي العالمين ضلال |
| وأرواحنا في وحشة من جسومنا | وحاصل دنيانا أذىً وبال |
| ولم نستفد من بحثنا طول عمرنا | سوى أن جمعنا فيه قيل وقالوا |
| فكم قد رأينا من رجال دولة | فبادوا جميعاً مسرعين وزالوا |
| وكم من جبال قد علا شرفاتها | رجال فزالوا والجبال جبال |

واتە: هزر هەرچەندی بڕ کات کۆتایەکەی هەر کۆت بونەو سەرەنجامی کردو کۆششی جیهانیانیش لە فەلسەفەدا گومڕا بونە. روحەکانمان نامۆی جەستەکانمانن دەرەنجامی دنیاشمان ئازارو ئازوبازە. بە درێژایی تەمەنمان چ سودێکمان لە گۆڕانی نەریت دیوە؟، جگە لە کۆکردنەوەی گۆتە گۆتان. چەندمان

پیاوانی بە دەسەڵات دیتن هەر هەمویان خێرا خێرا لەناو چونو نەمان. چەندیشمان شاخ دیتن پیاوانێك بەسەر ترۆپکیان هەڵگەڕان، مردنو شاخەکانیش هەر شاخن.

پاشان دەڵێ: (ماوەیەکی گەلێ دورو درێژ خەریکی ڕێبازی کەلامناسیو ڕێوشوێنی فەلسەفی بومو لێیان رامام، بەڵام تێگەیشتم نە نەخۆشی پێ چاك دەبێتەوە، نە دڵ ئاوی پێ دەخواتەوە). پاشان گەڕاوە سەر ڕێبازی قورئانو وێنەیەکی لە ڕێوشوێنی قورئان لە بارەی سیفەتەکانی خودا هێناوەتەوە دەڵێ: (تێگەیشتم ڕێبازی قورئان نزیکترین ڕێگەیە) لەبارەی سەلماندنەوە دەفەرموێ ﴿ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ﴾ سورەتی طاها/٥، واتە: خوای میهرەبان بەرز بۆوە سەر عەرشی خۆی. ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ ﴾ سورەتی فاطر/١٠، واتە: وتەی چاك بۆ لای ئەو بەرز دەبێتەوە.

لەبارەی نەسەلماندنیشەوە دەفەرموێ: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ﴾ سورەتی شوری/١١ واتە: هیچ شتێك وەکو وی نیە. ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا ﴾ سورەتی طاها/١١٠ واتە: زانیاریان بەویداناشکێ. پاشان دەڵێ: ( هەرکەسێ هەمان ئەزمونی من بئەزموێ، دەگاتە هەمان ئەو قسانەی من).

(شەهرستانی)ش هەمان ژێ دەژەنێ و، دانی پێدا دەنێ کە لەلای فەلسەفەزانو کەلامناسەکاندا دوای ئەو هەمو توێژینەوەو سۆراغ کردنە، جگە لە هۆت بون و پەشێمانی هیچی بۆ نەماوەتەوە دەڵێ:

لعمري لقد طفت المعاهد كلها ... وسيرت طرفي بين تلك المعالم
فلم أر إلا واضعاً كف حائر ... على ذقن أو قارعا سن نادم

واتە: سوێند دەخۆم هەرچی قوتابخانەی فەلسەفی هەبو گەڕامو چاوم بە هەمو دیمەنو ئەدگارەکانی دا گێڕا، تەنها کەسانێکم دیت لە سەرگەردانیو داماویان دەستیان لەسەر چەناگەیان دانابوو ئەنگوستی پەشێمانیان دەگەست.

(جوەینی) یەکێك بوە لە فرەزانەکانی کەلامناسی، چەندین ساڵ خۆی پێوە خەریك کردوە، ئەوانە وریا دەکاتەوە کە خۆیان بەو زانستە خەریك کردوە: (هاوڕێیانم! خۆتان بە کەلامناسی خەریك مەکەن، بڕوا بکەن ئەگەر دەمزانی ئەو

کەلامناسیە ئاوام لێ دەکات قەت خۆم پێوە خەریك نەدەکرد) لەسەرەمەگیشدا بە ئەفسوسەوە دەڵێ: خۆم لە نێو دەریایەکی قوڵ نغرۆ کرد، وازم لە ئەهلی ئیسلامو زانستەکانیان هێنا، بەو شتانە خەریك بوم کە بەرهەڵستیان لێ دەکردم. ئێستاکەش ئەگەر خودا نەمخاتە بەر میهری خۆیو بەزەیی پێمدا نێتەوە، هەشم بەسەر، دوای ئەو هەمو نەگبەتیە لەسەر بیروباوەڕی دایکم دەمرم، یان گوتویەتی: (لەسەر بیروباوەڕی پیرەژنان دەمرم).

ئەبا حامید غەزالیش -بەرمیهری خوابێ- لەو کەسانە بوە درێژەی بە توێژینەوەو سۆراغکردنو لێکۆڵینەوەکان داوەو چەندین ئێرەو ئەوێی کردوە. تا لە پایانی تەمەنیدا هەر بەوەندە گەیشت توشی دامانو پەشۆکاویەکی زۆر ببو، پەڕتوکێکی دانا بە ناوی (إلجام العوام عن علم الكلام)، واتە: جڵەو کردنی رەمەکیان لە زانستی کەلامی. تەنانەت خۆ پێ خەریك کردنیشی بە حەرام داناوە مەگەر لە چەند حاڵەتێکی تایبەتیداو دەڵێ: (ئەوەی راستی بێ کەلامناسی تەنها بۆ دو جۆرە کەس حەرام نیە).

لە کۆتایی تەمەنیدا وازی لە کەلامناسیو رێبازە کەلامیەکان هێناو روی کردەوە فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺو کە مرد صەحیحی بوخاری لەسەر سینگ بو. ئەبالحەسەنی ئەشعەری چل ساڵان بە موعتەزیلەیی مایەوە پاشان لێی پەشێمان بۆوەو بە گومڕای داناو زۆر بە توندیش بەرپەرچی دانەوە.

کۆمەڵێکیش لە دوای وان پەیدا بونو لەسەر رێوشوێنی راستەقینە رۆیشتن هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا کەلامناسیو فەلسەفەشیان زانیوەو بەرێوشوێنی قورئانی دژایەتی ئەو جۆرە عیلمەیان کردوەو بەچەکی قورئان ناتەواویو لاوازیو پوکەڵێتیان دەرخستوە، رێبەرو پێشەنگی ئەو کۆمەڵەش ئیبنی تەیمیەیە -بەرمیهری خوا بێ-.

*** *** ***

# دوا وتەم :

بەر لەوەی قسەکانم تەواو بکەم دەڵێم: ئێمە ئاتاجی کەسانێکین پیاوی بیروباوەڕ بن نەك پیاوی فەلسەفە، ئێمە کەسانێکمان گەرەکە دەردو کلۆڵیەکانی ئەم نەتەوەیە چارەسەر بکات، ئەوەش بە فەلسەفەزانان ناکرێ.

مامۆستا ئەحمەد ئەمین –بەرمیهری خودا بێ– بەراوردێکی لە نێوان خاوەن رەئیو خاوەن بیروباوەڕ کردوەو ئاسەواری هەر یەکەیانی لە ژیاندا خستۆتە رو و دەڵێ:

زۆر جیاوازی لە نێوان ئەوەدا هەیە تۆ رایەکت هەبێ یان بیروباوەڕت پێی هەبێ:

ئەگەر رایەکت هەبو ئەوا دەیخەیە خانەی زانیاریەکانت، بەلام ئەگەر بیروباوەڕت پێی هەبو ئەوا لەگەل خوێنت تێکەڵ دەبێو دەچێتە ناو مۆخی ئێسقانو پەل دەهاوێتە نێو قولاییەکانی دڵت.

خاوەن رای فەلسەفەزان دەڵێ: ئەوەی من بەڕاستی دەزانم رەنگە لە واقیعدا ناڕاست بێ، چونکە ئەوەی من دەیلێم ئەوڕۆکە بەلگەی هەیە، رەنگە بەیانی بەلگەی لە دژ بێ. رەنگە لەو رایەمدا راستم پێکابێ رەنگە هەتەرم کردبێ.

بەلام بیروباوەڕمەند سەقامگیرەو هیچ گومانو دودڵی نیە، ئەوڕۆکە راستەو سبەینێش هەر راستە، لەوە دەرچوە ببێتە بواری بەلگانو لەوە بەرزترە گومانو دودڵی بیڕوشێنێ.

خاوەن رەئی سستو ساردە، ئەگەر رایەکەی هاتە دی ئەوا بزەیەکی نەرمو کاڵی دێتە سەر لێوانو، ئەگەر نەشهاتە دی ئەوا پێی ئاساییە، چونکە پێشتر ئەوەی داناوە کە رایەکەی شێمانەی هەڵەو راستی هەبێ، بەلام خاوەن بیروباوەڕ بە جۆشو خرۆشە، تا بیروباوەڕەکەی نەیەتەدی ناسرەوێ.

خاوەن رەئی بە ئاسانی لەبەر بەلگەیەك یان لەبەر بەرژەوەندیەك بە ئاسانی رای خۆی دەگۆڕێو رایەکی تر بنیات دەنێ. بەلام خاوەن بیروباوەڕ سەقامێکی نایابی هەیەو باشترین وەسف ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: «ئەگەر رۆژم لە دەستی راستو مانگیشم لە دەستی چەپ دانێن تا واز لەوە بێنم، وازی لێناهێنم».

"را" تەرمێکی خامۆشەو تا بیروباوەڕی بەبەردا نەکرێ ژیانی تێدا نابێ. "را" ئەشکەوتێکی تاریكو تونە کە تا بە تیشکی بیروباوەڕ روناك دەبێتەوە. "را"

زەڵکاوێکی مەنگەو پێشکەو مێشولە گەرای تێ دادەنێن، بەڵام بیروباوەڕ دەریایەکی خرۆشاوەو ڕێگا بە مێش و مەگەزان نادات لەسەر ڕویدا زاوزێ بکەن.

"ڕا" چرە دوکەڵەو بیروباوەڕ ئەستێرەیەکی بریسکەدارو بە ورشەیە.

"ڕا" تەنگژەو ئەستەمو ڕێبەستان دێنێتە پێشەوەو ئەژنەوای خواستەکانی جەستەیە، گومان و دڕدۆنگی هەڵدەداتەوەو ئەرێ و نەرێیان هەڵدەنێ، بەڵام بیروباوەڕ ترسناکیەکان دەسمێنێ و شاخەکان دەلەخشێنێ و ڕوی ڕۆژگارو ڕەوتی مێژو دەگۆڕێ، گومان و دودڵی تەفروتونا دەکات و سەقامو ئاوەر دەبەخشێ و تەنها بۆ خواستەکانی ڕوح ئەژنەواو گەردەن کەچە[21].

*** *** ***

[21] پەرتوکی (فیض الخاطر)ي أحمد أمين، لە پەرتوکی (الإيمان والحياة)ي قرضاوي /ل٢٢ وەرگیراوە.

# ڕێـوشوێـــنـی زانایان بۆ سەلـــماندنی بـیـروباوەڕ [٢٢]

ئایا بڕوا بە ئەشکەنجەی گۆڕ بێنین؟ ئایا بڕوا بە کانیاوی کەوسەرو تـەرازوی ڕۆژی دوایی‌و جۆرەها شتی دیکەی بیروباوەڕ بێنین؟

١- زانایانی پێشین پێیان وایە هەمو ئەو شتانەی خوداو پێغەمبەر ﷺ پێیان ڕاگەیاندوین‌و بە زنجیرەیەکی تەواوو بێ خەوش پێمان بگات ئەوا لەسەرمان واجبە بڕوایـان پـێ بێنـین‌و بەڕاسـتیان بزانـین. جیـاوازیش ناخەنـە گـوزارەی متواتـیر[٢٣] و گوزارەی (خەبەری) ئاحاد ئەگەر صەحیح بێ، بەڵکو بە هەردو جۆریـان بیروبـاوەڕ دەسەلمێنن.

بـۆ ڕاسـتی بۆچونەکەشـیان بەڵگـە گشـتیەکان دەهێننـەوە فـــەرمانمان پـــێ دەکەن هــەرچی خــوداو پێغەمبــەر ﷺ گوزارەمــان پــێ دەدەن بەڕاسـتیان بزانـین‌و هەرچی ئەوان فەرمانمان پێ دەکەن بەرفەرمان بین، وەکو خودا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ سورەتی ئەحزاب/٣٦ واتە: هیچ بڕواداریێکـی ژن‌و پیـاو بۆیـان نیـە لـەو فەرمانانەی خوداو پێغەمبەر دەیدەن، لـە کـردن‌و نـەکردنیدا سەرپشـك بـن بـەڵکو لەسەریانەو دەبێ بیکەن.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ ﴾ سـورەتی ئـالی عیمـران/٣٢ واتە: فەرمانبەری خوداو پێغەمبەر بن.

٢- بەڵام کۆمەڵێك هــەن شـارەزاییان بـە فـەرمودەکانی پێغەمبـەر ﷺ نیـەو تەواو و لاوەزەکانیان ناناسن‌و ناتوانن هاوێریان بکەن لەبەر ئەوە پـەنایان بردۆتـە

---

[٢٢] تەماشای (أصل الإعتقاد)ەکەم بکە، لەوێدا لەو بارەوە زۆرترم لێکۆڵیوەتەوە.

[٢٣] فەرمودەی موتەواتیر: ئەوانەن کە ئاپۆرەیەکی زۆر گێڕاویانەو بـە پـێی بـاو ونەریت نـاکرێ لەسـەر درۆ کۆببنـەوە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی زنجیرەکەی هەر بەم جۆرە بێ. فەرمودەی ئاحادیش ژمارەی بگێڕەوەکانی لە موتەواتیر کەمترە.

بەر فەرمودە هەڵبەستراوو لاوازەکان[٢٤] و دەیکەنە بیانوو بەڵگەی بیروباوەڕیان. بۆ نمونە ئەو فەرمودانە:

- فەرمودەی: ((**إنتهيت الى ربي ليلة أسري بي الى السماء فرأيت ربي، بيني وبينه حجاب بارز، فرأيت كل شيء منه، حتى رأيت تاجاً مخصوصا من اللؤلؤ**))[٢٥] فەرمودەیەکی هەڵبەستراوە. واتە: لە شەوڕۆیەکەمدا بەرەو ئاسمانێ بەرزەوە کرام. گەیشتمە لای پەروەردگارمو بینیم، پەردەیەکی دیار لەنێوانماندا هەبو، هەمو شتێکم تێدا دیت، تەنانەت تاجێکی پەڕەدارم دیت لە مرواری پێك هاتبو.

- فەرمودەی: ((**إن الله يجلس على القنطرة الوسطى بين الجنة والنار**))[٢٦] فەرمودەیەکی لاوازە. واتە: خودا لەسەر بوارگەی نێوان بەهەشتو دۆزەخدا دادەنیشێت.

هەڵبەت لەسەرمان پێویستە بەر لەوەی فەرمودەکان بە بەڵگەو بیانو بهێنینەوە لێیان بکۆڵینەوەو بزانین داخۆ تەواون یا لاوازو هەڵبەستراون.. جا لە بواری بیروباوەڕ بێ یان شەریعەت، دەنا لە ئاکامدا شتی وا دەخەینە نێو ئاینی خودا هەرگیز سەروساختی لەگەڵدا نەبێ، یان لەسەر بیروباوەڕی وا بڕیار دەدەین پوچو بەتاڵ بێ.

٣- کۆمەڵی سێیەم، بەڵگە نەقلییەکان -کە دەقەکانی قورئانو سوننەتە- ڕەت دەکەنەوەو نایانکەن بە بیانوی سەلماندنی بیروباوەڕیان. پێیان وایە (بەڵگە نەقلییەکان ئاوەر دروست ناکەنو نابنە مایەی وەدەستهێنانی بڕوای خوازراو و سەلماندنی بیروباوەڕ)[٢٧]، پاساوی ئەو قسەیەشیان بەوە دەدەنەوە گوایە بەڵگە نەقلییەکان بواری ئەگەرو شێمانەیەکی زۆری تێدایە لە سەلماندنو نەسەلماندندا)[٢٨]. بێگومان ئەو قسەیە قسەیەکی کرچو پوچو گەندەڵەو پێویست بەماندو بون ناکات تا بەرپەرچی بدرێتەوە، دیارە پێچەوانەی یەکدەنگی نەتەوەی

---

[٢٤] هەڵبەستراو: ئەو فەرمودانەن بە درۆ بە دەم پێغەمبەر ﷺ هەڵبەستراون و لە زنجیرەکەیدا درۆزنێك هەیە، لاوازیش: ئەو فەرمودانەن مەرجەکانی تەواوێتیان لێ نایەتە دی.

[٢٥] الفوائد المجموعة من الأحاديث الموضوعة للشوكاني/ل٤٤١.

[٢٦] هەمان سەرچاوە /ل٤٤٨.

[٢٧] الإسلام عقيدة و شريعة لشلتوت/٥٣.

[٢٨] هەمان سەرچاوە.

ئیسلامە. جا ئەگەر دەقی قورئان و سوننەت، بواریکی فرەوانی ئەگەرو شیمانەی تیدابێ ئاخۆ قسەی مرۆڤ چۆن بێ؟!.. چۆن دەبێ بیروباوەڕ بە وتەی خوداو پێغەمبەر نەسەلمێ؟!... ئای بوختانێکی گەورەیە.. پاکی بۆ تۆ خودایە.

٤- کۆمەڵی چوارەم فەرمودە ئاحادە تەواوەکان بۆ سەلماندنی بیروباوەڕ ڕەت دەکەنەوەو بە بەڵگەی وەرناگرن، تەنها بەڵگە بە قورئانو فەرمودە موتەواتیرەکان دەهێننەوەو تەنها بەو ئایەتو فەرمودە موتەواتیرانە بیروباوەڕ دەسەلمێنن کە دەلالەتێکی قەطعی[٢٩] دەدەنو، ئەگەر ئەو دەقانەی ثبوتی قەطعینەو دەلالەتێکی قەطعی نادەن ئەوا بەڵگەی پێ ناهێننەوە.

کەلامناسەکان لەمێژە ئەو قسەیە دەکەنو، هەندێ لە زانایانی ئوصولیش چاویان لێ کردون، ئەو جۆرە قسانە تا ئەوڕۆکەشی تێدا بێ بەربڵاوەو خەریکە قسە ڕاستەکە لە بیر بکرێو بەنامۆ بێتە بەرچاو. بەڵام زانایانی پێشانو ئێستاش گەندەڵیو ترسناکی ئەو جۆرە قسانە ڕۆشن دەکەنەوەو تەمتومانی گومانەکانیان دەڕەوێننەوە.

## ڕونکردنەوەی گومانی ئەو جۆرە کەسانە[٣٠]:

ئەو جۆرە کەسانەی دەڵێن بەڵگەکانی بیروباوەڕ مەرجە ئاوەر ببەخشنو ، فەرمودە ئاحادەکانو دەقە قورئانیو فەمودە موتەواتیرەکانیش ئەگەر دەلالەتەکانیان قەطعی نەبێ ئاوەر نابەخشن بەڵکو دەبنە گومان. گومانیش بەڵگەی پێ ناهێندرێتەوە لەبەر ئەوەی خودا دەفەرموێ: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ﴾ سورەتی نەجم/٢٣، واتە: هاوبەشپەرستەکان تەنها شوێن گومانو ئارەزوەکانی نەفسیان کەوتون. ﴿وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ سورەتی

---

[٢٩] مەبەستیان لە ثبوتی و قەطعی: قورئان و سوننەتە موتەواتیرەکانە. مەبەستیان لە دەلالەتی قەطعی: ئەو دەقانەیە کە واتایەکی دی هەڵناگرن و ، ئەگەری تەئویل کردنیان نیە، بەو پێودانگە ئەو دەقانەیان ڕەت کردۆتەوە کە باسی ئەوەیان کردوە بڕواداران لە ڕۆژی ژیانەوەدا خودا دەبینن. فەرمودەکانیش ئەگەر چی دەلالەتەکانیشیان قەطعین، بەڵام دەڵێن ئاحادن لە بارەی دەقە قورئانیەکانیش دەڵێن: دەلالەتی قەطعی نادەن و تەئویلیان کردوەو واتایەکی دیکەیان بۆ گونجاندوە (تەماشای پەرتوکی "الإسلام: عقيدة وشريعة" ی شێخ شەلتوت بکە چۆن ئینکاری بینینی خوای کردوە/ ل٥٧).

[٣٠] بڕوانە پەرتوکی (الحديث حجة بنفسه) و پەرتوکی (وجوب الأخذ بأحاديث الآحاد في العقائد والأحكام)ی شێخ ناصر الدين الألباني و پەرتوکی من (أصل الإعتقاد).

نەجم/٢٨، واتە: گومانیش دادی هیچ شتێکی هەق نادات و نایسەلمێنێ. ئەمانەو لە زۆر ئایەتی دیکە خودا سەرکۆنەی هاوبەشپەرستەکان دەکات لەسەر ئەوەی شوێن گومانەکانیان دەکەون.

ئەو کەسانەی ئەو ئایەتانە دەکەنە بەڵگەی بۆچونەکانیان شتێکی رەتکراوەیەو لێیان وەرناگیرێ، چونکە ئەو گومانەی لە ئایەتەکاندا هاتوە هەمان ئەو گومانە نیە کە ئەوان مەبەستیانە. وە ئەو دەقانەی لە بابەتەکانی بیروباوەڕدا رەتیان کردۆتەوەو بەڵگە خوازی پێ ناکەن؛ گومانێکی بەرەو ئاوەری دەبەخشن و، ئەو گومانەی خودا فەرمویەتی: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ﴾ مەبەست لەو گومانەیە دودڵی دڕدۆنگی لێ دەبێتەوە. لە "النهایة" و "اللسان" و فەرهەنگی تریشدا هاتوە، (گومان: ئەو دو دڵیەیە کە بەرانگژی شتێکت پێ دەکاتەوەو دەیهێنیەدی و حوکمی پێ دەدەی) لە ئایەتەکاندا مەبەست لەو جۆرە گومانە دێ. بۆ پتر پاڵپشتی، لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ﴾ سورەتی ئەنعام/١١٦، لێرەدا تەنها ئەو گومانە دەگرێتەوە کە دڕدۆنگی و ئەرێ و نەریە. چونکە ئەگەر ئەو گومانەی خودا هاوبەشپەرستەکانی پێ وەسف کردوە هەمان ئەو گومانە زاڵە بێ کە بەرەو ئاوەرە ئەوا لە ئەحکامیش نابێ وەربگیرێن. چونکە خودا لەسەر ئەو گومانە بە رەهایی سەرزەنشتی هاوبەشپەرستەکانی کردوەو، تایبەتی نەکردوە بە بیروباوەڕو ئەحکامی لێ هاوێر کردبێ. پاشان خوای گەورە لە هەندێ ئایەتدا بە ئاشکاری رادەگەیێنێ ئەو گومانەی هاوبەشپەرستەکان گرفتاری بونە ئەحکامیش دەگرێتەوە. فەرمو گوێ بگرە: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا﴾ ئەمە بیروباوەڕە، ﴿وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ﴾ ئەمەش حوکمە، ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا بَأْسَنَا قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ﴾ سورەتی ئەنعام/١٤٨، واتە: هاوبەشپەرستان دەڵێن: ئەگەر خودا بیویستبایە نە ئێمە دەبوینە هاوبەشپەرست نە باوباپیرانمان، ئێمە هیچ شتێکمان حەرام نەدەکرد، کەسانێ بەر لەمانە بون هەروا پێغەمبەرانیان بە درۆ دەخستەوە تا سەرەنجام تامی سزاو ئەشکەنجەی ئێمەیان چەشت، بڵێ: ئایا بەڵگەیەکی زانستانەتان لا

هەیە تا دەری بخەن‌و بە ئێمەی بنوێنن؟ ئێوە تەنیا لە گومانی بێ بنەڕەت نەبێ پەیڕەوی ناکەن‌و، ئێوە بێجگە لە درۆ شتی ترتان بە زاردا نایێ.

پاشان ئێمە خۆ نادەینە دەست ئەو قسەی گوایە فەرمودە ئاحادەکان نابنە مایەی زانین بەڵکو دەبێتە مایەی گومان.

(صەدیق حەسەن خان) دەڵێ: (فەرمودە ئاحادەکان دوبەرەکیان لەسەرە ئاخۆ دەبێتە مایەی زانین یان گومان؟، لەسەر ئەوە کە پابەندە هۆکاری بەهێزکاری تێدایە یان نا. ئەگەر تێیدا بو یان (مەشهور) بو یان (موستەفیض) بو، ئەوا دوبەرەکی هەڵناگرێ‌و، بەربەرەکانێش لەسەر ئەوە نیە ئەگەر فەرمودەیەك یەك کەس گێڕابێتیەوەو کۆڕایی لەسەر بێ بۆ کارپێکردنی، ئەوا دەبێتە مایەی زانین. چونکە کۆڕابون راستیەکەی سەلماندوە، هەر بەم جۆرەش فەرمودەی تاکە کەسی ئەگەر نەتەوە قبوڵی کرد، جا هەیانە کاری پێکردوەو هەیانە واتاوێری کردوە، فەرمودەی هەردو صەحیحەکانی بوخاری‌و موسلیمیش لەم بابەتەن).

(سەفارینی)ی بلیمەت‌و فرەزان لە (لوامع الأنوار البهية)دا دەڵێ: (فەرمودەی تاککەسی ئەگەر موستەفیض بێ یان مەشهور ئەوا دەبێتە مایەی زانینێکی دیدەوەری هەروەکو (ئیبن موفلیح)ی فرەزان‌و هی دیکەش لە ئەبا ئیسحاقی ئەسفەرانی‌و ئیبن فورەکیان نەقلٚ کردوە، گوتوشیانە زانینێکی قەطعیش دەبەخشێ).

پاشان قسەیەکی هێناوەتەوە کە فەرمودەی تاککەسی نا موستەفیض، دەبێتە مایەی گومان لەبەر ئەگەری (سەهو)و هەڵە کردن. بەڵام لە پێشەوا ئیبن قودامەو ئیبن حەمدان‌و طوفی‌و کۆمەڵێکی دیشی هێناوەتەوە بە هۆی قەرائنەوە دەبێتە مایەی زانین. عەلائەددین عەلی کوڕی سلێمانی مەرداوی فرەزان‌و بلیمەت لە راڤەی (التحرير)دا دەڵێ: (ئەمەیان دیارترو تەواوترە) زەبطی قەرائنیش بەوە دەبێ (لە فەرمودەکەدا نەفس ئارام بگرێ وەکو لە موتەواتیر ئارام دەگرێ یان لەو نزیك بێ بە شێوەیەك هیچ ئەگەرێکی لە لادا نەمێنێ).

ئەوەشی نوسدێر کردوە کە فەرمودە ئاحادە ناموستەفیضەکان دەبنە مایەی زانین بەو مەرجەی یەکێك لەو پێشەوایانە هێنابیەوە کە کۆدەنگیان لەسەر هەبێ‌و پێشەوایەتی‌و زەبطیان تێدا هەر مابێ.

وە لە قازی ئەبا یەعلای هێناوەتەوە کە دەڵێ (ئەمە راڕەوی حەنبەلیەکانە)و، ئەبا خەتتابیش دەڵێ: ئەو بۆچونە لە قسەی هاوڕاڕەوەکانمان

وەدەردەکەویّو، سەفارینی دەڵێ: ئەم قسەیە (ئیبن زاعونیو پێشەوا تەقیوددین ئیبن تەیمیە پەسەندیان کردوەو هەڵیان بژاردوە). پاشان دەڵێ: ئەوەی (ئوصولیو خاوەنانی ڕاڕەوی ئەبا حەنیفەو شافیعیو ئەحمەد –بەر میهری خودا بن– لەسەرینە ئەوەیە ئەگەر فەرمودەی تاککەسی نەتەوە قبوڵی کردو بەڕاستی داناو کرداری پێ کرد، ئەوا دەبێتە مایەی زانین) پاشان ئەوەی باس کردوە سەرپێچیکارانی ئەم نەتەوەیە کۆمەڵێکی کەمنو شوێن زانایانی کەلام کەوتونو، گوتویەتی ئەوانەی دەڵێن فەرمودە ئاحادەکان دەبنە مایەی عیلم ئەوانەن: (ئەبا ئیسحاقو ئەبا تەییب، عبدالوهابو هی تری لە مالیکیو سەرخەسیو هی تری لە حەنەفی هێناوەتەوە). وە دەڵێ: ( زۆربەی فەقیهو ئەهلی فەرمودەو سەلەفو زۆربەی ئەشعەریەکانو هی دیکەش هەر لەسەر هەمان بۆچونن).

(ئیبنو صەلاح دەڵێ: ئەوەی بوخاریو موسلیم بە ئیسناد هێناویانە زانینێکی ئاوەرو دیدەوەریەو وەردەگیرێ، بە پێچەوانەی قسەی ئەو کەسانەی دەڵێن بیانوی پێ ناکرێو لە بنەڕەتدا تەنها گومان دەبەخشنو بۆیە نەتەوە قبوڵیان کردوە چونکە پێیان وابوە دەبێ کار بە گومان بکرێ.

دەڵێ: ڕەنگە گومان هەڵە بکات. ئیبنو صەلاح دەڵێ: پێشتر منیش وای بۆ دەچومو بە بۆچونێکی بەهێزیشم دادەنا، بەڵام پاشان بۆم دەرکەوت ئەو بۆچونەی یەکەمجار هەڵمانبژاردبو ئەو تەواوە، چونکە زەننی مەعصوم هەڵە ناکاتو، نەتەوەش لە کۆڕایەکانیدا لە هەڵە مەعصومە).

ئیبنو صەلاح مەبەستی ئەوەیە نەتەوە لەسەر تەواوێتی بوخاریو موسلیم کۆڕان.

سەفارینی دەڵێ: (ئیبنو کەثیر لە بارەی ئەو قسەیەی ئیبنو صەلاح دەڵێ: ئەو فەرمودانەی بە ئیسنادن تەواون، دەڵێ: منیش لەو قسەیەدا لەگەڵ ئیبنو صەلاح دام)، پاشان باسی ئەوەی کردوە کە ئیبنوکەثیر قسەی مامۆستاکەی ئیبنو تەیمیەیە پەسەند کردوە کەوای لێ دەفامرێتەوە ئەو فەرمودانەی نەتەوەی ئیسلام قبوڵی کردون قەطعین، دوای ئەوەی هەندێ ناوی هێناوەتەوە ئیبنو

تەیمیە دەڵێ: (ئـەوەش ڕاڕەوی سـەرجەم ئـەهلی فـەرمودەو تـەواوی ڕاڕەوی سەلەفە)[٣١].

*** *** ***

[٣١] لوامع الأنوار البهية/ل١٧. بەو هەمو وتانەی هێناومانەوە بۆت دەردەکەوێ قسەکەی شێخ شەلتۆت تەواو نیە دەڵێ (بەو جۆرە دەبینین دەقەکانی زانا کەلامی و ئوصولیەکان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە فەرمودە ئاحادەکان نابنە مایەی زانین و بیروباوەڕیان پێ ناسەلمێ. زانا لێکۆڵەرەوەکانیش وەسفی دەکەن و دەڵێن شتێکی زەروریەو بەربەرەکانێ تێدا کردنی ڕاست نیە ).. بگەڕێوە بۆ "الإسلام عقيدة وشريعة" /ل٧٥.

# ئـەو دەقــانەی بــەڵــگــەن بۆ
# بە بیانو گــرتــنــی فەرموودە ئاحادەکان

چەندان دەق لەو بارەوە هــاتوەو واجبێتـی ئـەوە رادەگـەینن کـە وەرگرتـنی فەرمودە ئاحادەکانو بە بیانو گرتنیان بۆ سـەلماندنی بیروبـاوەڕ پیـادە دەکرێ، لەوانە:

١- ﴿ وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴾ سـورەتی تەوبە/١٢٢، واتە: ناگونجێ هەمو بڕواداران بۆ جیهاد بڕۆن، با لـە هـەر دەستـەیەك هەندێ بڕۆن تا لە دین ئاگاداری پەیا بکـەن و، لـەکاتی گەڕانـەوەدا بـۆ لای خێڵـی خۆیان ئەوان بترسێنن تا لە نافەرمانی خودا بترسن تا بەڵکو لە گوناه خۆ رابگرن.

ئەم ئایەتە هانی تیرەو هۆزو خەڵکی شارو گوندو هەرێمە جیاوازەکان دەدات لە هەر یەکێکیان چینێك راپــەڕنو فـێری ئاینەکـەیان بـنو پاشـان بگەڕێنـەوە لای گەلەکەیانو لە ئاین ئاگاداریان بکەنەوە. (چین) لە زمانی عارەباندا بە یەك کەسو پـتر دەگوتـرێ. لـەدین تێگەیشـتنیش بیروبــاوەڕو ئـەحکام دەگرێتــەوە، بــەڵکو تێگەیشتن لە بیروبـاوەڕ لـە ئـەحکام گرنگـترە، بۆیـە پێشـەوا ئەبا حەنیفـە -بـەر میـهری خـودا بـێ- لـە (الفقـه الأكـبر) چـەند لاپەڕەکـەیدا دەڵـێ: لـەم ئایەتــەدا بەڵگەیـەکی ئاشـکار هەیـە لەسـەر واجبێتــی وەرگرتـنی فـەرمودە ئاحادەکـان لـــە بیروباوەڕدا، ئەگینا بۆ چینێك دروست نەدەبو خەڵك لە دنیا ئاگادار بکەنەوە.

٢- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا﴾ سورەتی حوجـوڕات/٦ واتە: بڕواداران! گەر فاسقێك خواسێکی پێ راگەیاندن یەکەوسەر وەری مەگرن تــا لێی دەکۆڵنەوە، لە خوێندنەوەیەکی تردا (فتثبتــوا)ە ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە ئەگـەر خواسهێنەرەکە فاسق نەبێو راست بێ ئەوا بیانوی پێ دەسەلمێندرێو نابێ شـلی تێدا بکەن بەڵکو دەبێ یەکسەر وەری گرن.

٣- لە سوننەتدا شتی وا هاتوە ئەم ئایەتە رۆشن بکاتــەوە ((**فلولا نفر من كل فرقة منهم طائفة**)) ئیمام بوخـاری لـە صەحیحەکـەیدا لـە مــالیکی کــوڕی حوەیـرث دەڵـێ: ئێمـە چـەند گـەنجێکی تەمـەن ئـاوزای یـەك دەبویـن چوینـە لای

پێغەمبەر ﷺ نزیکەی بیست شەوی لە لا ماینەوە، بەڕاستی لەگەڵمان میهرەبان بو، بەڵام زانی غەریبی کەس و کارو خاوو خێزانەکانمان کردوە، لە ژیواری ئەو خەڵکەی لێ پرسین کە جێمان هێشتبون، ئێمەش وەڵاممان داوە، فەرموی: ((إرجعوا الى أهليكم فأقيموا فيهم، وعلموهم ومروهم، وصلوا كما رأيتموني أصلي)) واتە: بڕۆنەوە لای کەس و خزمانتان و لە ناویاندا بن، فێریان بکەن و فەرمانیان پێ بکەن و، بەو شێوەیە نوێژ بکەن کەمن دەیکەم.

لەم فەرمودەیەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە هەر یەکە لەو کۆمەڵە گەنجە کرد خەڵکی خۆیان فێر بکەن، فێرکردن بیروباوەڕیش دەگرێتەوە، بەڵکو یەکەمین شتە بیگرێتەوە، جا ئەگەر فەرمودەی ئاحاد بیروباوەڕی پێ نەسەلمێ، ئەوا فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ لەکار دەکەوێ.

٤- لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوە خەڵکی یەمەن هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتیان: پیاوێکمان لەگەڵ دا بنێرە سوننەت و ئیسلاممان فێر بکات. ئەویش دەستی ئەبا عوبەیدەی گرت و فەرموی: ((هذا أمين هذه الأمة)) واتە: ئەو پیاوە جێباوەڕی ئەم نەتەوەیە.

جا ئەگەر هەواڵدانی یەك تاقە کەس شایان نەبێ بۆ بەڵگە پێغەمبەر ﷺ ئەبا عوبەیدەی بۆ نەدەناردن، ئەو کات دەبێ هەمان قسە لە بارەی ئەو نێردە جیاوازانەش بڵێین کە پێغەمبەر ﷺ بۆ هەرێمە جیاوازەکان دەیناردن وەکو:

عەلی ئەبا تالیب و موعاذی کوڕی جەبەل و، ئەبا موسای ئەشعەری و هەروەها فەرمودەکانیشیان لە هەردو صحیح و پەڕتوکی دیشدا هاتوە.

هەڵبەت ئەو یاوەرانە خەڵکیان فێر دەکرد، بیروباوەڕیشیان فێر دەکردن، ئەگەر ئەوانیش نەبوبانە بەڵگە پێغەمبەر ﷺ بە تاك تاك نەیدەناردن. پێشەوا شافیعی -بەر میهری خودا بێ- لە پەڕتوکەکەی (الرسالة)دا دەڵێ:

(پێغەمبەر ﷺ هەر نێردەیەکی تاکە کەسی ناردبێ بوەتە بەڵگە لەسەر ئەوانەی بۆیان ناردراوە، خۆ پێغەمبەر ﷺ دەیتوانی نێردەیان بۆ بنێرێ و یەکە یەکە روبەڕو بیاندوێنێ یان کۆمەڵە کەسێکیان بۆ بنێرێ بەڵام یەك کەسی راستگۆی بۆ ناردن).

## وەڵامدانەوەیەك بۆ ئەوانەی دەڵێن فەرمودە ئاحادەكان بیروباوەڕیان پێ ناسەلمێ

زانایان لە زۆر ڕووەوە وەڵامی ئەو جۆرە كەسانەیان داوەتەوە، ئێمە لێرەدا هەندێكیان دەهێنینەوە:

١- ئەو قسەیەی گوایە فەرمودە ئاحادەكان بیروباوەڕیان پێ ناسەلمێ قسەیەكی داهێنراوەیەو لە شەریعەتداهیچ بنەڕەتێكی نیە، هەر قسەیەك بەم جۆرە بێ رەتكراوەیەو وەرناگیرێ.

٢- قسەكەی وان لە خۆیدا بیروباوەڕە، هەر لەسەر قسەی ئەوان ئەم بیروباوەڕەش بەڵگەیەكی قەطعی دەوێ تا (نەهی لەوە بكات فەرمودەی ئاحاد وەربگیرێت). كە ئەمەش هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نیە.

٣- ئەگەر بەڵگەیەكی قەطعی هەبوایە لەسەر وەرنەگرتنی فەرمودە ئاحادەكان لە بیروباوەڕدا، ئەوا یاوەران پێیان دەزانی‌و بە ئاشكرایی رایاندەگەیاند، هەروەها سەلەفە چاكەكانی دوای ئەوانیش.

٤- ئەم قسەیە پێچەوانەو تەكولۆیە لەگەڵ ئەو رێوشوێنە زانستیەی یاوەران لە سەری بون. چونكە ئەوان فەرمودەی تاكە كەسێكیان وەرگرتوەو هیچ دودڵیان نەبوەو قسەی برایەكەی رەت نەكردۆتەوە بە هەنجەتی ئەوەی فەرمودەی ئاحادە.

٥- ئەو بەڵگانەی لەسەر ئەوە هاتوە كە بەڵگەكانی قورئان‌و سوننەت واجب دەكەن وەربگیرێن‌و دەستیان پێوە بگیرێت، بیروباوەڕو ئەحكام دەگرێتەوە، جا تایبەتمەند كردنی ئەم بەڵگانە تەنها بە ئەحكام‌و فەرامۆش كردنی بیروباوەڕ؛ تایبەتمەند كردنێكە لە بوارێكی ناتایبەتمەندا.

٦- خودا فەرمانی بە پەیامبەران كردوە راگەیاندنێكی رون بە خەڵك بڵێن، ئاشكراشە راگەیاندنی رون دەبێتە بەڵگە لەسەر پێڕاگەیاندن‌و "زانین"ی پێ وەدی دێ.

جا ئەگەر هەواڵ پێدانی تاكە كەسێك زانینی پێ وەدی نەهاتبا راگەیاندن نەدەبو، چونكە بیانوبڕین بە زانین دێتە ئەنجام.

٧- ئەم قسەیە، وەرگرتنی فەرمودە ئاحادەكان لە بیروباوەڕدا لە دوای یاوەرانەوە پوت دەكاتەوە كە راستەوخۆ لە پێغەمبەر ﷺ بیستویانە.

چونکە فەرمودەکان بەر لە نوسینەوەیان تەنیا بە ڕێگەی ئاحاد بە خەڵك گەیشتون. ئەوانەی بە ڕێگەی تەواتوریش پێیان گەیشتوە ژمارەیان گەلێ کەمە. پاشان ئەوانەش کە گوتویانە فلان فەرمودە موتەواتیرە ئەوەش نابێتە مایەی زانین. چونکە هەواڵ پێدانی ئەو زانایەش هەر ئاحادە.

٨- ئەم قسەیە وا دەخوازێ واز لەو فەرمودە ئاحادانە بهێندرێ کە بیروباوەڕو کردەوەی تێدایە، چونکە کار پێ نەکردنی لە بواری بیروباوەڕدا ڕەتکردنەوەی فەرمودەکەیە، گەر وابێ چون لە ئەحکامدا کاری پێ دەکرێ؟!.

٩- ئوصولیەکان یەکدەنگ نین لەسەر ئەو قسەیەو وا نیە کە شێخ شەلتوت دەڵێ- پێشەوا مالیكو شافیعیو هاوڕاوانی ئەبا حەنیفەو داودی کوڕی عەلیو هاوڕێکانی وەکو ئیبنو حەزم لەسەر ئەوەن هەواڵ پێدانی یەك تاکە کەس دەبێتە مایەی زانین، تەنانەت حوسێنی کوڕی عەلی کەرابیسیو حاریثی کوڕی ئەسەدی موحاسیبیو قازی ئەبا یەعلای حەنبەلیش ئەمەیان فەرموە.

## ئەو بیروباوەڕەی بە فەرمودە ئاحادەکان سەلمێنراوە

بەر لەوەی کۆتایی بەم بابەتە بێنین، کۆمەڵێك لەو بیروباوەڕانە دەخەینە ڕو کە ئەو جۆرە کەسانە بە سەبارەتی ئەوەی کە بەڵگەکانیان ئاحادن ڕەتیان کردۆتەوە:

١- پێغەمبەرێتی ئادەم عليه السلام لە قورئاندا نەهاتوە بە پێغەمبەر ناوی بردبێ.

٢- پێغەمبەرمان محمد ﷺ باشترینی سەرجەم پەیامبەرو ناردراوان بێ.

٣- تکاخوازی مەزنی پێغەمبەرمان ﷺ لە گۆڕەپانی کۆبونەوەی ڕۆژی ژیانەوەدا.

٤- تکاخوازی پێغەمبەر ﷺ بۆ خاوەن گوناهە گەورەکانی نەتەوەکەی.

٥- موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ تەنها قورئان نەبێ، تەنانەت موعجیزەی لەت بونی مانگیش لە قورئانێدا باس کراوەو، تەئویلی وایان بۆ دیتتەوە پێچەوانەی ئەو فەرمودە تەواوانە بێ کە لەوبارەوە هاتوە.

٦- ئەو فەرمودانەی لەبارەی سەرەتای ئافەریدەکردنو سیفەتی فریشتەو جنۆکانو بەهەشتو دۆزەخو ئافەریدێتیانو بەردە ڕەشەکە لەبەهەشتێ بێ، دەدوێن.

٧- تایبەتمەندیەكانی پێغەمبەر ﷺ پێشەوا سیوطی لە (الخصائص الكبری)دا باسی كردوە، وەكو چونە نێو بەهەشتو بینینی بەهەشتیەكانو ئەو شتانەی بۆیان فەراهەم هێنراوەو، ئیسلام بونی قەرینە جنۆكەكەی.

٨- دە (١٠) موژدە پێدراوەكان بێ ئەرێو نەرێ بەهەشتی بن.

٩- پرسیاری نێو گۆڕی نەكیرو مونكەر.

١٠- بڕوا بون بە ئازاردانی نێو گۆڕ.

١١- بڕوا بون بە گۆڕەوشار.

١٢- بڕوا بون بە تەرازوی دوتاداری رۆژی دوایی.

١٣- بڕوا بون بە پرد (الصراط).

١٤- بڕوا بون بە كانیاوی كەوثەری پێغەمبەر ﷺ كە هەركەسێ قومێكی لێ بخواتەوە بۆ هەمیشە تێنوی نابێ.

١٥- چونە ناو بەهەشتی حەفتا هەزار كەس لەم نەتەوەیە بەبێ پرسو وەلامی رۆژی دوایی.

١٦- بڕوا هێنان بە هەمو ئەو فەرمودانەی باسی ژیانەوەو كۆكردنەوە دەكات كە لە قورئاندا باس نەكراوە.

١٧- بڕوا بون بە قەزاوقەدەری خێرو شەڕو، نوسینی بەدبەختیو خۆشبەختیو بژێویو ئاكامی تەمەنی هەر یەكێك.

١٨- بڕوا بون بەو پێنوسەی هەمو شتێكی نوسیوە.

١٩- بڕوا بون بەوەی خاوەن گوناهە گەورەكان بۆ هەمیشە لە دۆزەخدا نامێننەوە.

٢٠- بڕوا بون بەوەی روحی شەهیدان لە بەهەشتدا لە نێو سنگی باڵندەی رەنگ سەوزدان.

٢١- بڕوا بون بەوەی خودا لە زەوی حەڕام كردبێ جەستەی پێغەمبەران بخوات.

٢٢- بڕوا بون بەوەی خودا هەندێ فریشتەی گەڕۆكی هەبێو سلاوی نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ بە پێغەمبەر رادەگەینن.

٢٣- بڕوا بون بەسەرجەم نیشانەكانی رۆژی دوایی وەكو: هاتنی مەهدیو دابەزینی عیسا ؑ و هاتنی دەجالو ... زۆری تر.

خۆ ئـەم بیروباوەڕانـەی لەسـەرەوە هێناومانـەوە، هـەمویان فـەرمودەی ئاحادیان لەسەر نیە بەڵکو هەیانە فـەرمودەی موتەواتیریشـی لەسـەرە، بـەڵام بـێ عیلمیان بە سوننەتی ئاحادو موتەواتیر وای لێ کردون ئەم هـەمو بیروباوەڕە رەت بکەنەوە، دەنا فەرمودەکانی دەججال‌و مەهدی‌و دابەزینی عیسـای کوڕی مەریـەم فەرمودەی موتەواتیرن هەروەکو فەرمودە ناسان بە راشکاوی رایانگەیاندوە.

کارەسـاتی لـەوە گـەورەترو تاڵـتر ئەوەیـە بیروبـاوەڕی فـەرمودە موتـەواتیرەکانیش رەت بکرێنـەوە. نـەك هـەر هێنـدەش تەنانـەت ئەوانـەی لـە قورئانیشدا هاتون بـەو بیـانوەی دەقـەکان دەلالـەتی قـەطعی بەدەستەوە نـادەن هەروەکو پێشتریش گۆتەیەکی (شێخ شەلتوت)مان باسی کردبو.

بۆیە ئەوەشیان رەتکردۆتەوە کە بڕواداران لە رۆژی ژیانـەوەدا خـودا ببینـن، ئەگـەرچی خـودا بـە راشـکاوی فەرمویـەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ ۞ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ سورەتی قیامە/٢٢-٢٣، واتە: لەو رۆژەدا هـەندێ روخسـار هـەن گـەش‌و گوشادن‌و تەماشای پەروەردگاریان دەکەن. چەندین فەرمودەی موتەواتیریش ئەم دیتنەیان سەلماندوە.

## حوکمی ئەوانەی بە فەرمودەی ئاحاد بیروباوەڕ ناسەلمێنن

سەفارینی وتەیەکی ئیسحاقی کوڕی راهەوێی هێناوەتەوە کە ئەوانە بـە کـافر دادەنێ کە لالوتی لە فـەرمودە ئاحادەکـان دەکـەن. بـەڵام راسـترەکەی ئەوەیـە: بەکافر داناندرێن، وا دەردەکەوێ ئەوانەی بەبێبڕوایی بڕیار دەدەن، تەماشای ئـەو فەرمودانەیان کردوە کە نەتەوە لەسەر تەواوێتییان کۆڕابوە، بـەڵام ئێمـە دەڵێـین: ئـەوەی رێبـازی رەتکردنـەوەی فـەرمودە تـەواوەکانی پێغەمبـەر ﷺی گرتـوەو بەبەڵگـەی بیروباوەڕیـان ناسـەلمێ ئـەوا رێبـازێکی چـەوتی گرتۆتەبـەر، مەترسـی ئەوەشی لێ دەکرێ بە سەبارەتی ئەم کارەوە گرفتاری گومڕایـی ببـێ. ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ سـورەتی نـوڕ/٦٣، واتە: ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دا دەکەن بـا وریـا بـن، نـەبادا توشی کارەسات بن یان سزایەکی سەخت یەخەیان بگرێ.

# ئــەمەیــە ریـّو شویّنــی راســت

ئێمە لەوتوێژینەوەیە کە لێرەدا پێشکەشی دەکەین، بە قورئانو سـوننەتەوە پابەندین، بۆیە لەسەرمان پێویستە بیروباوەڕەکەش بەپێی ئەو شێوازە بخەینە رو، کە قورئانو سوننەت رایان نواندوەو، لەو رێوشوێنە لانەدەین. هەر ئـەم رێبـازەش بو دڵی نەوەی یەکەمی ئەم نەتەوەیەی ژیاندەوە.

هەر ئەویشە تاکە رێبازی چاکەرەوەی نەتەوە، مالیکی پێشـەوا لەسەردەمی خۆیدا پێشەواو زانای شاری مەدینە بوە –ڕاستی فەرموە: (کۆتـایی ئەم نەتەوەیـە چاك بونی بۆ نیە مەگەر بەو رێگەیەی نەوەی یەکەم گرتویانە بەر).

پێشتریش جیاوازی رێوشوێنی قورئانمان لەگەڵ فەلسەفەدا باس کرد چۆن لە بیروباوەڕدا جیاوازیان هەیـە، ئـەو جیاوازیـەش پابـەندمان دەکات دەست بـەو رێوشوێنە بگرینو دەستبەرداری شێوازی تر بین.

## گـومانێك پێویـستی بە رونکـردنەوە هـەیە

هەندێ لەوانەی چـەند زانیاریـەکیان لـە ئیسلام هەیـە دەڵێـن: ئـاخر! چۆن قورئان بۆ ئەوانە بهێنینەوە بڕوایان بە خودا نیە؟ ئەمڕۆ پێویستە بـە ژێربێژیـەکی زانستی ماددی خەڵك بدوێنین وبەڵگەی ئاوەزییان بۆ بهێنینەوە جا ئەگەر باوەڕیان بە ئیسلام هات ئەنجا بە قورئان دەیاندوێنین.

ئێمە بەو جۆرە کەسانە دەڵێین: ئێـوەو خـودا، ئـەدی خـوای گـەورە چۆن فـەرمانی بـە پێغەمبـەر ﷺ کردوە کـە بێبڕواکـان بـە قورئـان یـادەوەر بکاتــەوەو بیانترسێنێ، کەچی نە بە خوداو نە بە قورئانو نە بە پێغەمبەریش، بڕوایـان نـەبو ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾ سورەتی ئەنعام/١٩ واتە: تا ئێـوەو هـەمو کەسـانێك کە دەنگی قورئانیان پێ دەگات بە هەڕەشە ئاگاداریان بکەمەوە... چۆن فەرمانی پێ کردوە قورئانیان بۆ بخوێنتەوە؟ ئەدی هەر قورئان نـەبو؟ کـە بەسـەر لالـوتو سەرکەشە بێبڕواکانی دەخوێندەوەو نەفسی دەهەژاندنو دڵی بە لەرزە دەخستن؟

ئایەتـە قورئانیـەکان چیـان لـە ئومەییـەی کـوڕی خەلـەفو وەلیـدی کـوڕی عوتبەو دەیانی تر کردو؟ چۆن توانـی بـەرانگژیان بێتـەوە هەرچـەندە بێبڕوایـەکی سەختو سەهەندەیان هەبو؟!

ڕەنگە بلێین: ئەوڕۆکە قورئان لە هەمو جێگەیەکدا تەنانەت لە رادیۆی لەندەن و ئیسرائیلیش دەخوێندرێتەوە کەچی خەڵك هێشتا بڕوا بەو قورئانە ناهێنن کە دەیخوێننەوە.

وەڵامی ئەو پرسە ئەوەیە کاتی خۆی عارەبە دێرینەکان ژنەوتی ئایەتەکان دەبون؛ بە قوڵاییەکانی نەفسیاندا شۆڕ دەبۆوە، چونکە عارەب بون و لە واتاو مەبەستی ئایەتەکان دەگەیشتن و هیچ پەردەیەکیان لە نێواندا نەبو.

بەڵام ئەمڕۆ چەندین پەردەو پەرژین کەوتۆتە نێوان خەڵك و قورئان، هەندێکیان بە سەبارەتی زمانە، هەندێکیان بە سەبارەتی چەند گومانێکە کە لە دڵی خەڵکدا سەقام بوەو بوەتە بنێشتە خۆشەی زاریان.

بۆیەکە ئەمڕۆ ئەرك و تەقەلای هەڵگرانی قورئان بریتیە لە پاچڤەکردنی قورئانی پیرۆز بۆ زمانی ئەو خەڵکە تا تێی بگەن، لەسەریان پێویستە هەم خەڵك بە قورئان و هەم قورئان بە خەڵك ئاشنا بکەن، بەو چەشنەی واتاو مەبەستی ئایەتەکانیان بۆ ڕۆشن و نوێ بکەنەوە، بەم جۆرە نەفسی مرۆڤ سەر لەنوێ ئابوتاب و چێژەکەی هەست پێ دەکاتەوەو بەم ڕێگەیە واتاکانی دەگاتە بێبڕواو سەرکەشەکان و ئەو بانگەوازە ئەنجام دەدرێ کە بیانوی هەمو مرۆڤێکی پێ دەبڕێ.

پێشتریش رونمان کردەوە قورئان پڕیەتی لە گفتوگۆو مشتومڕی ئاوەزی و تێنوێتی دڵ دەشکێنێ و، تەنها هەواڵ پێ دان نیە.

## بانگەوازێکی گومانبار

بەڵێ، ئەوە ڕێبازو ئەو ڕێوشوێنە بو کە خودا بۆمانی هەناردوە تا لەنەفسەوە بڕوای پێ سەقام کەین و خۆمانی پێ پابەند بکەین و خەڵکی پێ بانگەوازو پەروەردەو فراژو بکەین.

بەڵام دوژمنان و خەڵەتاوانی ئەم نەتەوەیە تەقەلای شێواندنی ئەم ڕێبازە دەدەن و بانگەشەی لەیەك نزیك بونەوەی ئاینەکان دەکەن، لەو پێناوەشدا چەندین کۆڕو کۆنگرە سازدراوە.

ئەو موسوڵمانانەی لەو کۆڕو کۆنگرانەدا بەشداریان کردوە کەوتونەتە هەڵەیەکی گەورەوە، خراپ ڕەتیان بردوە، ئیسلامیان وەکو ئاینی جولەکەو دیانان کردۆتە مایەی لێکۆڵینەوەو پێدا چونەوە.

مەگەر پۆزش بۆ ئەوانە قبولْ بکەین کە ویستویانە بەمجۆرە بەشداری بکەن کە قورئان فەرمویەتی: ﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ سورەتی آل عمران/٦٤، واتە: بلێ: ئەی نامەوەران! وەرن با لەسەر واژەیەك كە لە نێوان هەمومان‌دا یەکسانە کۆببینەوە ئەویش ئەمەیە بێجگە لە خودا کەسی تر نەپەرستین‌و هیچ شتەك نەکەینە هاوبەشی ئەوو، هەندێ لە ئێمە هەندێ تر لەباتی خوا نەکەینە خواو پەروەردگار بۆ خۆمان، جا ئەگەر رویان وەرگێڕا، بلێن: شایەد بن بەڕاستی ئێمە موسوڵمانین.

ئەو بەشدار بوانە لەسەریان بو، ناهەق‌و بەتاڵی ئاینی وان‌و دینی هەقیان بە جوانترین شێوە رون بکردایەوەو بیانویان بڕیبان نەك حەزو ئارەزویان بدوێنن، یان دەم شلی لە ناهەق‌و بەتاڵیەکەیان بکەن‌و لە ئامێزی بگرن...

ئەوانەش خۆیان دەخەنە هەڵەیەکی ناقولاوە کە دەیانەوێ ئیسلام تێکەڵی ئاینی دیکەو ڕاڕەوی فەلسەفان بکەن‌و پێیان وایە دەتوانن گونجانێك لە نێوان دەقە قورئانی‌و قسەکانی ئەوان کەسان بکەن‌و لە قۆناغێکی نێوەنجیدا ئیسلام بە نائیسلام بگەیەنن. لەوەدا راست ناکەن‌و خۆیان‌و رێوشوێنیشیان گومڕا بوە. چونکە ئیسلام دینی خودایەو لەسەر ژیان‌و ژیانەوەران دەست رۆیشتوو زاڵە، پێویست ناکا لەگەڵ یەکدا بسازێندرێن، بێ لە ئیسلام ناهەق‌و چاکەی تێدایە، بەلام ئیسلام هەر هەموی چاکە، ئەرك‌و تەقەلای ئێمەش ئەوەیە ئیسلام بە دانسقەیی خۆی راگرین ﴿قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٦، تا بەڵکو خەڵك بتوانن ئیسلامێکی پاك‌و سازگار وەدۆزن.

خودا سەرزەنشتی ئەم چەشنە خەڵکەی کردوە کە دەیانەوێ ئیسلام ئاوێتەی رێبازی تر بکەن‌و سازانێکیان لە نێودا فەراهەم بێنن، رای گەیاندوە ئەمە کاری مونافیقانە ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا ۞ فَكَيْفَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَاءُوكَ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا إِحْسَانًا وَتَوْفِيقًا ۞﴾ سورەتی نیساء/٦١-٦٢ واتە: ئایە نەتدی کەسانێ لایان وایە بەوەی لە پەرتوکی ئاسمانی بۆ تۆو بۆ پێشینانی

تۆی هەرناردوە، بڕوایان هێناوە، بەڵام دەیانەوێ بە داوەری بچنە لای تاغوت‌و حاکمانی ناهەق‌و ستەمکار، لە حاڵێکدا دەستوریان پێدراوە لالوتی لە تاغوت بکەن، شەیتان دەیەوێ ئەوانە لاڕێ بکا بۆ لاڕێیەکی دور لە هەقیقەت(٦١) کاتێ بەوانە بگوترێ: بۆ لای ئەوەی خودا ناردویەتی‌و بۆ لای پێغەمبەر بێن، دوڕوەکان دەبینی روت لێ وەردەگێڕن(٦٢).

*** *** ***

# بڕوابوون بە خودا

## گرنگی ئەم بنەڕەتە :

یەکەمین بنەڕەت لە بنەڕەتەکانی بیروباوەڕ، بڕوا بونە بە خودا. ئەم بنەڕەتە گرنگترین بنەڕەتی بیروباوەڕو کارە کردەکیەکانە، ئیسلامی بەدەوردا دەخولێتەوەو کرۆکی قورئانە، تێپەڕیمان نەکردوە ئەگەر بڵێین قورئان هەر هەموی لە بارەی بڕواوە دەدوێ، چونکە یا ئەوەتە راستەوخۆ لەبارەی ناوو سیفەتو کردەکانی خوداوە دەدوێ وەکو ئایەتی کورسیو سورەتی ئیخلاص، یان بانگەشەی پەرستنی تەنها خوداو وازهێنانو فەرامۆش کردنی پەرستنی جگە لە خودا دەکات، ئەوانەش هەمویان پێناسینی خودایەو هاندانە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیو رو وەرگێڕانە لە بەناو خوداکانی تر. وەیان فەرمان بەوە دەکات فەرمانبەری خودا بکرێو سەرپێچی نەکرێ، ئەوەش داخوازیەکانی بڕوایە. وەیا ئەوەتە خواسو بەسەرهاتی بڕوادارانمان بۆ دەگێڕێتەوە کە خودا چۆن رێزێکی لە دنیادا پێ بەخشیونو لە ژیانەوەشدا چۆن سەقامیان پێ دەبەخشێ، ئەوەش پاداشتی بڕوادارانە.

هەرچی خواسو کارەساتەکانی بێبڕوایانیشە کە چۆنو چ سزاو ئازارێکیان لە دنیاو ژیانەوەدا پێ گەشتوەو دەدرێ، ئەمەش سزای ئەوانەیە رویان لە بڕوا وەرگێڕاوە.

کەواتە قورئان هەموی لە بارەی بڕوا بون بە خوداوە دەدوێ، بۆ زیاتر رون بونەوە لە سەرجەم قورئاندا یادی خودا بە ناوێك یان سیفەتێك لەسیفەتەکانی (١٠٠٦٢) دە هەزارو شەستو دو جاران هاتوە کە نێوەنجییەکەی دەکا (٢٠)جار بۆ هەر روپەڕێك.

دەتوانین بڕوا بون بە خودا لەگەڵ بنەڕەتو لکەکانی دی بە رەگو قەدو لكو پۆپەکانیان بەراورد بکەین. بڕوا بون بە خودا بناری بنەڕەتەکانە، بناغەی دینە، مرۆڤ هەرچەندی لە بڕوا بون بە خودا بەهرەمەندتر بێ هێندە لە ئیسلام بەهرەمەند دەبێ.

## بابەتەکانی بڕوابون بە خودا

چەند بابەتێك لەم بارەوە هەیە؛ تۆژەرەوە بواری بۆ نیەو دەبێ رایاننوێنــێو بیانکۆڵێتەوە:

یەکەم: بەڵگەکانی سەلماندنی بونی خودای هــەرە بــەرزو وەڵامدانــەوەی ئــەو گومانانەی تێوەی گلاوە.

دوەم: ناسـاندنی خـودای تـاکو تـەنیا، ئەمەشـیان لـە قورئـاندا بـە دو رێگــە دەبێ:

١- دەرخستنی ئەو داهێنانو موعجیزانــەی لـە ئـەفرێنراواندا هەیـەو، لەســەر گەورەیی دەسەڵاتی خوداو دانسقەیی دروستکراوەکانی بەڵگەن.

٢- توێژینەوەی ئەو ئایەتانەی راستەوخۆ لــە بـارەی خـودو نـاو و سـیفەتو کردەکانی خوداوە دەدوێ.

سێیەم: خوا بەیەکناسین بەوەی بە تەنها بپەرسترێو واز لـە بـەناو خوداکـان بهێندرێ.

چوارەم: چاوخشاندنێك بە مێژوی بیروباوەڕی پەرستراوێتیو ساغ کردنەوەی ئەم بابەتە.

*** *** ***

## ڕێختی مرۆڤ بێ بەڵگە گەواهی بۆ بونی خودا دەدا

قورئـان بـۆ سـەلماندنی بونـی خـودا درێـژەی بـە هێنانـەوەی بەڵگـەو بەڵگـە خوازی نەداوە، چونکە قورئان بڕیـار لەسـەر ئـەوە دەدات ڕێختـی بـێ گـەردو ئـەو نەفسەی لە دژونبونو گەماری هاوبەشپەرستی پاك بێ؛ بەبێ بەڵگـە دان بـە بونـی خودا دەنێ، هەر هێندەش نـا، بـەڵکو یـەکتایی خـودا بەڵگە نەویسـتێکی ڕێختیـە ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ سورەتی روم/٣٠، واتە: رو وەرگێڕە بۆ ئاینی یـەکخوا ناسـی، خـودا خەڵکی بەم ڕێختەوە ئافەریدە کردوە، ئەفرانی خودا گۆڕانی بۆ نیە، ئەوەیە دینـی راست.

هەر ئەو ڕێختەیە وەڵامەی ئەو دیاردەیە دەداتەوە. توێژەرەوان کە لە مێژوی ئاینـەکانیان کۆڵیوەتـەوە، بۆیـان دەرکـەوتوە هـەمو ئـەو نەتەوانـەی –مێژویـان توێژیوەتـەوە– چـەند پەرسـتراوێکیان داتاشـیوەو رویـان تێدەکـەن بـە پـیرۆزی دادەنێن[٣٢].

رەنگە بڵێن، ئەگەر رو کردنە خودا شتێکی ڕێختی بوایـە، خـەڵك بـە درێژایـی رۆژگار ئەم هەمو پەرستراوانەی نەدەپەرست.

وەڵام بـەم جۆرەیـە: ڕێخـت مـرۆڤ هـەڵدەنێو دنـەی دەدات تـا رویکاتـە ئافەریدگاری. بەڵام مرۆڤ رەنگە بە هۆی پـەروەردەی بـاوانی یـان بـە سـەبارەتی ئـەو هـزرە نەگریسـانەی پـەڕتوکو مامۆسـتاو توێـژەرەوان بـڵاوی دەکەنـەوە؛ لـە پەرستنی خودا لاڕێ ببێ، ببنە مایەی ژەنگ گرتنی ڕێختو پەردە لەسـەر دروسـت بونی.

بۆ راستی قسەکەمان پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەك بوخاریو موسلیم لە ئـەبا هورەیرەوە گێڕایتیانەوە خوا لێی رازی بێت فەرمویەتی: ((**ما من مولود يولد إلا على الفطرة، فأبواه يهوّدانه أو ينصّرانه أو يمجسانه**)) واتە: هـەمو منداڵێـك

---

[٣٢] تەنانەت ئەو کۆمۆنیزمانەش کە ویستویانە لە پەرستنی خواوەندان رەها بن، سالاری خۆیان دەپەرستن، لە گۆڕەپانی سوردا لە ساڵرۆژی لە دایکبونی سالارەکەیاندا کاتێ بەبەردەم تەمی مۆمیا کراوی دادەچن، سەریان بۆی نوچ دەکەنەوە. لە باتی خودای ئافەریدگار تەرمێکی مردو دەپەرستن و کردویانە بە خوا... خوا لە ناویان ببا.

لەسەر رێختی خواناسی لە دایك دەبێ، بەڵام لـە پاشـان بـاوانی دەیکەنـە جولەکـە یان دیان یان ئاگر پەرست. لێرەدا نەیفەرموە دەیکەنە موسڵمان، چونکـە ئیسـلام هاوسازی رێختی مرۆڤە.

رەنگە بپرسن: ئەگـەر دەسـتبەرداری منداڵێـك بویـن‌و لێـی گـەڕاین بـۆ خـۆی پەروەردە ببێ، ئایـە لـە ئـەنجامدا خـوا بەیـەکناس دەردەچـێ؟. دەڵێـین: ئەگـەر مرۆڤ‌و جنۆکە ئەهریمەنەکان وازیـان لێ هێنـا بـەڵێ، بـەڵام جنۆکـە ئەهریمەنـەکان قـەت وازی لێ نـاهێنن. چونکـە ئیبلیـس هـەرێی لەگـەڵ خـۆی بەسـتوە تـا بمێنـێ ئادەمیزادان لە خشتە ببات: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ۝ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ۝﴾ سورەتی ص/٨٢-٨٣، واتە: دە خوایـە سـوێند بـە شـکۆو سـامت هەر هەمویان گومڕا دەکەم مەگەر بەندە چاکە خوازو دڵ راستەکانت.

خودا توانێکی وای بە ئیبلیس داوە بگاتە نێو دڵی مـرۆڤ‌و کـاری تـێ بکـات. فەرمودەیەکی صەحیح دەڵێ: ((إن الشيطان يجري مجرى الدم من العروق)) واتە: ئیبلیس لەگەڵ خوێنی ناو دەماران هاموشۆ دەکـات. قورئـان لـە ئایـەتێکیدا ئیبلیـس وەسـف دەکـات ﴿يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ﴾ سـورەتی نـاس/٥، واتـە: ئەرێ‌و نەرێ دەخاتە نێو دڵی خەڵك، فـەرمودەی تـەواویش لـەو بـارەوە هەیـە کـە هـەمو مرۆڤێـك هـاودەمێکی جنۆکـەی لەگـەڵ دایـە بـۆ بـەدکاری گـاڵی دەدات. قورئانیش دەفەرموێ: ﴿ قَالَ قَرِينُهُ رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ وَلَكِنْ كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ﴾ سورەتی ق/٢٧، واتە: لە پرسیارو وەڵامی ژیانەوەدا هاودەمەکە بـە خـودا دەڵـێ: خودایە من لە فەرمانەکانت یاخی نەبوم، بەڵکو بە خۆی لە نێو گومڕاییـەکی قوڵـدا بو.

مرۆڤ تەنها ئەگەر پەنا وەبەر خودا ببات ئەوجا لە نەخشەی ئیبلیس رزگاری دەبێ ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ۝ مَلِكِ النَّاسِ ۝ إِلَهِ النَّاسِ ۝ مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ ۝ الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ ۝ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ۝﴾ سـورەتی نـاس، واتـە: بڵێ: خۆم بە پەروەردگاری خەڵك پەنا دەگرم، پادشای خەڵك، خواوەندی خەڵکە، لە گاڵدانی بەدکاری خۆبزرکەر کـە تیـخ تیخـە دەخاتـە دڵـی خـەڵك، لـە جنۆکـان‌و خەڵك.

جنۆکە ئەهریمەنەکان ڕۆڵێکی کاریگەریان لە تێکشێوان و ژەنگگرتنی ڕێختی مرۆڤ هەیە. لە صەحیحەکەی موسلیم عیاضی کوڕی حمار خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، تێیدا فەرموی: ((**إن ربي أمرني أن أعلمكم ما جهلتم مما علمني في يومي هذا: كل ما نحلته (منحته) عبادي حلال، وإني خلقت عبادي حنفاء كلهم، وإنهم أتتهم الشياطين فأضلتهم عن دينهم، وحرمت عليهم ما أحللت لهم وأمرتهم أن يشركوا بي ما لم أنزل به سلطانا**)) واتە: پەروەردگارم فەرمانی پێ کردوم ئەوەتان فێر بکەم کە ئێوە نایزانن و منی فێر کردوە؛ ئەوەی بە بەندەکانم بەخشیوە سەرجەمیان حەڵاڵە، من بەندەکانم بە یەکخواناس ئەفراندوە، بەڵام شەیتانەکان چەندلاو گومڕایان کردن و لە دین وەریگەڕاندن، ئەوەی من حەڵاڵم کردبو ئەوان حەرامیان کرد، فەرمانی پێ کردن هاوەڵ بۆ خودا بڕیار بدەن.

## گرفتاری، ڕێختی مرۆڤ مشتوماڵ دەکات

زۆر جاران مرۆڤ توشی گرفتاری و کارەساتێك دەبێ یان دەکەوێتە تەنگانەو قەیرانێکی ئەوتۆ دەستی یارمەتی کەسی ناگاتێ و دەرەتانی لێ گاڵە دەدرێ، لەو کاتانەدا گەردو ژەنگو ژاری سەر دڵی بڵاوە دەکات و تارومار دەبێ. چەندین خوا نەناس هەبونە پاشان خودایان ناسیوەو لەبەریدا ناورانەوەو، چەندین هاوبەشپەرست هەبونە هاوبەشپەرستییان فڕێ داوە، کاتێ تەنگانەو پێشهاتێکیان بەسەرهاتوە ﴿حَتَّىٰ إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا بِهَا جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾ سورەتی یونس/٢٢، واتە: کە لە نێو کەشتی دادەبن و بایەکی ئارام هەڵدەکات دڵیان پێ خۆش دەبێ، بەڵام کە ڕەشەبا هەڵدەکات و لەهەمو لایەکەوە دەریا شەپۆڵ دەدات وا دەزانن ئیتر فەوتاون، بە پاکی لە خوا دەپاڕێنەوەو لە هیچ هاوبەشی تر ناپاڕێنەوە، دەڵێن خودایە! ئەگەر لەم تەنگانەیە ڕزگارمان بکەی تا دەمرین سوپاسگوزارین.

گوێمان لێبوەو خوێندومانەتەوە کە سەرنشینەکانی ناو فرۆکە چۆن ژیوان بوینەوەو رویان کردۆتە خودا کاتێ فرۆکەکە خەوشێکی توش بوەو لە ئاسماندا لەریوەتەوەو لاکەلا بوەو فرۆکەوان بێ چارەو دەسەوسان ماوەتەوە، لەو ساتەدا خوا نەناسی تونا بوەو دەنگی نزاو پاڕانەوە بەرز بۆتەوەو دڵان بە پاكو پەرۆشەوە رویان کردۆتە پەروەردگار.

بەڵێ، هاوبەشپەرستیو خوانەناسی لە ئاوەها کاتێکی ترسناكو ترکزەدا ئارایان نامێنێ.

## ئەو هاوبەشپەرستانەی پێغەمبەریان بۆ رەوانە کرا دانیان بە بونی خودا دە نا

ئەو عارەبانەی پێغەمبەر ﷺ بەرەنگاریان بۆوە، دانیان دەنا خودا هەیەو گەردونی ئەفراندوەو بژێوو زیانو سود بەخشە... بەلام لەگەڵ خودا شتی دیشیان دەپەرستو بە تەنیا بۆ ئەو دینداریان نەدەکرد.

کاتێ پێغەمبەر فەرمانی بە هاوبەشپەرستەکان دەکرد تەنیا خودا بپەرستنو دینداری تەنها بۆ خودا ئەنجام بدەن، لێی دەپرسین ئافەریدگارو خاوەنو دەسەلاتداری ئاسمانو زەوی کێیە؟

دەیانگوت خوداو سەرکەشیان لەوەدا نەدەکرد. ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ سورەتی لوقمان/٢٥.

لە سورەتی (ئەلموئمینون)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ لِمَنِ الأَرْضُ وَمَنْ فِيهَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ۞ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلا تَذَكَّرُونَ ۞ قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ۞ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ ۞ قُلْ مَنْ بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلا يُجَارُ عَلَيْهِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ۞ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ ۞ ﴾ ئایەتی/٨٤-٨٩، واتە: بلێ زەویو کەسانی لە زەویدان هی کێیە؟ ئەگەر دەزانن. دەڵێن: هەموی هی خودایە، بلێ ئایە یادوەر نابن. بلێ کێ پەروەردگاری حەفت ئاسمانو بارەگای مەزنە؟. دەڵێن خودا بلێ: کەواتە پارێزگاری ناکەن؟. بلێ کێ فەرمانڕەوایی هەمو شتێکی بەدەستەو بێ پەنایان پەنا دەداو نیازیشی بە

پەنادان نیە؟. ئەگەر بزانن. دەڵێن هەمو ئەوانە هی خـودان. بڵـێ: جـا چۆن ئێوە جادو لێ کراون.

هەروەها عارەبەکان کەعبەیان بەگەورە دەگرتو حەجیشیان دەکـردو چەند پەرستنکاریەکیش لە ئاینەکانی پێشو مابونەوە، ئەنجامیان دەدا.

## بێبڕوایی ئەمڕۆی خەڵك گەورەترە

وامان پێ شایانترە بـۆ هێنانـەوەی بەڵگەو نیشـانەکانی بونـی خـودا هێنـدە هەڵوەستان نەکەین، چونکە رێختی مرۆڤ گەواهی بە بونی خودا دەداتو ، رەنگـە لـە دێرینـەوە کـەس پـەیدا نـەبوبێ سـەهندەیی لـە بونـــی خـــودا کردبـێ مەگـەر کەسانێکی زۆر کەم کە رێژەیەکی ئەوتۆ پێکناهێنن.

بەڵام ئەم لارێبونەی ئەوڕۆکە هاتۆتە ئارا گەیشتۆتە قوڕی بنی، وای لێهاتوە گەلانی وا پەیدا بـن بڵێـن خـودا نیـە ئـەم قسەشیان کردۆتـە راڕەوێكو شـێرازەی ژینیان پێ بنیات ناوە، بەڵکو چەندین وڵاتیشیان پێ دامەزراندوە کـە بـە ملیۆنـان کەسیان گرتۆتە خۆ.

ئـەم قسـەیە هـەمو شـوێنێکی داگرتۆتـەوە، چـــەندان پـەڕتوکی لــە بابــەت دانـدراوە، بوەتــە فەلســەفەو دەخوێنــدرێ، هــــەوادارانی تەقـــەڵایان دەدا بـــە رێوشوێنێکی زانستی ناودێری بکەنو بەڵگەو مەڵگانی بۆ بهێننەوە.

لەبـەر ئـەوە ناچـارین فرەوانـتر لـەو بابەتـەوە بدوێـینو هـەندێ بەڵگـەی بـۆ بهێنینەوە.

## ئافەریدە، ئافەریدگاری هەیە

قورئان وەها بیانوی سەرکەشو لالوتـان دەبـڕێ کـە ئاوەزیـان چـاری ناچـار گەردن کەچ بکات و، ژیربێژی قەت بوار نەدات رەتی بکاتـەوە. خـودا دەفـەرموێ: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُـمُ الْخَالِقُونَ ۞ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بَل لا يُوقِنُونَ ۞﴾ سورەتی طور/٣٥-٣٦، واتە: ئایە ئەوانە بێ هـۆ بـەدی هـاتون؟ ئایـە خۆیان ئافەریدگاری خۆیانن؟ یان ئەوان ئاسمانەکانو زەویـان ئـەفراندوە. نـەخێر بەڵکو ئاوەریان نەهێناوە.

پێیان دەڵێ بونی ئێوە هەقیقەتێکی ئاشکرایەو ئێوەش سەرکەشی لێ ناکەن، هەروا بونی ئاسمانەکانو زەویش.

قورئان بە ئاوەز دەڵێ هەر بونێك هەبێ دەبێ هۆکارێکی هەبێ. وشترەوانی بێرونیش ئەم شتە دەزانێو دەڵێ: (بێچوی وشتر بەڵگەی وشترەو شوێنپێ بەڵگەی رۆیشتنە، باشە ئەو هەمو ئاسمانو زەویو ئەستێرانە بەڵگەی خودای زاناو لێزان نیە؟!). هەروەها زاناو تۆژەرەوەی فرەزانو بلیمەتیش دەیزانێ یەك لەو زانایانە دەڵێ: (خودا هەر بوەو مەزنەو بە هەمو شتێك زانایە. بەسەر هەمو شتێك تەوانایە، دروستکراوەکانی هێندە دانسقەو نایابن لە ئاست ئەو دانایىو دانستەییەی لە وردو درشتی دروستکراوەکانیدا نەخشاندونی سەرسامی کردومە)[٣٣].

ئەوەی ئایەتەکە ئاماژەی بۆ کردوە لە لایەن زانایان بە (یاسای هۆکاری) ناسراوە. ئەم یاسایە دەڵێ: هەر شتێکی مومکین هەرگیز لە خۆیەوە لە هیچەوە دروست نابێ چونکە لە سروشتەکەیەوە هۆکاری پێویستی بۆ بونەکەی نیە.

هەورەها (بە تەنیاش هیچ شتێك پەیدا ناکات) لەبەر ئەوەی ئەو شتەی نیە تا ببەخشێ. بۆ رون کردنەوە با وێنەیەك بهێنینەوە:

چەند ساڵێك لەمەو بەر لە بیابانی (روبعی خاڵی) لەگەڵ گەردەلولو رەشەبایاندا شارێکی بزربو و رۆچوی تێدا وەدیار کەوت، جا زانایان لێیان دەکۆڵیەوەو تەقەلایان دەدا ئەو سەردەمە ساغ کەنەوە کە شارەکەی تێدا دروست کراوە بەڵام هیچ ئاسەوارناسێك یان یەکێکی تر بە بیری دانەدەهات ئەو شارە لە ئەنجامی چەند هۆکارێکی سروشتی وەکو باو بارانو ساردو گەرمی پەیدا بوبێو مرۆڤ دروستی نەکردبێ.

خۆ ئەگەر یەکێك وای گوتبا، خەڵك بە گەمژەو شێتو شێواویان دادەناو جێی زگ پێ سوتان بو!

ئەدی ئەو قسەیە چۆنە؟ گەر بڵێی ئەم شارە لە دێرینێکی زۆر دورەوە سەربەخۆو لە هیچەوە پەیدا بوەو پاشان لەسەر زەوی سەقامی گرتوە؟! خۆ ئەو قسەیە چی لەوی تر کەمتر نیە بەڵکو زۆر رمووزنو سەمەرەتریشە.

---

[٣٣] بێژەری ئەم وتەیە زاناو بلیمەتی فیزیۆلۆژی لینیۆی فەرەنسییە. لە پەرتوکی (مـع الله)ی شێخ حسن أیوب وەرگیراوە/ل٧٦.

بۆچی؟ چونکە شتێکی بەڵگە نەویستە (نەبون) هیچ شتێك پەیدا ناکاتو شتیش ناتوانێ خۆی بێنێتە بون.

ئەو شارەش بوار نیە دەبێ یەکێك هێنابێتیە بون. کردەوەش کردگار دەناسێنێ، کەواتە ئەم شارە دەبێ کەسانێکی ژیرو زانا هەبوبن لە بیناکاریو هەماهەنگیان زانی بێو بنیاتیان نابێ.

ئەگەر مرۆڤێك ببینین لە ژێرەوەی خانوێکەوە بچێتە سەرەوەی ئەوا لاریمان نیەو پێمان ئاساییە، چونکە مرۆڤەو توانستی ئەوەی هەیە.

بەڵام گەر بەردێك ببینین بردراوەتە سەرەوەی خانوەکە، پێگیریەکی تەواو دەکەینو دەڵێین قەت بە حۆی خۆی نەگۆستۆتەوە بەڵکو دەبێ کەسێك هەبوبێ گواستبیەوە، چونکە بەرد ئاکاری جولانەوەو بەرز بونەوەی نیە.

سەیرە ! خەڵك پێگیری دەکەن لەسەر ئەوەی ئەم شارە دەبێ یەکێك هەبێ هێنابیە بون و، بەردەکەش دەبێ یەك هەبێ بەرزی کردبێتەوە، کەچی بڵێ ئەم گەردونە بێ کردگار دروست بوبێ و هاتبێتە بون بێئەوەی بوێنەرێکی هەبێ، گەردون گەلێ ئالۆزترو مەزنترە ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ﴾ سورەتی غافر/٥٧، واتە: دروستکردنی ئەرزو ئاسمانەکان گەورەترە لە دروستکردنی خەڵك.

بەڵام سەرکەشو سەهندەکان کە ئەم جۆرە ژێربێژیو قسەزانستیانە بەرەنگاری ئاوەزیان دەکرێتەوە ناتوانن دانی پێدا بنێنو فیز بەرزی دەکەن.

زانایانی ئیسلام هەر بەم جۆرە بەڵگانەوە بەرەنگاری بێبڕوایان بونەتەوە. ئەوەتانێ ئەبا حەنیفەی پێشەوا چەند بێبڕواو خوانەناسێکی بەرەو رو دەبێتەوە، ئەویش پێیان دەڵێ: چ بەو کەسە دەڵێن گەر بڵێ: کەشتیەکی پڕ لە بارو حەشاماتم بینی، توشی شەپۆلی گەورە گەورەو یەك لە دوای یەكو باو بارانێکی زۆر دبۆوە، کەچی بێئەوەی کەشتیوانێکی هەبێ لە رێڕەوی خۆی دەڕۆیشت. ئایە ژیریی ئەوە هەڵدەگرێ؟ گوتیان: ژیریی ئەم شتە قبوڵ ناکات. ئەبا حەنیفە گوتی: پاکی بۆ خودا، ئەگەر ژیری ئەوە هەڵنەگرێ کەشتیەك لەنێو دەریادا بێئەوەی کەشتیوانێکی لەسەر بێ بڕواتو لە رێڕەو لانەدات، ئاخر چۆن دەکرێ ئەو دنیایە

بەو هەمو ئالۆزیو فرەوانیو ڕەنگینیــەوە کردگـارو پارێزگـاری نـەبێ؟! ئـەوانیش فرمێسکی پەشێمانیان هەڵڕشتو ژیوان بونەوە[٢٤].

ئەم یاسایە کە ئاوەز دەستی بۆ لە سـنگ دەدات و بـۆی ملکـەچ دەبـێ، لـەو ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ﴾ سـورەتی طـور/٣٥، ئـەم یاسـایە بەڵگەیەکـە هۆشمـەندان ناچـار دەکـات دان بـەوە بنێـن ئافـەریدگارێکی پەرستراو هەیـە، بـەڵام ئـەم ئایەتـە بـە نەشمو شێوازێکی هێنـد ڕەوانو کارا داڕشتوە، هەر گوێ ژنەوتی بێ نەفس بهەژێنێتەوە.

بوخاری پێشەوا لـە صەحیحەکـەیدا دەڵـێ: محمـدی کـوڕی جوبـەیری کـوڕی موطعەم لە باوکی دەگێڕێتەوە گوتویەتی: لە پێغەمبـەر ﷺ م بیسـتوە لـە نوێـژی مەغریب دا سورەتی (الطور)ی دەخوێندەوە تا گەیشتە ئەم ئایەتـە ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ۝ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ ۝﴾ دەڵـی خەریك بو دڵم ڕاوەستێ. (بەیهەقی) لـە (الأسمـاء والصفـات ٣٩١/١)دا دەڵـێ ئـەبا سلێمانی خەتابی –بەڕ میهری خودا بێ– دەڵێ: کە هێندە خرۆشـاوە لەبـەر ئـەوە بوە، گوێی لە ئایەتەکە بوە زۆر بە جوانی لە واتاکەی گەیشتوەو پێی ئاشنا بوە و پەی بە ڕەوانبێژی ئەو بیانو هێنانەوەیـەش بـردوەو تـەنكو ناسـك وەری گرتـوەو واتاکەی بەزرنگی فام هەست پێ کردوە.

(خەتابی) ئەم واتایـەی بـۆ ڕاڤـەی ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ﴾ هـەڵبژاردوە: (ئایـە بەبێ ئافەریدگار ئەفراون؟ هەڵبەت ئەمەش نـاکرێ، چونکـە ئافـەریدە هیـچ چـاری نیـە دەبـێ ئافـەریدگارێکی هـەبێ، جـا ئەگـەر لاساریيان لـە مـــە کـردو گوتیـان ئافـەریدگار ئافـەریدەی نـەکردوین دەبـێ بڵێـن خۆمـان ئافـــەریدگاری خۆمـانین! ئەوەشیان هەر خراپتر چونکە گەر شتێك نەبێ چۆن دەکـرێ بڵێـی توانـی هەیـە؟ چۆن دەتوانێ ئافەریدە بکات؟ چۆن دەتوانێ کردارێك ئەنجام بدات؟ ئەگـەر ئـەم دو ڕێگەیـەش هەتـەر بکـاتو ناکـام بـێ ئـەوابیانویان دەبـڕێو دەبـێ دان بـەبونی ئافەریدگار بێننو بڕوای پێ بهێنن

---

[٢٤] مع الله شيخ حسن أيوب/ل٦٨.

پاشان دەفەرموێ: ﴿أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بَل لا يُوقِنُونَ﴾ ئەوەش شتێکە مەحاڵە بانگەشەی بۆ بکەن کەواتە بیانویان نامێنێ.

ئەوەی (خەتابی) دەیڵێ کە بێبڕوایان ناتوانن بانگەشەی بۆ بکەن، سودی هێنانەوەی هەر ئەوەیە بیانوی دژمەندبونیان ببڕێنتەوەو قسەیان پێ نەهێڵێ چونکە رەنگە سەرکەشێکی لالوت نابەجێیی بکاتو بڵێ (بەخۆم خۆم ئەفراندوە).

چونکە کاتی خۆی یەکێك هەبو گوتی منیش دەمرێنمو دەژیێنم ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٨، واتە: ئەرێ سەرنجت نەداوەتە ئەو کەسەی لە بارەی خوداوە رکابەری لەگەڵ ئیبراهیم دا کرد کە خودا سامانو دەوڵەتێکی زۆری پێدا بو، ئیبراهیم گوتی .خودای من دەژیێنێو دەمرێنێ، گوتی: منیش دەژیێنمو دەمرێنم، ئاخۆ وەرامی چ بێ؟.

ئیبراهیمی پێغەمبەر داوایەکی لێ دەکات قسەکەی مایە پوت دەکاتەوە ﴿قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٨، واتە: خودا رۆژ لە تاوهەڵاتەوە هەڵدێنێو لە خۆرنشینەوە ئاوای دەکات مادام وا دەڵێی تۆ لە رۆژئاواوە هەڵی بێنە.

لە ئاکامدا بێبڕواکە دەمبەست بو، چونکە خودا گەلی ستەمکار رێنوێنی ناکات ﴿فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٨.

یەکێك پەیدابو بڵێ (بەخۆم خۆم ئەفراندوە) بەڵام ئایە دەتوانێ بڵێ ئەرزو ئاسمانم دروست کردوە؟! جا ئەگەر (نەبون) نەتوانێ ئەرزو ئاسمان بێنێتە بونو ئەگەر ئەرزو ئاسمان بەخۆیان خۆیان نەهێنابێتە بون، مادەم ناشتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن هەر هەمو ئەوانەیان ئەفراندبێ.. کەواتە رێ نەماوە تەنها ئەوە نەبێ بڵێین دەبێ ئەفرێنەرێك هەبێ. ئەو ئەفرێنەرەش خودای هەرەبەرزو تاكو بێ هاوەڵە.

## هەڵوێستی زانستە ئەزمونیەکان لە ئاست ئەم پاسایەدا

توانستی مرۆڤ و سروشتی ئافەریدان، لە باریاندا نیە یەك یەکی قۆناغەکانی هۆکاریی و ئەڵقە بە ئەڵقەی لیزگەکەیان بخاتە رو، تا بتوانرێ سەرەتای پەیدا بونی بونەوەر ئاشنا بکرێ. بۆیە زانستە ئەزمونیەکان لە ناسینی بنەوانی شتەکان بێ هومێد بوو دەستبەردار بونی خۆی لەو لێکۆڵینەوەیە راگەیاند چونکە ئەوپەڕی کردو کۆششی بریتی بو لە گەڕانەوەی چەند شاقاوێك بەرەو دواوە، لەو لاوەش جیهانێکی پڕ لە پەنامەکی بەجێ هێشت کە زاناو نەزان لە ئاستیدا وەکو یەکن.

## ئاوەزو ژیری بواریان نیە تەنها دان پێدانان نەبێ

بەڵام ئەم بێهومێدبونەی مرۆڤ کە نەیکراوە وردەکیا. ە رابردو و ئایندەی دۆخەکانی بونەوەر بناسێ؛ هەمبەری ئەوە ئاوەزێکی گشتی هەیە بیەوێ و نەیەوێ هەمو ئاوەزێك دادەگرێ ئەویش ئەوەیە مادەم ئەم هۆکارانە زنجیرە یەك پێکدێنن، —ئاخۆ گریمان کۆتایی بێ یان نا— کەواتە دەبێ راڤەو تێگەیشتن و ژیرکاریەکی وا بێتە ئەنجام کە شتێکی تر هەبێ هۆکاری بون و مانەوەی لە خۆوە بێ، بەجۆرێك ئەو ببێتە (یەکەمین راستەقینە) و لە پێش ویدا هیچ نەبوبێ.

دەنا ئەو هەمو بونە هەر لەنێو دو توێی نەبون و شاراوەییدا دەمێنتەوە (ئەگەر دەستپێکارێکی خاوەن بونێکی سەربەخۆی بۆ نەبێ).

دەڵێین: بونی ئەو هەقیقەتە زەرورەتێکی ئاوەزو ژیریەو قەت بواری تێدا نیە دەبێ بۆی ملکەچ بین و کەسێکیش —ئەگەر بۆ کەمێکیش بێ— بیری لێ بکاتەوە نایکرێ لاری تێدا بکات. خوداش راستی فەرموە: ﴿ هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ سورەتی حەدید/٣، واتە: خودا خۆی یەکەمو کۆتاو دیارو دەرونەو خۆی زانیارە بە هەمو شتێك.

*** *** ***

# گــــومانی جۆراو جۆر

کەسانێك هەن لە مێـژە تەنانـەت ئـەمڕۆش لێیـان گـوێ بیسـت دەبـین یـاخۆ دەخوێنینەوە کە چـەند گومـانێك دەخەنـە رو و بـڵاوی دەکەنـەوە بەومەبەسـتەی پاساوی بونی گەردون بدۆزنـەوە. ئێمـەش تەقـەلا دەدەیـن هـەندێ لـەو گومانانـە بخەینە رو و دەمامکی روی درێوو بزرکاویان دەرخەین.

## ١- گوایە بە رێکەوت بوە!

پاش ئەوەی بۆمـان رون بـۆوە قورئـان ئـاوەز دەدوێنـێو پێـی دەسـەلمێنێ خودایەکی پەرستراوو ئافـەریدگار هەیــە ئــەم بونــەی پــەیدا کردبــێ.. بۆمــان دەردەکەوێ ئەو قسەیەی دەڵێ ئەم گەردونە بەبێ ئافەریدگارو بە رێکـەوت پـەیدا بوە، چەند لە راستی دورە، بەڵکو هێند کە لە ئاوەز دورە بانگەشەکارانی پێ دێتە ریزی خەڵەفاوو ژێر فەوتاوان. چونکە ئەوان فیزبەرزی لە بەرامبـەر ئـەو بەڵگانـەدا دەکەن کە بە ئاوەز دەسەلمێنێو بواری نابێ قبوڵی نەکات.

هی وا پەیدا بوە دەڵێ: (ئەگەر شەش مـەیمون خۆیـان تـەرخانی سـەر ئالـە کاتیبەیەك بکەنو سەرومڕ بە درێژایی ملیۆنان ساڵ سەرگەرمی بن، دور نیە لە دوا لاپەڕەکانیدا چامەیەکی شکسپیر بنوسن. دەڵێن گەردونیش بەم جۆرە لە ئەنجامی چەند کردارێکی رەمەکیانە پــەیدابوە کـە بـە بلیۆنـان سـاڵ لـە نـاو (ئـەنبوژەن)دا گەردانی کردوە، تا بوە بەم گەردونە).

وەحیدوددین خان[35] دوای هێنانـەوەی ئـەو بڕگەیـەی وتـەکانی (هیکسـلی)[36] دەڵێ: ئەم جۆرە قسانە هەر چۆنی بکرێو بەهەر شێوەیەك دەربـبڕدرێ، هەر ورتە ورتو گرۆگاڵی نەزۆکەو هیچی تر. چونکە تا ئێستاشی لە گـەڵدا بـێ نـەمانزانیوەو نەبوە بە رێککەوت جیـهانێکی تـری مـەزن و سـەمەری خـاوەن روحـی وەکـو ئـەم گەردونە پەیدا بوبێ. هەر بۆ پوچانەوەی ئەم وتەیە وتەی زانایـەکی دی دێنێتـەوە

---

[35] الإسلام يتحدى/ل٦٦.

[36] (هیکسلی) نوسەرێکی خولنەناسە و پەرتوکێکی بە ناوی (الإنسان يقوم وحده) داناوە، بـەلام خـوای گـەورە زانایـەکی لـە نەتەوەکەی خۆی لێ راست هێناو پەرتوکێکی بە ناوی (الإنسان لا يقوم وحده)ی لە وەلامی نوسینەکەی دانا، ناوی (کریستی مۆریسـون)ەو سەرۆکی ئەکادیمیـەی زانسـتەکانە لـە نیـۆرك و پێشـوش ئـەندامێکی ئەنجومـەنی راپـەڕاندنی ئەنجومـەنی توێژینەوەی نەتەوەیی ئەمریکا بوە.

دەڵێ ( ئەو قسەیەی دەڵێ ژیان لە ئەنجامی "روداوێکی هاوسازی" پەیدا بوە، وەك ئەوە وایە بڵێ لە ئەنجامی تەقینەوەیەکی رەمەکیانە فەرهەنگێکی چەند هەزار لاپەڕەیی پەیدا بوبێ!).

وەحیدوددین خان دەڵێ (ئەو بیرکاریەی بەزمی "رێکەوت"مان پێ دەڵێ هەر ئەویشە پێمان دەڵێ قەت بەپێی هیچ بیرکاریەك ناکرێ بە یاسای رێکەوت گەردونێکی ئاوەها پەیدابوبێ).

بۆ وێنە سەرنج بدە ئەو نمونەیەی وەحیدوددین کە لە زانای ئەمریکی (کریسی مۆریسۆن) وەری گرتوە، تێیدا رون دەکاتەوە مەحاڵە ئەم گەردونە بە رێکەوت پەیدا بوبێ.

دەڵێ: (ئەگەر دە درهەمت هێناو لە ژمارە یەکەوە تا ژمارە دە رەنوست کردن پاشان خستونەتە ناو گیرفانتو تێکەڵو پێکەڵت کردن، پاشان تەقەلا بدەی درهەمەکان لە ژمارە یەکەوە تا (دە) بە ریزو یە ... دوای یەك دەریان بێنی هەر جارەش کە درهەمێك دەردێنی بیخەیەوە گیرفانت.

تەقەلای یەکەم تا درهەمی ژمارە (یەك) دەرچێ شێمانەی لە سەدا یەکی هەیەو، دەرچونیشیان بە ریزی یەك تا چوار (١،٢،٣،٤) ئەگەری لە دە هەزار یەکی هەیە.

بەلام لە (١-١٠) لە دە بلیۆنان ئەگەرێکی هەیە)[٣٧].

بەم پێودانگە پەیدا بونی ئەم گەردونە بە رێکەوت چەندی گەرەکە؟ هەژمار کردنی ئەم شێمانەیە دەبێتە خەیاڵیو لێك نادرێتەوەو مێشك بەربیری ناکات.

لەم گەردونەدا هەرشتێك بگری، بەلگەیەو پێت دەڵێ: یەکێکی داناو زاناو لێزان ئەفراندوێتی، بەلام مرۆڤ ستەمکارو نافامیدەیە ﴿ قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ ۝ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ ۝ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ ۝ ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ ۝ ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ ۝ ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ ۝ كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ ۝ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ ۝ أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا ۝ ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا ۝ فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ۝ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ۝ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ۝﴾ سورەتی عەبەس/١٧-٢٩، واتە: ئای مرۆڤ توناو تون بی

---

[٣٧] تەماشای العلم یدعوا للإیمان بکە/ل٥١.

چەند سپڵەو ناسوپاسگوزاری. خودا مرۆڤی لە چ شتێك وەدی هێناوە. پاشان ڕێگەی بۆ خۆش‌و ئاسان کرد. پاشان مراندی‌و لە گۆڕی نا. پاشان هەر کاتێ بیەوێ زندوی دەکاتەوە. نا، هێشتا ئەوەی فەرمانی پێکرا بو بەجێی نەهێناوە. با مرۆڤ بنوارێتە خۆراکی خۆی. ئێمە بارانی زۆرمان باراند. لە پاشان زەویمان لەت لەت کرد. دانەوێڵەمان لێ شین کرد. هەروەها ترێ‌و سەوزی‌و خواردەمەنی و دار زەیتون‌و دارخورماش.

ئاخر چۆن ڕێکەوت دەتوانێ ئەم مرۆڤە بەو شێوەیە پەیدا بکات‌و ئەم هەمو خواردنە فەراهەم بێنێ کە ئەرزو ئاسمان بەشداری تێدا دەکەن. خوا ڕاستی فەرموە: ﴿قُتِلَ الإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ﴾و لەبارەی وەسفی ئەم مرۆڤە ڕاستی فەرموە: ﴿إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً﴾ سورەتی ئەحزاب/٧٢، واتە: مرۆڤ ستەمکار ونافامیدەیە.

## ٢- گوایە سروشت ئافەریدگارە!

ئەوەشیان بەزمێکی ترەو لەم سەردەمە هەرمێنی بۆ جاڕدراوە. تەنانەت ئەوانەشی گرتۆتەوە کە لە زانستە ماددیەکاندا قۆناغێکی باشیان بڕیوە. زۆر کەس هەن پەیدا بون‌و دروست بونی شتان بۆ سروشت دەگەڕێنێتەوەو پێیان وایە بە هۆیەوە ئەفراون.

ئێمەش پرسیارێکیان ئاراستە دەکەین: ئایە مەبەستیان لە سروشت چیە؟ ئایە مەبەستیان خودی شتانە؟ یاخود مەبەستیان لەو ڕێساو یاساو ڕێکخەرانە دێ کە گەردونی پێ هەڵدەسوڕێ؟ یاخۆ هێزێکیان مەبەستە کە لەو دیوی گەردونەوە بونەوەری دروست کردبێ؟.

## ئەوانەی دەڵێن سروشت بریتیە لە گەردون

ئەگەر بڵێن گەردونمان بە سروشت پێ مەبەستە، ئەوا پێویست ناکات وەلامیان بدەینەوە چونکە لەوەو پێش گەندەڵی قسەکەیان دەرکەوت. ئەم قسەیە هەمانی پێشوە کە دەڵێ بون بە خۆی خۆی هێناوەتە بون، واتە دەڵێن گەردون بە خۆی خۆی دروست کردوە؛ ئاسمان ئاسمانی پەیدا کردوە، زەوی زەوی دروست کردوە، گەردون مرۆڤ‌و ژیانەوارانی ئەفراندوە. ئێمەش ڕونمان کردەوە کە ئاوەزی مرۆڤ ڕەفزی ئەوە دەکاتەوە شت بە خۆی خۆی هێنابێتە ڕو. وێڕای ئەمەش قەت

شتێك ناتوانێ شتێكی له خۆی نایابـترو چاكـتر دروست بكـات. سروشـتێك ئـه‌رزو ئاسمان‌و ئه‌ستێره‌و رۆژو مانگ بێ ئاشكراشه ئاوه‌زو دیتن‌و بیستنیان نیه، ئاخۆ چۆن ده‌توانن مرۆڤێكی خاوه‌ن بیسـتن‌و زانسـت‌و بینـین ئافـه‌ریده بكـه‌ن؟! قـه‌ت نابێ.

ئه‌گه‌ر بشلێین: ئـه‌م هـه‌مو بونـه‌وه‌ره بـــه رێكـه‌وت بـوه. ده‌لێـین: وه‌كـو به‌رله‌ئێستا رونمـان كـردووه رێكـه‌وت شـوێنپه‌نجه‌ی لـه ئـه‌فراندنی گه‌ردوندا جـێ نابێته‌وه.

## بیردۆزی خۆ ئه‌فراندن (گومانێكـو دوری به‌سه‌رچو)

یه‌كێك له‌و هۆكارانه‌ی بوه مایـه‌ی ئـه‌و بتپه‌رستیه نوێیـه‌ی ده‌ڵـێ (سروشـت ئافه‌ریدگاره)، ئه‌وه بو كه سروشتناسان ده‌یانبینی له پاشه‌رۆك‌و پیسایی مـرۆڤ‌و گیانله‌به‌راندا جۆره كرمێـك پـه‌یدا ده‌بـێ، هـه‌روه‌ها جـۆره به‌كتریایـه‌كیش له‌سـه‌ر خواردن په‌یدا ده‌بوو ده‌بوه مایه‌ی گه‌نین. له‌و سۆنگه‌وه گوتیان: به‌ڵێ، ئه‌وه‌تانێ ئه‌م زینده‌وه‌رانه ته‌نها له سروشته‌وه په‌یدا ده‌بن.

ئه‌م بیردۆزه رمێنی بۆ په‌یدا بو و پتر جێ پێی سروشتی له دڵـی گومڕاوانـی دور له رێنمایی خودا قایم كرد. به‌ڵام هێنده‌ی نه‌برد كرچ‌و پـوچ‌و گـه‌نده‌ڵێتی ئـه‌م بـیردۆزه له‌سـه‌ر ده‌سـتی (پاسـتێر)ی زانـای نـاوداری فه‌ره‌نسـی وه‌دیـار كـه‌وت‌و سه‌لماندی كه په‌یدابونی ئه‌و جۆره كرم‌و به‌كتریایه له خۆڕا لـه سروشـته‌وه پـه‌یدا نابێ. به‌ڵكو لـه ئـه‌نجامی چـه‌ند گه‌راو هێلكۆكه‌یـه‌كی وردی پێشـوه‌یه كـه بـه‌چاو نـابینرێن. بۆ سـه‌لماندنه‌كه‌ش چـه‌ند به‌ڵگه‌یـه‌كی خسـته رو و زاناكـانی پـێ هێنـا باوه‌ڕ. هه‌ندێ خواردنی هێنـا بـه هـۆی كوڵاندنـه‌وه بـه‌كتریاكانی كوشـت‌و پاشـان هه‌وای لێ عه‌زل كرد، ئیتر نه‌بوه مایه‌ی په‌یدا بونی بـه‌كتریاو گـه‌نینی خواردنه‌كـه. هه‌ر ئه‌م بیردۆزه‌ش بو بوه مایه‌ی داهێنانی خوارده‌مه‌نی نێو قوتو[28].

---

[28] په‌رتوكی التوحید‌ی زه‌ندانی ٧٤/٢.

# سروشت بریتیە لەو یاسایانەی گەردون هەڵدەسورێنن

هەندێکی دی پێیـان وایـە سروشـت بریتیـە لـەو یاسـایانەی گـەردون بـەڕێوە دەبەن. ئەمــەش لێکدانـەوەی فسـفس پاڵەوانـەکانی زانسـتو زانیاریـە کـە دەڵێـن گەردون ئافەریدگارە. دەڵێن گەردون هەمو کاروبارەکـانی لـە وردتریـن شـتەوە تـا گەورەترین بەپێی چەند رێساو یاسایەك بەڕێوە دەچێو شـیرازەچن دەبێ، وەکـو ئەو کـاژمێرەی بۆ مـاوەی سـاڵانی دورو درێـژ بـەو پـەڕی وردەکاریو رێکوپێکـی دەخولێتەوە، ئەویش ئاوا بەبێ مشورخۆر خۆی بەڕێوە دەڕوات!.

بـەڵام ئەوانـە وەڵام نادەنـەوە کـێ گـەردونی ئـەفراندوە؟ بـەڵکو بـاس لـە چۆنیەتی بەڕێوە چونو کارکردنی دەکەنەوە. ئەوان یاساکانی چۆنیەتی کارکردنی گەردون شی دەکەنەوە، بەڵام ئێمە وەڵامی ئـەوەمان دەوێـت ئـاخۆ کـێ گـەردونی ئافەریـدە کردوەو کێ یاساکانی بۆ داڕشتوە؟.

(پێشان مرۆڤ هەر ئەوەی دەزانی ئاسمان باران دەبارێنێ، بەڵام ئەمڕۆ ئێمە هەمو شتێکی لە کرداری بە هەڵم بونی ئاوی دەریاوە تا داباریـنی دڵۆپــە ئاوەکـانی باران.. هەر هەموی دەزانین.

هەمو ئەوانە تەنها دیمەنن بۆ روداوەکان نـەك لێکدانـەوەو وەڵام بـن. زانسـت ئـەوەمان بـۆ نادۆزێتـەوە ئـەو روداوانـە چـۆن بـون بـە یاسـا؟ چـۆن ئـەو دیمەنــە سەراسیمەکارە لـە نێوان ئـەرزو ئاسمـاندا پـەیدا بـو؟ تـا زانایـان بتوانــن چــەند یاسایەکی زانستی لێ هەڵێنجن.

ئەو مرۆڤەی پێی وایە بەهۆی دۆزینـەوەی سیسـتەمی سروشـت لێکدانـەوەی بونی گەردونی دۆزیوەتەوە، خۆی دەخەڵەتێنێ، چونکە بـەم بانگەشـەیە قـەفێکی لە ناوەڕاستی زنجیرەکە بردۆتە کۆتاییو پێی وایە وایە.

سروشت هیچ شتێك لە گەردون لێکناداتــەوە، بـەڵکو ئـەو خـۆی لێکدانـەوەی پێویستە. ئەگەر لە نوژدارێك بپرسی: بۆچی خوێن رەنگی سورە؟

دەڵـێ: چونکـە خوێـن خڕۆکـە سـوری تێدایـە، قـەبارەی هـەر خڕۆکەیـەکیان بریتیە لە (3 إنـج "1/700").

– چاکە، بەڵام بۆچی ئەوان رەنگیان سورە؟

لەناو ئەم خڕۆکانەدا ماددەیەك هەیە پێی دەڵێن هیمۆگلۆبین کاتێ لە دڵدا لەگـەڵ ئۆکسجین تێکەڵ دەبێ رەنگی سور وەردەگرێ.

- جوانە، بەڵام ئەم هیمۆگلۆبینانە لە کوێ دێن؟

لە جەرگ پەیدا دەبن.

- بەڕاستی سەیرە! ئەدی باشە خوێن‌و خڕۆکەکان‌و جەرگ‌و ئەوانی دی، ئەو هەموە چۆن بەیەکەوە هاوسازو پەیوەندیکارن‌و چۆن بەو وردەکاریەوە ئەرکی خوازراویان جێبەجێ دەکەن؟

ئەوەیە پێی دەڵێن یاسای سروشت.

- بەڵام جەنابی دختۆران مەبەستتان لە یاسای سروشت چیە؟

مەبەست جولەی ناوەکی‌و رەمەکی هێزی سروشت‌و کیمیایە.

- بەڵام ئەم هێزە بۆچی بەردەوام مەبەستی ئامانجێکی زانراوەو؟ چۆن چالاکیەکان رێکدەخات تا باڵندە لە ئاسمان پەرواز بکات وماسی لە ئاو مەلە بکات‌و مرۆڤیش لەگەڵ ئەوەی ئەو هەمو توان‌و چوستیە بەرفرەوان‌و نایابەی هەیە کەچی لە دنیادا دەژی؟.

لەوەم لێ مەپرسە. چونە زانیاری من تەنها (لەوەی رودەدا) دەدوێ‌و نایەوێ وەڵامی (بۆ رودەدات) بداتەوە.

لەم پرسیارو وەڵامەدا مەودای توانای زانستی تازە بۆ شیکردنەوەو لێکدانەوەی یاساو هۆیەکانی بونی ئەم گەردونە وەدەر دەکەوێ.

هەڵبەت زۆر شتیشمان بۆ رون بۆوە کە زانیاریمان لە بارەی نەبو... گەردون وەکو ئامێرێك وایە کە لە ژێر بەرگەکەیدا بخولێتەوە، هیچی لێ نەزانین تەنها ئەوە نەبێ دەسورێتەوە (بەڵام ئەگەر بەرگەکەمان کردەوە هەمو ئەو ئامرازو دیشلی‌و خلۆکانە دەبینین کە چۆن چۆنی بەیەکەوە پەیوەندن‌و جولانەوەیان دەبینین چۆن هەندێکیان هەندیکیان دەسوڕێنێ. جا ئایە گەر ئێمە ناوەوەی ئەم ئامێرەمان دیت‌و زانیمان چۆن ئیش دەکات واتای ئەوەیە ئافەریدگاری ئەم ئامێرەمان ناسی؟ ژیربێژی چ دەڵێ گەر بڵێین مادەم ئامێرەکەمان بینی سەلماندمان بەخۆی خۆی دروست کردوەو لە خۆوەڕا هەڵدەسوڕێ؟!)[٣٩].

---

[٣٩] الإسلام يتحدى ــ وحيد الدين خان ٢٩-٣١قسەکانی ئەویش قسەی زۆر لە زانا رۆژئاوایییەکانی تێدایە.

## سروشت بریتیە لە هێز

ئەوانەی دەڵێـن سروشـت بریتیـە لـە هـێزێك گـەردونی هێناوەتـە رو. زنـدو و شنەواو بیناو داناو تەوانایە... ئێمەش پێیان دەڵێین: ئەوەی دەیڵێن راستە، بەڵام ئەو هەڵەیەی تێی کەوتون لەوەدایە کە ناوتان ناوە (سروشت)، چونکە ئـەو هـێزە داهێنەر وئەفرێنەرە رێبەریمان دەکات بە(خودا) بیناسین کە لە رێی نـاوە جـوان‌و سیفەتە بەرەزەکانی ناسیومانە، ئێمەش لەسـەرمان پێویسـتە بەهـەمان ئـەو نـاوە بیناسین کە بەخۆی پێی راگەیاندوین.

## پێش ئەوانیش هی وا هەبون وا بڵـێن

بـەر لەوانـەی گوتویانـە سروشـت بونـەوەری ئـەفراندوە، کەسـانێك هــەبون قسەیەکی نزیك لە قسەی ئەوان بڵێـن، پێیـان دەڵێـن رۆژگاریـەکان. دەیـاندیت بـە تێپەڕبونی کات‌و هاموشۆی شەوو رۆژ بچوك گەورە دەبێ‌و گەورە پیر دەبـێ‌و پـیر دەمرێ، لەو ئەنجامەوە ژیان‌و مردنیان حەواڵەی رۆژگار کردوە ﴿ وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ وَمَا لَهُمْ بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴾ سورەتی جاثیە/٢٤، واتە: گوتیان جگە لە ژیانی دنیا شتی تـر لـە کـاردا نیە، دەستەیەك لە ئێمە دەمـرن‌و هـەندێکی تـر جێگایـان دەگرێتـەوە، بێجگـە لـە رۆژگار شتی تر ئێمە لەناو ناباو ئەوانـە بـەو قسـەی دەیڵێـن بـڕواو ئاوەڕیـان نیـە، بەڵکو تەنها گومانە.

رۆژگاریـەکان روداوەکانیـان بـۆ رۆژگـار گەڕاندۆتـەوە، سروشـتیەکانیش بـۆ سروشت.. کە هەردوکیان کاڵای یەك باڵان!.

## بیردۆزەکەی داروین[٤٠]

هـەوادارانی ئـەم بیردۆزەیـە ویسـتویانە پاسـاوی بونـی بونــەوەر بدەنــەوە، بیردۆزەکە بڵاو بۆوەو زۆر کەسیش بــە نیـاز پاکیـەوە هـەرمێنی بـۆ رابـێرا، گوایـە هەقیقەتێکی زانستیە. زۆر کەسیش بە نیازی بـەدەوە بڵاویـان دەکـردەوە چونکـە لەگەڵ ئارەزوە گڵاوەکانیان تێکی دەکـردەوەو ئاینـەکانی بـەدرۆ دەخسـتەوە کـە

---

[٤٠] کتاب التوحيد– زەندانی ٦٨/٣.

باس له ئەفراندنی مرۆڤ دەکەن، بەم جۆره تەوسکاران بەڵگەیەکیان وەدۆزی بیکەنە بنەمای سەرلێشێواندنی خەڵك.

## بیردۆزەکە چ دەڵێ؟

ئەم بیردۆزه دەڵێ: نەژادو بنەڕەتی هەمو بونەوەر زیندەوەرێکی بچوك بوه ئەویش له ئاوەوه پەیدا بوه، پاشان ژینگه زۆر گۆڕانکاری بەسەر بنیاتی ئەم زیندەوەره هێناوەو بۆی بوەته مایەی پەیدابونی چەند سیفەتێکی نوێ، ئەم سیفەته خواستراوانه لەرێی بۆمانەوه گواستراوەتەوه نەوەکانی، ئینجا بەتێپەڕبونی چەندین ملیۆن ساڵ سەرجەم ئەو سیفەته بچوکانەی له ژینگەکەوه سەریان هەڵداوه بونەته مایەی پەیدا بونی چەندین سیفەتی دیکەی باڵاتر و، ئافەریده سەرەتاییەکەیان کردۆته زیندەوەرێکی باڵاو چاکتر، ئەو فراژوبونەی سیفەتەکان؛ بەهۆی کارتێکردنی ژینگەو باڵابون زیندەوەرەکەی گەیاندۆته ئاستێکی بەرز که مرۆڤه.

## بنچینەکانی بیردۆزه

١- ئەم بیردۆزه متمانه دەکاته سەر چەند دیاردەیەك که لەسەردەمی (داروین)دا بینراوه وەکو به بەرد بوەکان، که چەند چینێکیان له زەوی دۆزیوەتەوه ئاسەواری هەندێ زیندەوەری سەرەتایی تێدا بوه، چینەکانی سەرەوەتر ئاسەواری هەندێ زیندەوەری پەرەسەندوتری تێدا بوه. جا داروینیش بەم پێودانگه وتی: (ئەم زیندەوەره پەرەسەندوانه له ئەنجامی پەیدابون و باڵابونی زیندەوەره سەرەتاییەکانەوه هاتونەته دی).

٢- هەروەها متمانه لەسەر ئەو بنەمایەش که دەکات لەسەردەمی داروین دا زانراو بوه، ئەویش پێکچونی شێوەی کۆرپەی زیندەوەرەکانه له قۆناغەکانی یەکەمدا. کەوا دەگەیەنێ نەژادی هەمو زیندەوەرەکان یەك بوبێ وەك چۆن کۆرپەکان وەکو یەکن، پاشان وەك چۆن لەمنداڵدانی زیندەوەرەکان پەرەسەندن رودەدا ئاوەها لەسەر زەویدا پەرەیان سەندوه.

٣- هەروەها متمانه دەکاته سەر ئەو کوێره ریخۆڵەیەش که لەمرۆڤدا هەیەو بەئەرکی خۆی هەڵناسێ، ئەرکەکەشی بریتیه له یارمەتیدانی هەرسکردنی روەکەکان. که له مەیموندا ئەرکی خۆی جێبەجێ دەکات. ئەم کوێره ریخۆڵەیه وادەگەینێ ئاسەوارێکی مەیمون بێ و پەرەی نەسەندبێ.

## لێکدانەوەی داروین بۆ کرداری پەرەسەندن

١- هەڵبژاردنی سروشتی: هۆکارەکانی تونا کردن بە ئەرکی لەناو بردنی بونەوەرە لاوازو بێ هێزەکانو هێشتنەوەی بەهێزەکان هەڵدەستێ. ئەم دیاردەیەشیان بە یاسای (مانەوەی بەهێزتران) ناودێر کردوە. بونەوەری بەهێزو ساغ سیفەتە بەهێزەکانی بۆ نەوەکانی دەگوازێتەوە، ئەم سیفەتە بەهێزانە لەگەڵ رۆیینی رۆژگار سیفەتێکی تازەو نوێ پێکدێنێ ئەوەش (پەیدا بونە)و وا لە بونەوەرەکە دەکات بەرەو بونەوەرێکی بالاتری ببات، ئیدی بەم جۆرە پەرەسەندنەکە بەردەوام دەبێ ئەوەش پێی دەڵێن بالا بون.

٢- هەڵبژاردنی رەگەزی: ئەوەیە کە مێینەو نێرینە ئارەزو دەکەن بەهێزترینو چاکترین هاوسەر هەڵبژێرن، ئەمەش دەبێتە سیفەتی گواستنەوەی چاکترینو تونا بونی سیفەتی گیانەوەری لاوازو لەجەر، چونکە ئارەزوی زاوزێ لە نێوانیاندا نیە.

٣- هەر کاتێك سیفەتێك دروست بو، ئەوا لە زۆربوندا دەبێتە بۆماوە.

## داڕوخانی ئەو بنچینانەی بیردۆزەکەی پێ دامەزراوە

١- زانستی بەردینەکان تا ئێستا کەمایەسی هەیەو بەکامی خۆی نەگەیشتوەو خۆ کەسیش نەبوە هەمو چینەکانی زەویو ژێرەوەی چیاو دەریاکانی سۆراغ کردبێو کاری لەکار تەواو بوبێ، ئینجا شتێکی نەدۆزیبێتەوە ناسازی بەندەکانی دیدەوەریەکە بێ.

گریمان بەندەکانی ئەم زانستە شتێکی سەلمێنراوو جێگیرە، بەلام بونی بونەوەری سەرەتاییو پاشان پەرەسەندو بەلگە نیە بۆ پەرەسەندنی زیندەوەران لەبونەوەری ئاست نزم بەرەو ئاست بەرز. بەلکو تەنها بەلگەیە بۆ تەرتیبی ئەم بونەوەرانە لە کاتی گونجانی ژینگەدا بۆ بونیان، جا ئەم بونە لە هەر شێوەیەکدا بێت. جا ئەگەر لە سەردەمی داروینیدا بەپێی بەردینەکان تەمەنی کۆنترین مرۆڤ شەشسەد هەزار ساڵ بێ، ئەوا دۆزینەوە زانستیە نوێیەکانی ئاسەوارناسی تەمەنی مرۆڤی بە دە ملیۆن ساڵ مەزەندە کردوە.

ئایە ئەمە بەلگە نیە کە ئاسەوارناسی زانستێکی گۆڕاوو ناجێگیرەو بەلگەی نێجگاری بەدەستەوە نادا؟

ڕەنگە سبەینێ ڕاستی وا بدۆزرێتەوە زۆر جیا بێ لەگەڵ ئەوەی بە ئەلیای بوین!

دکتۆر مصطفی شاکر سەلیم توانجێکی لەسەر پەرتوکی (مرۆڤ لە ئاوێنەدا) دەربارەی مرۆڤی (نیاندرتال) نوسیوە کە هەوادارانی بیردۆزی داروین پێیان وایە یەکەمین مرۆڤە لە مەیمون یا لە گۆریلاوە پەرەی سەندوە. دکتۆر مصطفی مرۆڤی نیاندرتال بە سیفەتە سروشتیە سەرەکیەکان وەسف دەکاتو دەڵێ: مێشکێکی قەبارە گەورەتر لە قەبارەی مێشکی مرۆڤی هاوچەرخ، کەللەیەکی پانو گەورە. تا دەڵێ: زنجیرەی بەردینەکان زنجیرەیەکی پچڕاوەو بە نەدۆزراوەکانیش دەڵێن: (ئەڵقە بزرەکان).

دکتۆر (سوریال) لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (ترەکانی بۆچونی داروین) دەڵێ:

١-ئەڵقە بزرەکان لەنێوان چینەکانی ژیانەوەران کەمایەسی هەیە، نەك لە نێوان مرۆڤو لە مرۆڤ خوارتر، هیچ ئەڵقەیەك لەنێوان زیندەوەرە سەرەتاییە تاك خانەکانو زیندەوەرە فرەخانەکاندا نیە، هەروەها لەنێوان زیندەوەرە شلکەکانو جومگەدارەکان. هەروەها لە نێوان زیندەوەرە بێ بڕبڕەکانو، لە نێوان ماسیو زیندەوەرە وشکاوییەکان، لە نێوان زیندەوەری وشکاویو پەڕەکەدارو باڵندەکانداو، لە نێوان خشۆكو پێرۆکاندا.. لە نێوان ئەوانەدا هیچیان نیە، کە ئەمن لێرەدا بەڕیزبەندی دەرکەوتنیان لە سەردەمە جیاجیاکانی جیۆلۆژیدا هێناومەتەوە.

دکتۆر (جەمالەددینی فەندی) مامۆستای فەلەکناسیە لە کۆلیژی زانستی زانکۆی قاهیرە دەڵێ: یەکێك لەو بەڵگانەی بەرپەرچی دیدەوەریەکەی داروین دەداتەوە ئەوەیە تەمەنی زەوی بە مەزەندەی فەلەکناسو سروشتناسان لە سێ بلیۆن ساڵ تێپەڕ ناکات. کەچی بەپێی مەزەندەی ژیانەوەر ناسان ئەو ماوەیەی لە چەرخە دێرینەکانی ژیانەوە تا پەرەسەندنی زیندەوەرانی سەر زەوی دەبێ پتر لە حەفت بلیۆن ساڵ بێ بە واتایەکی دی تەمەنی زەوی دەبێ دە بلیۆن ساڵ بێ واتە دو هێندەی تەمەنی خۆر.

٢- هاوشێوەیی کۆرپەی زیندەوەران ئەمەشیان هەڵەیەکی ناقۆڵایە کە زانایان تێی کەوتون، لەبەر ئەوەی ئەو کات ئامێری گەورە کردنو وردبین هێندە پێشکەوتو نەبوە تا هەرچی وردەکاری بچوکی جیاوازی نێوان کۆرپەی زیندەوەران هەیە لە روی دروست بونو ئاوێتە کردنو ڕێکخستنندا دەربخات. ئەمە جگە لەو شێواندنەی

زانای ئەڵمانی (ئارنست هیگل) لەو وێنانەی بۆ هاوشێوەیی کۆرپەکانی کردوە. چونکە دوای ئەو ڕەخنانەی لە لایەن کۆرپەناسان ئاراستەی کرا رایگەیاند بەناچاری لەسەدا هەشتی وێنەی هاوشێوەکانی بە خۆی تەواو کردوە لەبەر ئەو کەمایەسیەی لە وەرگرتنی وێنەکاندا هەبوە.

٣- هەرچی ریخۆڵە کوێرەشە کە دەڵێن پاشماوەی پەرەسەندنی لە مەیمونە، هیچ بەڵگەیەکی تێدا نیە مرۆڤ لە مەیمونەوە پەرەی ستاندبێ. بەڵکو هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە پشتاوپشت لە باپیرانی بۆی ماوەتەوە، متمانەیان کردۆتە سەر خۆراکی روەکیو یارمەتی هەرسکردنی خۆراکە روەکیەکانی داوە. زانستیش لە پێشکەوتن دایەو هەررۆژەو شتێکی شاراوەو تازەترمان بۆ دەدۆزێتەوە.

جا ئەگەر نێرەموکی سیفەتێکی بونەوەرە سەرەتایەکانی دنیا بێو (نێرو مێ)یش خاسیەتێکی بونەوەرە بالآ بوەکان بێ، ئەوا مەمك نیشانەی مێینەیە، کەچی فیلی نێرینە وەکو مرۆڤ مەمکی هەیەو، نێرینەی سمدارەکانیش وەکو ئەسپو کەر مەمکیان نیە مەگەر وەکو داکانەکانیان. ئەدی چۆن ئاسەواری نێرەموکی لە مرۆڤدا ماوە، کەچی لەو خوارتر تێیدا نەماوە، کەچی داروینیش پێی وایە مرۆڤ لە خۆی لە خوارتر پەرەی سەندوە؟!.

## داڕوخانی لێکدانەوەکەی داروین بۆ کرداری پەرەسەندن

١- داروین دەڵێ: ڕێساو یاسایەك هەیە کار بۆ لەناو بردنی بونەوەرە زندوەکان دەکات تا لە ئەنجامدا تەنها بەهێزترو چاکترینیان دەمێنێتەوە ئەویش سیفەتەکانی بۆ وەچەکانی جێ دەهێڵێو سیفەتە بەهێزەکان کەڵەکە دەبن تا دەبێتە زیندەوەرێکی نوێ.

ڕاستە، سیستەمو یاسایەك هەیە کار بۆ لەناو بردنی بەهێزو بێ هێزی بونەوەرە زندوەکان بکات چونکە خودا مردنی لەسەر هەمو زیندەوەرێك نوسیوە، بەڵام هەمبەری ئەوە سیستەمێکی تر هەیە کە هاوژینێتی نێوان ژینگەو بونەوەرە، چونکە خودا ژیانی بۆ بونەوەرەکە نوسیوەو هۆکاری بۆ فەراهەم هێناوە، بۆ وێنە خۆرو دەریاو باوبارانو روەكو کێشندەی زەویو زۆری هۆکاری دیکەشی فەراهەم هێناوە یارمەتی مانەوەی ژیانی مرۆڤو زیندەوەری تر دەدەن.

ئەگەر بەتەنها تەماشای هۆکارەکانی تونا بون بکرێ‌و چاو لە ئاست هۆکارەکانی مانەوە بنوقێنرێ کەلێن دەکەوێتە بیر کردنەوە، چونکە ئەگەر ڕێسایەك بۆ تونابون‌و لەناوچون هەبێ ڕێسایەکیش هەیە یارمەتی مانەوە بدات، هەر یەك لەم دو ڕێسایە ڕۆڵی تایبەتی خۆی دەبینێ.

ئەگەر بارودۆخی سروشتی وەکو: باوو بروسك‌و گەرمی‌و ئاوو رەشەباو شتی تریش توانای شێواندنی بونەوەرو خاپورکردنی دروستبونەکەی بکات وەکو کوێر کردنی چاوو روخاندنی خانو، ئەوا ژیری هەڵیناگرێ ئەو بارودۆخە سرو مردەیەی سروشت چاوێك بۆ کوێر پەیدا بکات یان خانوێکی ناتەواو چاکاتەوە.

ژیری هەڵیدەگرێ ئەو بارودۆخە سروشتیە بۆ نانەوەی خاپورو پەشێوی لە باربێ، بەڵام هەڵیناگرێ بۆ لێکدانەوەو کردنە مایەی پەیدا بونی ئەو بونەوەرە دانسقەو شێوە شۆخ‌و دروستبونە ڕێکوپێك‌و گونجاوو پوختەیە لە باربێ، هەر ئەندامێکی ئەو بونەوەرە زندوانە بەوپەڕی لێزانی‌و شیرازەیەکی پتەوو دانستە شێوەرێژراوەو بەش‌و پارچەکانی بە دانایی‌و کارزانیەکی لە ئەندازە بەدەرو سەراسیمەکار تێکچنراوەو هەماهەنگی ئەرك‌و کارەکانیشی لەگەل ئەرك‌و کاری دیکەدا لە ترۆپی داهێنان دایە.

ئەم شیرازە سەلارو کەمەندکێشە قەت ناکرێ‌و زۆر نابەجێیە گەر بگوترێ بارودۆخی بێسەروبەرو هەڕەمەك فەراهەمی هێنابێ.

جەمالەددینی ئەفغانی لە پەرتوکەکەیدا بە ناوی (وەڵامدانەوەیەك بۆ رۆژگاریەکان) لە پاش مشتومڕێکی درێژدا دەڵێ: (من لێیان دەپرسم ئاخۆ چۆن هەر پارچەیەك لەو پارچانە لەمەبەستی پارچەکانی دی ئاگادار بوە کە لەگەڵ یەکتر جودان‌و، بەچ میکانیزمێك پارچەکانی تر تێگەیون مەبەستی پارچەکە چیە؟. یاخۆ کام پەرلەمان‌و ئەنجومەنی پیران دانیشتنی بۆ دانسقەیی پێکنەرەکانی جیهانی ئاوەها پێکەڵو سەراسیمەکار گێڕاوە. ئەو پارچانەی لەنێو هێلکەی چۆلەکەدان چۆنیان زانی پێویستە لە شێوەی باڵندەیەك بتروکێن‌و دانوکە بخۆن‌و بۆ ئەم مەبەستەش دەنوك‌و سیکڵدانەیان هەبێ؟.

ئەو ڕێبیرەی داروین کە دەڵێ (مانەوە بۆ چاکتر) ژینی مرۆڤایەتی وێران کرد، چونکە هەردی بۆ هەمو ستەمکارێکی تاك‌و حکومەت هەموار کرد پاساوی ستەم‌و شەڕو زەفتکاریەکانی بەوە بداتەوە کە پیادەی یەك لە یاساکانی ڕێخت دەکات‌و

دوره لە ناپەسەندکاری رەوشتی. چونکە داروین گوتەنی (مانەوە بۆ چاکتر). ئەم گوتەیەش ناقۆلاترین پاساو رەوشتی بە بزاوتی ئیستعمار بەخشی.

٢- هەرچی (هەڵبژاردنی سروشت)یشە کە بریتیە لە ئارەزوکردنی جوتبونی تاکە بەهێزەکانو لەناوچونو نەمانی تاکە لاوازو بێ هێزەکانو مانەوەی بەهێزترینیان، بەڵگە نیە بۆ رودانو بەرپا بونی پەرەسەندن. بەڵکو ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە لەهەمان چەشن دا گۆڕانکاری رودەداتو بەهێزەکان دەمێننەوەو بێ هێزەکان لەنێو دەچن. بەڵام گەر بگوترێ پەرەسەندن لە بونەوەرێك رودەدات ئەوا دەبێتە مایەی ساردبونەوەیەکی زایەندی چونکە هۆگری نێوان نێرو مێ راستەوانە لەگەڵ دوریو جیاوازی شێوەی نێوانیان دەگۆڕێ، ئەوە قسەی (دوێر زانسکی)یە کە یەکێکە لە ناودارترین پسپۆرەکانی جیۆلۆجی جۆری، لە ساڵی ١٩٥٨ دا یەك سەدە لە دوای داروین دەڵێ:

جیاوازی شێوە ئارەزوی جوتبون لە یەکتری لاواز دەکات. ئارەزوی جوتبون راستەوانە لەگەڵ شێوەو جۆرە جیاوازەکان لاواز دەبێ. ئەوەش راست نیە کە سیفەتە چاکمەندەکان لە رێی بۆماوەییەوە لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی تر بگوازرێتەوە.

بۆ وێنە: ئاسنگەرێکی ماسولکە بەهێز، هێزی ماسولکەکانی ناگوازرێتەوە بۆ وەچەکانی، هەروەها زانایەکی فرەزان لە رێی بۆماوەییەوە زانستەکەی بۆ منداڵەکانی ناگوازرێتەوە.

٣- هەروەها کە دەڵێن: هەندێ خاسیەتو سیفەتی دوچار هەن پەیدا دەبنو پاشان لە رێی بۆماوەوە دەگوازرێنەوە، ئەوا زانستی بۆماوەزانی رەفزی دەکاتەوە. چونکە هەر سیفەتێك لە نەسلەوە نەبێو مۆرکێکی ئەوی بەسەرەوە نەبێ ئەوا سیفەتێکی عاریزەیەو بە بۆماوە ناگوازرێتەوە نەوەکان. مامۆستا (نبیل جورج) یەکێکە لە جێباوەڕانی ئەم زانستە دەڵێ: هەڵبژاردنی سروشتی بۆ پاساودانی بۆچونی پەیدا بون -یان بۆ چونی پەرەسەندن- سودی نیە چونکە پاساوی ئەوە دەداتەوە کە ناچاکان تونا دەبنو خاسیەتی چاکیش لە نێوان تاکاندا بە بۆماوە جێ دەمێنێ. ئەوانەی باوەڕیشیان بە پازدان هەیە مەبەستیان لەوە دێ ئەگەر ئەوەی چاوی نەبێ لە ناکاوو بەهۆی تیشکەوە چاوی بۆ پەیدا بێ.

پسپۆران سەلماندویانە تیشکی ئیکس ( X) ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان دەگۆڕێ، بەڵام کاریگەری تیشکەکە بۆ گۆڕینی ئەوەیە کە هەیە بۆ پەیدا کردنی

ئەوەی کە نیە. ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی مەیمون لە هی مرۆڤ جیاوازە. تیشکیش تەنها کار لەو کرۆمۆسۆمانەی هەیە دەکات، چ جای ئەم تیشکەی کە ئاوەزو ژیری و دەرککردنی نیە، بێت ژیریەك بۆ مرۆڤ پەیدا بکات و لە مەیمون و زیندەوەرانی تری جیا بکاتەوە.

تیشك کە کار لە کرۆمۆسۆم دەکات نزیکترە لەوەی بیشێوێنێ نەك چاکی بکات. وەکو تیشکی ئەتۆمی.

دیدەوەریەکەی داروین جگە لەوەی تەکولۆی بۆماوەزانیە ئەزمونیش هەڵیدەوەشێنێتەوە. ئەوەتانێ جولەکەو موسڵمانان دوای ئەو هەمو ساڵ و رۆژگارە منداڵەکانیان خەتەنە دەکەن کەچی نەماندی منداڵەکان بەخەتەنە کراوی لە دایك بن. بەم جۆرە هەرچەندی زانست پێشکەوێ گەندەڵی و پڕوپوچی ئەم دیدەوەریەی داروین پتر وەدەردەکەوێ.

## واقیعي بەرچاو پاڵپشتي ئەم بیردۆزە ناکات :

١- ئەگەر ئەو بیردۆزە راست بوایە ئەوا زۆر زیندەوەرو مرۆڤ نەك هەر بە رێگەی جوتبون بەڵکو بەرێگەی پەرەسەندنیش دەهاتنە ئارا. ئەگەر پەرەسەندنیش پێویستی بە رۆژگارێکی درێژ خایەن هەبوایە دەبوایە هەر ساڵەی یان هەر دە ساڵ و سەد ساڵێك چەندین مەیمون ببنە ئادەمیزاد.

٢- گریمان باروڕوخی سروشتی و هەڵبژاردنی سروشتی، مەیمونێکی پەرەستاندو -بۆ نمونە کردیە- پیاو، بەڵام قەت ناکرێ هەر ئەم باروڕوخە بڕیاریشی دابێ ژنێکیشی بۆ ئەم پیاوە بڕیار دابێ تا زاوزێ بکەن و هاوسەنگی مانەوەی خۆیان بپارێزن.

٣- توانستی خۆ گونجاندن کە لە زیندەوەران دەیبینین وەکو قومقومۆکە کە بەپێی شوێنەکەی رەنگی خۆی دەگۆڕێ، ئەم توانستە لەگەڵ ئافەریدە بونی زیندەوەران دروست دەبێ و هەندێ زیندەوەر هەیەتی و نی هەندێکی تر هێند کەمە رەنگە هەر نەبێ، هەمو زیندەوەرێکیش ئەم توانستەی سنورداره. جا توانستی خۆگونجاندن سیفەتێکی ناوەکی مرۆڤە، نەك سیفەتێکی پەرەسەندنی بێ و ژینگە پەیدای کردبێ، وەکو هەوادارانی دیدەوەریەکە وادەڵێن. گەر وا بوایە ئەوا خۆگونجاندنەکە خۆی بەسەر بەردو خۆڵ و بێ گیانی تریش دا دەسەپاند.

٤- بۆق دەتوانێ لە ئاوو وشکانیدا بژیێت، بەڵام مرۆڤ تەنها لە وشکانی، باڵندەش بەبێ ئامێر دەتوانێ بفڕێو بەخێرایش هەڵبەزێو دابەزێ، کەچی مرۆڤ ناتوانێ. کەپوی سەگ گەلێ هەستیارترە لە کەپوی مرۆڤ. ئایا کەپوی سەگ لە هی مرۆڤ پەرەسەندوترن؟ ئایا لە هەندێ بواردا بۆقو باڵندە لە مرۆڤ پەرەسەندوترن؟ هەروەها چاوی وشترو ئەسپو کەر لە رۆژو شەودا وەکو یەك دەبینێ، کەچی چاوی مرۆڤ بەشەو نابینێ، چاوی بازیش لە چاوی مرۆڤ تیژترە، ئایا کەرو باز لە عرۆڤ پەرەسەندوترن؟ خۆ ئەگەر خود گوزەرانی بکەینە پێودانی پەرەسەندوتری ئەوا دەبێ روەك لە مرۆڤو هەمو زیندەوەرێك پەرەسەندوتر بێ چونکە خۆراکی خۆیو خەڵکی سازدەکات بێئەوەی ئاتاجی کەس بێ؟.

خۆ ئەگەر زەبەلاحی بکەینە پێودان ئەوا دەبێ فیلو دیناسورەکان لە مرۆڤ زۆر پەرەسەندوتر بن!.

## هەڵوێستی سروشتناسان لە ئاست ئەم بیردۆزەدا

١- ئەوانەی پشتیوانیان لەم دیدەوەریە کردوە لە ئەنجامی پشتیوانی کردنی ئەو بیرە ئازادە بوە کە کلێسا دژایەتی لەگەڵدا بەرپا کردبو، هەروەها بۆ پاڵپشتی ئەم شەرە؛ سروشتناسان لە روی قەشەکانی کلێسەو هزرەکانیان جارپیان کێشا، بەتایبەتی لە گەرمە گەرمەکەیدا.

٢- نەیارانی دیدەوەریەکەش داوای بەڵگەیەکی لەسەر راستێتی (هەڵبژاردنی سروشت)ی گۆرانی جۆرەکان، بەتایبەتی جۆری مرۆڤ بەرهەست دەکەن. ئەم نەیارانەی داوای بەڵگە دەکەن ژمارەو بەرانگژیەکەیان لە نەیارانی لاهوتی ئەوروپا کەمتر نیە.

ئەمانەی خوارەوەش راوبۆچونی چەندین زانای نەیارن کە مامۆستا (ئیبراهیم حەوڕانی) هێناونی: (زانایان بۆچونی (داروین)یان نەسەلماندو بە ناڕاستیان داناو تەشەریان لێ گرتوە، هەرچەندە زانیویانە ماوەی بیست ساڵیشی پێوە خەریك بوە).

یەکێك لەو بلیمەتانە (دنشل)ی فرەزانو یەکێکی تریان (دالاس)ە دەڵێ: (پەرەسەندن بە رێگای هەڵبژاردنی سروشتی لە ئاست مرۆڤدا قەت راست نیەو دەبێ بگوترێ یەکسەر ئەفرێندراوە).

یەکێکی تریان مامۆستا (فەرخۆ)یەو دەڵێ: لە واقیعدا بۆمان دەرکەوتوە جیاوازیەکی گەلێ فرەوان لە نێوان مرۆڤو مەیموندا هەیە، قەت ناکرێ بڵێین مرۆڤ لە رەچەڵەکی مەیمونو ئاژەڵی ترەو واچاکترە ئەم جۆرە وتانە نەبێژین. (میفێرت)ی زاناش دوای ئەوەی لە چەندین هەقیقەتی زیندەوەرانی کۆڵیوەتەوە دەڵێ: (بۆچونی داروین ناکرێ پشتیوانی لێ بکرێو وەك بۆچونی منداڵانە).

(فۆن بسکۆن) دوای ئەوەی لەگەڵ (فەرخۆ)دا یەکالا کاریەکی مرۆڤو مەیمونی کردو بەراوردی کردن دەڵێ: جیاوازی نێوان ئەو دوانە گەلێ دورو زۆرە..

هەروەها (ئەگاسین)ی فرەزانیش لە (رسالە)یەکدا کە لە بارەی بنەرەتی مرۆڤەوە لە کۆڕی زانستی (فیکتۆریە)دا خوێندیەوە –کورتەکەی ئەمەیە– دەڵێ: بۆچونی داروین هەڵەیەکە لەسەر بنچینەیەکی گەندەڵ بنیات نراوەو شێوازەکەشی هیچ پەیوەندی بە زانستەوە نیەو بێ هودەیە.

هەروەها (هیکسلی)ی فرەزانو هاورێبازی (نازانم)و برادەری داروین دەڵێ: (بەپێی ئەو زانیاریانەی لە لامانە قەت نەسەلماوە جۆرێك لە جۆرەکانی روەك یان ئاژەڵ بە هەڵبژاردنی سروشتی یان بە هەڵبژاردنی دروستکاری پەیدا بوبێ)

(تەندەل)یش هەروەکو (هیگل) دەڵێ: (بێگومان ئەوانەی بیروباوەڕیان بە بالا بون هەیە، نازانن ئەمە لە ئەنجامی چەند پێشینەیەکی نەزانراو بوە. منیش پێم وایە بوار نەماوە دەبێ بۆچونەکەی داروین بگۆڕدرێ).

زۆر زانای دیش ئەم دیدەوەریە رەت دەکەنەوە وەکو مامۆستا (ڤالتۆنی) راگری کۆلیژی نوژداری زانکۆی (مونیلین) کە لەوێدا مامۆستای کۆرپەلەزانیە، هەروەها وەکو مامۆستا (کاتر ڤاج)ی بەڕێوەبەری مۆزەخانەی مێژوی سروشتی لە پاریس، کە دەڵێ: (ئێمە نازانین زیندەوەرە جۆراوجۆرەکان چۆن پەیدا بون، بەلام دەزانین بەرتوانی گۆڕان نینو، دڵنیاین داروینو لامارك رێسای راستەقینەی پەیدابونیان نەدۆزیوەتەوە).

## بیردۆزە نەك حەقیقەت

لە ئەنجامی ئەو هەمو هەراو هەنگامەیەی بە وتەی داروینیان گوتوە (دیدەوەری پەرەسەندن)، چونکو زانایان جیاوازیەکی زۆر لە نێوان بیردۆزو حەقیقەت یان یاسادا دەکەن. لە فەرهەنگی زانایاندا هەمو بیردۆزێك ئەگەری راستو درۆی هەیە، بەڵام حەقیقەت یان یاسا لە هیچ روێکەوە ئەگەری ناڕاستو هەڵە هەڵناگرێ.

## ئەدی بۆچی ئاوها بڵاوبۆوە ؟

هۆی بڵاو بونەوەی ئەم بیردۆزە ئەوە بو کاتی خۆی دینە گۆڕاو و ناهەقەکەی دیانان لەسەر دەستی کۆمەڵێك لە نەوەکانی خۆیان وەدەر خراو شڕو پەشێوو شێواویەکەیان بە خەڵك رادەگەیاند. پێشکەوتنی زانستیو زانیاریش جێپەنجەی دیارو کاریگەری فرەوانی هەبو لە دەرخستنی ناهەقیەکەی. لە ئەنجامی ئەوەشدا شەڕێکی توشو گەرم پەیدا بوو بوە مایەی سەرگەرد بونی هەزاران زانای سروشتناس. لەو شەڕە گەرمەدا هەر لایەك جۆرە چەکی خۆی ئاراستە کرد.

لەبەر ئەوە سروشتناسان بیردۆزەکەیان کردە چەکێكو لە دژی دینی خۆیانو هەر دینێکی دیکەش کە لە میانەی داگیر کردنی هەرێمو وڵاتاندا روبەڕوی دەبونەوە بەکاریان دەهێنا، چونکە پێیان وابو راستو هەقیقەتە. هەروەها وەکو تۆڵەستاندنەوەیەك لەو دینە شێواوەی ببوە کۆسپو هەڵەموتی تۆژینەوە زانستیەکان.

داگیرکەرانیش بۆ ئەوەی ئاسانتر دەست بەسەر گەلان دابگرن بیردۆزەکەیان وەکو کەرەستەیەك بەکار هێناوە. بەم جۆرە داگیرکەران ئەم بیردۆزەیان بەسەر سیستەمی خوێندنی داگیر کراوان سەپاندو لە بەرگێکی زانستیدا پێشکەشیان کرد تا وا بئاخننە مێشکی خوێندکاران؛ ناکۆکیو تەكو لۆیەکی فرەوان لە نێوان زانستو ئاین دا هەیەو تا دینی پێ شپرزەکەنو خەڵك بێبڕوا بکەن. خوێنەریش هێندەی بەسە کە بزانێ بەسەبارەتی ئەم بیردۆزە بو هەزاران نەوەی ئەم ئیسلامە لە چەندین هەرێمی ئیسلامیدا لە دین هەڵگەڕانەوە.

بەو مەبەستە بو داگیرکەران بیردۆزەکەیان لەسەر سیستەمی خوێندنی (عەدەنی) سەپاند تا لە خوێندنگا سەرەتاییەکاندا بخوێندرێ، کەچی یاسای ئەمریکا هەر لە ساڵی (١٩٣٥)ەوە قەدەغەی کردوە لە خوێندگاکانی بخوێندرێ.

بەلام ئەوروپا دوای ئەوەی شەڕەکەی بردەوەو بەسەر دوژمنەکەیدا (دینی شێواو) زاڵ بو، ئەنجا پاشگەز بۆوەو رایگەیاند ئەو بیردۆزەی چەندین ساڵ لەو مەیدانەدا بۆ پشتیوانی خۆی بەکاری هێناوە: هەقیقەتێکی زانستی نیە. بەڵکو زانست هەرچەندی پێشکەوێت ناتەواوی ئەم دیدەوەریە والاتر دەبێ.

## قورئان و بیردۆزی داروین

کە قورئان لە بارەی هەقیقەتە دێرینەکان دەدوێ خەڵك لەسەری پێویستە گوێڕادێرو ئەژنەوای بن ﴿ وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا ﴾ سورەتی ئەعراف/٢٠٤.

چونکە لە لایەن خودایەکە زانیاری بە هەمو شتێك هەیەو زانستی مرۆڤ لە ئاستیدا هەر بونی نیە ﴿ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ سورەتی بەقەرە/٢١٦.

کە خۆی بونەوەری ئەفراندبێ چۆن ئافەریدە بونەکەی نازانێ؟! ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ سورەتی مولك/١٤.

خەڵك چۆن رەوا بە خۆی دەدات لە بارەی بنەڕەتی دروست بونی خۆیان قسە بکەن، لە کاتێکدا ئەم کردارەیان نەدیوە ﴿ مَا أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ ﴾ سورەتی کەهف/٥١. مادەم نەیاندیتوە کەواتە لەم بوارەدا کەم دەپێکن‌و هەتەریان زۆرە.

## بەراوەژوی بیردۆزەکە راستە

ئەوەی خودای زاناو لێزان‌و ئافەریدگاری مرۆڤ دەیڵێ‌و بە ئێمەی راگەیاندوە زۆر جیاوازە لەوەی ئەو نەفام‌و گەمژانە دەیڵێن. خودا پێمان رادەگەیەنێ مرۆڤی یەکسەرو بەساغی ئەفراندوەو، بەر لەوەی ئافەرەیدەشی بکات بە فریشتانی راگەیاندوە ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ سورەتی بەقەرە/٣٠، واتە: پەروەردگارت بە فریشتانی فەرمو: من جێگرەوەیەك لەسەر زەویدا ئافەریدە دەکەم.

ئەو ماددەیەشی پێ گوتوین کە پێی ئافەریدە کردوە.. لە ئاوو خۆڵ (قوڕ)ی دروست کردوە ﴿ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ﴾ سورەتی حەج/٥.

ئەبا موسای ئەشعەری خوا لێی رازی بێت دەڵێ ژنەوتی پێغەمبەر ﷺ بوم فەرموی: ((**إن الله تبارك وتعالى خلق آدم من قبضة قبضها من جميع الأرض، فجاء بنوا آدم على قدر الأرض، منهم الأحمر والأبيض والأسود، وبين ذلك، والسهل والحزن، والخبيث والطيب**)) أخرجه الترمذي وأبوداود.

واتە: خودای پیرۆزو بەرز بۆ ئافەریدە کردنی ئادەم مشتێك خۆڵی لە سەرجەم خۆڵەکانی سەر زەوی هێناو لەمەوە دروستی کرد، ئادەمیزادانیش بە گوێرەی جۆری خۆڵەکان جۆراو جۆر بون، هەیانە سورکەڵەو سپیکەڵەیەو هەیانە رەشە، هەشیانە لەنێوان ئەم رەنگانەدایە، هەیانە روح سوکەو هەیانە خەفەتبار، هەیانە پیسو هەیانە پاك. ئاویش رەگەزێکی ئافەریدە کردنی مرۆڤە ﴿ وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِّن مَّاءٍ ﴾ سورەتی نور/٤٥، مرۆڤ ئاوو خۆڵە ﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ﴾ سورەتی ئەنعام/٢.

خودا بە دەستی خۆی شێوەرێژی کردوە ﴿ قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴾ سورەتی ص/٧٥، واتە: خودا بە ئیبلیسی گوت: بۆچی سوژدەت بۆ ئادەم نەبرد کە بە هەردو دەستانی خۆم ئافەریدەم کردوە؟

پاشان ئەم قورەش بۆ قورێکی وشکەهەڵاو گۆڕاوە کە ئەگەر تەقەی لێ بهێندرێ وەکو سواڵەت دەنگ دەداتەوە ﴿ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ ﴾ سورەتی رەحمان/١٤.

لەسەرەتاشدا بە هەڵۆڵی ئافەریدەی کرد. ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((**لما صورة الله آدم في الجنة تركه ما شاء الله أن يتركه، فجعل إبليس يطيف به وينظر إليه، فلما رآه أجوف عرف انه خلق لا يتماسك**)) أخرجه مسلم في صحيحه واتە: خودا کە ئادەمی دروست کرد، تا ویستی لە بەهەشتێ ئازادی کرد، ئەنجا ئیبلیس لە دەورەیدا دەسوڕایەوە وتەماشای دەکرد، کە دیتی هەناو بۆشە زانی خۆی زۆر ناگرێ.

پاشان خودای گەورە لـە روحـی خـۆی فـوی بـەم قـوڕەدا کـردو ژیـانـی تێـدا شناوە، پاشان بو بە ئافەریدەیەکی ژنەواو بینـاو قسـەکەرو ژیرمـەندو هۆشمـەند، خودای گەورە فەرمانی بە فریشتان کرد کاتێ روحی تێـدا فـو دەکاتو ژیـانی تـێ دەشنەوێ ئەو کات سوژدەی بۆ ببەن ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾ سورەتی ص/٧٢.

خودا ئەو شوێنەشی پێ گوتوین کە تێیـدا ئافـەریدەی کـردوە کـە بەهەشتە ﴿وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾ سورەتی بەقەرە/٣٥.

هەر ئەفراوە یەکسەر توانیوێتی قسە بکاتو لـە قسـان بگـات ﴿ وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاءِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ۞ قَالُوا سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ۞ قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَائِهِمْ﴾ سورەتی بەقەرە/٣١-٣٣، واتە: خودا هەمو ناوەکانی فێری ئادەم کرد، پاشان بە فریشتەکانی نیشانداو فـەرموی ئەگـەر راست دەکەن ناوی ئەوانەم پێ بڵێن گوتیان: پاکی بۆ تۆ خودایە، جگە لەوەی تـۆ فێرت کردویـن چیـتر نـازانین، خودایـە تـۆ زانـاو لـێزانی. خـودا فـەرموی: ئـادەم! ناوەکانیان پێ بڵێ.

لـە فەرمودەیـەکدا ئـەبا هورەیـرە خـوا لێـی رازی بێـت لـە پێغەمبـەر ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمویەتی: ((**لما خلق الله آدم ونفخ فيه الروح عطس، فقال: الحمد لله بإذنه، فقال له ربه: يرحمك الله يا آدم، إذهب الى أولئك النفر من الملائكة -الى ملأ منهم جلوس- فقل السلام عليكم، قالوا عليكم السلام ورحمة الله..**)) أخرجه الترمذي واتە: کە خودا ئادەمی ئافەریدە کـردو فـوی پێـدا کرد، پژمی. گوتی سوپاس بۆ خـودا، بـە ودمـی خـودا سوپاسـی وت. خـودا پێـی فەرمو: خودا میهرەوەرت بکات، برۆ لای ئەو کۆمەڵـە فریشـتەی دانیشـتون پێیـان بڵێ سڵاوتان پێشکەش، ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان سڵاوو میهرت پێشکەش.

یەکـەم مرۆڤـە ئـادەم بـوە بـاوکی هـەمو مرۆڤـان بـوە، تەنانـەت ئـافرەتیش لەوییەوە ئەفرینراوە ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ

﴿وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ سورەتی نیساو/١، واتە: خەڵكینە لەو خودایە بترسن كە ئێوەی لە یەك كەس ئەفراندوەو ژنەكەشی هەر لەو دروست كردوە.

وا نەبێ خودا مرۆڤی بە كەمایەسی دروست كردبێ‌و پاشان -هەروەكو هەوادارانی دیدەوەری پەرەسەندن دەڵێن- تەواوی كردبێ، بەڵكو خودا بە رەخسكاوی ئەفراندویێتی‌و پاشان هێدی هێدی لە كەم‌و كورتی داوە. بوخاری‌و موسلیمی پێشەوا لە صەحیحەكانیاندا دەڵێن، ئەبا هورەیرە خوا لیی رازی بێت دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**خلق الله آدم** ﵇ **وطوله ستون ذراعا**)) واتە: خودا كە ئادەمی ئافەریدە كرد درێژیەكەی شەست باڵ بو.

بڕوادارانیش بە رەخسكاوی‌و لەسەر شێوەی ئادەم دەچنە بەهەشتێ. تەواوكەری ئەو فەرمودەی رابورد بەمجۆرەیە: ((**فكل من يدخل الجنة على صورة آدم**)) پاشان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**فلم يزل ينقص الخلق حتى الآن**)) واتە: تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ ئافەریدان هەر لە كەمایەسی دەدەن.

ئەوانەی هێنامانەوە چەند تیشكێك بون قورئان لە بارەی ئافەریدە كردنی مرۆڤەوە پەخشی كردوە، ئێمەش هەمو دەقەكانی قورئان‌و سوننەتمان نەهێناوە، دەنا ئاخاوتنێكی فرەوان‌و دورو درێژ هەڵدەگرێ.

قورئان‌و سوننەت نەخشێكی رون‌و رۆشنی بێ گەردو دور لە خەیاڵمان دەداتێ. ئەوەی ئیسلام دەیڵێ نەژادو بنەڕەتێكی شكۆدارەو مرۆڤ شانازی پێوە دەكات بەڵام هەوادارانی دیدەوەری پەرەسەندن مرۆڤ بۆ ئەو مەیمونە دەگەڕێننەوە كە لە مشك یان لە سیسركە باڵا بوەو پەرەی سەندوە. مرۆڤ ئەگەر بۆ ئەم بنەوانە بگەڕێندرێتەوە، شەرم لە خۆی دەكێشێتەوە.

مێژونوسان مرۆڤێك بە منداڵان دەخوێنن، كە مرۆڤێكی دەڕندەی نافامیدەو هیچ نەزان بوەو لە ئاژەڵان فێربوە، زۆر تاوانكاری لە ئاست بنەڕەت‌و نەژادی رەسەنی مرۆڤی تێدایە.

# ئیتر

کاتی هاتوه بێدار ببینەوەو بەرەو ئامێزی دینەکەمان بگەڕێینەوە کە خاوەن پەڕتوکێکی پەروەردگاریەو هەرچی بڕستو فەڕو پیتە تێیدایە (خواسو باسی گەلانی پێشوو پاشوی تێدایەو دادوەری نێوان ئێوەشی تێدایە. قسەکانی گاڵتە جاڕ نیە. ئەو کەسەش ڕێنوێنی لە ڕێگەی تر بخوازێ خودا گومڕای دەکات )

کاتی هاتوە وازبێنینو دەستبەرداری زادی هزری بزڕکاوو گەنیو بین کە لەو بوارانە دەدوێ خودا قسەی بڕی تێدا کردوەو ودمی کەسی نەداوە قسەی تێدا بکات.

پێویستە واز لەو هزرە بەزیوە بێنین کە پەلەپەلمان لێ دەکات هەرچی شتێکی تازەو نوێ بێ، بەبێ بیرکردنەوەو تێڕوانین وەری بگرین، بەجۆرێك کار لە کار بترازێو پاشان وەخۆبێینەوەو بڵێین هەڵە بو!.

سەرنج بدە ئەو هەمو ئاسەوارە دزێوو وێرانەی بە سەبارەتی ئەوە کەوتۆتەوە کە هەندێ لە موسوڵمانان بیردۆزەکەیان قبوڵ کردوە.

## ئەو ئاسەوارانەی لە ئەنجامی وەرگرتنی ئەم بیردۆزە کەوتونەتەوە

وەحیدوددین خان دەڵێ: (کۆمەڵێك زانای موسوڵمان (بیردۆزی بالابونو پەرەسەندن)یان قبوڵ کرد لەبەر ئەوەی زانایانی خۆرئاوا ئەو پەڕی قەناعەتی خۆیان بۆ دیدەوەریەکە ڕاگەیاندو بانگەشەی ڕاستێتیان دەکرد؛ گوایە دوای توێژینەوەو سەرنجکاری گەیشتونەتە ئەو ئەنجامە زانا ئیسلامیەکانیش بە پێی ئەم بنەمایە پەنایان بردە بەر لێکدانەوەیەکی نوێی ئیسلامی بۆ ئەم بابەتەو، بە پێویستیان زانی بەرگێکی تازەی بۆ بدورن، هەڵسان بە بەرگێکی ئیسلامی پۆشتەیان کرد.

بەلام بەرگێکی شڕو شیتاڵو شرۆڵو بێبەش لەو روحە ئیسلامیەی کە لەگەڵ تێکهەڵکێشانەکەدا پەڕەپەڕەم بوە).

پاشان رونی کردۆتەوە ئەم بیردۆزە چۆن چۆنی لەگەل دەقە قورئانیە بڕەکان تێکگیر دەبن کە هیچ ودمی ئیجتهادی تێدا نیە. لەم بارەوە دەڵێ: (دیدەوەری پەیدا بونو بالا بون ئامانجی ئەوەیە هزری پەرەسەندن بە شێوەیەکی بەردەوام بچەسپێنێ بە جۆرێك لە کۆتاییدا ژیان بگاتە ئەوپەڕی).

بەم پێودانگە بێ دەبێ ژیواری ناهەموار لە رابوردوەوە روی دابێ نەك لە داهاتو. ئەم بیردۆزە خۆشحاڵە بە ژیانی هەمیشەیی نێو بەهەشت. بەڵام ژینی هەمیشەیی دۆزەخ هەڵناگرێ، بۆیەکا ئەو زانا موسڵمانانەی دیدەوەریەکەیان قبوڵ کردبو، دەیانگوت: دۆزەخ جێگای سزادان نیە بەڵکو مەڵبەندێکی پەروەردەو مشتوماڵبونە چونکە ژیان لە کاروانی بەرەنگار بونەوەی کۆسپو گرفتان بەردەوامە، بەڵام ئەوانەی بە سەبارەتی گوناهان نەیانتوانیوە لەو کاروانە بەردەوام بن؛ بە ژیواری دژواری نێو دۆزەخدا تێدەپەڕن تا لە ژیانی ئایندەیان لە کاروان بەردەوام بن. هەروەها ئەوانە یاساکانی موڵکداری ئیسلامیش بە (چەند حوکمێکی کاتی هەژمێر دەکەنو دەڵێن ئەم یاسایانە لەگەڵ بیردۆزی پەرەسەندنی کۆمەڵ ناگونجێ)[41].

*** *** ***

---

[41] الإسلام يتحدى وحيد الدين خان/ لاپەرە١٩.

# ڕێـــخـــۆشەکـــی

ئەگەر لەبەر ئەو ئاپۆرە گومانو ئەرێو نەرێیانە نەبێ کە بە بابەتی بیروباوەڕ گلاوە وتۆژەرەوە ناچار دەکات شیان بکاتەوە، ئەوا هێندە درێژەمان بە بابەتی یەکەم نەدەدا.

ئێستاش کاتی ئەوەیە باس لە بابەتی دوەم بکەین کە بە -باوەڕی من- گرنگترین بابەتی ئەو مەیدانەو کرۆکی ئەو توێژینەوەیە.

پێشتریش ئەوەمان رون کردەوە قورئان بۆ چەسپاندنی ئەم هەقیقەتە گەورەیە دو ڕێی گرتۆتە بەر.

یەکەم: باس کردنی ئەو دانسقەییەی لە ئافەریدەکراوانی خوداو رونکردنەوەی ئەو سەراسیمەکارانەی لە بونەوەردا هەن ئاماژەن بۆ گەورەیی خودا.

دوەم: باس کردنی خودا بە راستەوخۆیی: باسی زاتو ناوو سیفەتەکانی، باسی بەخششو بونەوەرەکانی، ئێمەش بە پشتیوانی خودا هەوڵدەدەین بەدرێژی لەو بارەوە بدوێین.

## یەکەم: نیشانەکانی گەردون

قورئانی پیرۆز بەرەو بەرینایی ئاسمان تەیمان پێ دەکات. دەمانباتە کەنارەکانی دنیا. لە ئاست گوڵانی باخچەدا هەڵوەستەمان پێ دەکات، بۆ ئەستێرەو خولگەکان بەرزمان دەکاتەوە.. لە هەمو ئەوانەدا سۆمای چاومان گوشاد دەکات. تواناو دەسەڵاتی خودامان پێ ئاشنا دەکات رازو نهێنیەکانی ئافەریدەکردنمان بۆ واڵا دەکات. حیکمەتو مەبەستی ئەفراندنو پەیدابونمان پێ دەڵێ. هەروەها ئەو بەخششە گەورەو گرنگانەمان بۆ رون دەکاتەوە کە خودا بە ئێمەو بونەوەری ئەم گەردونەی بەخشیوە.

ئەم بابەتانە لە سورەتە درێژو کورتەکانی قورئاندا بە فرەوانی باس کراوە.. ئەوجا هێند بە ئابوتابە نەفس لە بەریدا هەسترادێرو گوێ ئەژنەوای دەبێو چێژی لێ دەکاتو هەستو دەرون دەخرۆشێنێ.

ئەمن ئەو شتانەم زۆر خوێندۆتەوە کە زانستو زانایان پێی گەیشتون. لە زۆر بواری ژیانو ئافەریدانیان کۆڵیوەتەوەو رازەکانیان دەرخستوەو ناوازەو

دانستەییان راڤواندوەو ئامازەیان پێ کردوە تا بونی خودای پێ بسەلمێنن... لە خوێندنەوەکەمدا قەت وەکو قورئانم نەدیوە ئاوها بە جوانی پــڕ لـە زانیـاری و، بـە ئاراستەی رێکوپێکو وردەکاری دەرەنجامەکانی باس کردبێ.. بەڵێ، چـۆن وانابـێ کە قورئان هەنارددراوی خودای داناو کار لەجێ بێ.. پاکو بێگەردی بۆ خودا.

## ئیشی خودا لە گەردوندا

خوێنەری بەڕێز! وەرە با پێکەوە لەگەڵ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز گەشـتێك بە نێو کەنارەکانی گەردوندا بکـەین ... سـەرنج بـدە ئـەو دانەتۆیـەی کـە لـە ژێـر خاکدا هەڵەتۆقێو رەگوریشاڵەکانی بۆ ناخی خۆڵ پەل دەهاوێژێ، ئەو دانـە تۆیـە مردوە ژیانی تێ دەشنەوێو قـەدو گـەڵاو گوڵـی هێنـد جـوانو ناسـك دەر دەکـات بۆنو بەرامەکەی دنیا پڕ دەکات. بەروبومێك دەبەخشێ مرۆڤو ئاژەڵی پێ خــەنی دەبێ.

سەرنج بدە ئەو بەیانیە جوانەی لە نێو تاریکی شەودا هێدی هێدی دێتە ئارا، سەرنجدە سرەوتو خامۆشی شەوان، سەرنجدە هاموشۆی شـەوو رۆژان: ﴿إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنَ الْحَيِّ ذَلِكُمُ اللَّهُ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ ۞ فَالِقُ الإِصْبَاحِ وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَنًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ۞﴾ سورەتی ئەنعام/٩٥-٩٦.

سەرنج بدە هەورو بزانە قورئان چۆن چۆنی باسی دەکاتو خوای گـەورە بـە چ رێوشوێنێك سازی دەکات، سەرنج بدە ئـەو تـەزرە دڵڕفێنـەو بزانـە خـودا چۆن دایدەبارێنێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَنْ مَنْ يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالأَبْصَارِ﴾ سورەتی نـور/٤٣، واتـە: ئەدی نەتبینیوە خودا چۆن پەلە هەوران دەنـێرێو لەگـەڵ یـەکیان کۆ دەکاتـەوە پاشان بارانی لێ دەبارێنێ، هەروەها پەلـە هـەوری زل زلی وەکـو چیـا لـە ئاسمان دادەبەزێنێ کە تەزرەی لێ دادەبارێ. خودا کێی بوێ توشی دەکاتو کێشی بوێـت

نیی لا دەدات. روناکی بروسکی ئەو پەلە هەورانە هێند بەهێزە خەریکە چاوی تەماشاکەرانی کوێر بکات.

خودا باسی سێبەر دەکاتو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ۞ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ۞﴾ سورەتی فورقان/٤٥-٤٦، واتە: تەماشات نەکردوە خودا چۆن ئەو سێبەرەی هەر لەسپێدەوە تا تاوهەڵاتێ درێژ کردۆتەوە پاشان کە خۆر هەڵدێت سێبەری هەمو شتێك وەدیار دەکەوێت، ئەگەر خودا بیویستبا ئەم دۆخەی چەسپاو دەکرد. پاشان خودا رۆژی بۆ سێبەر کردۆتە رێبەر بەسای ئەمەوە سێبەر کورتو درێژ دەبێ.

سەرنجدە گەردانی ژیانو ژینەوەرو شەوو رۆژان ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ۞ تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَنْ تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ۞﴾ سورەتی ئالی عیمران/٢٦-٢٧، واتە: بلێ: پەروەردگار! تۆ خاوەنو پادشای، کێت مەبەست بێ مولکی پێ دەبەخشی، کێشت مەبەست بێ مولکی لێ دەسەنیەوە، کێت بوێ شکۆمەندی دەکەی، کێشت بوێ زەبونی دەکەی، خێرو بێر بەدەست تۆیە، توانات بەسەر هەمو شتێکدایە. شەو لە رۆژو رۆژ لە شەو هەڵدەکێشی، زندو لە مردوو مردو لە زندو دەردێنی کێت مەبەست بێ بێئەندازە پێی دەبەخشی.

قورئان دەستمان دەگرێو بەو دیاردەو دیمەنە دڵبەرانەمان ئاشنا دەکات کە تەنها ئەوەندە نیە تواناو دەسەڵاتو زانستو تەگبیر کاری خودامان پێ بناسێنێ.. بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مەبەست ئامانجەشمان پێ دەڵێ کە ئەم بونەوەرو گەردونەی لە پێناودا ئەفرێنراوە.

خودای گەورە ئەم گەردونەی لە پێناو مرۆڤدا ئافەریدە کردوە ﴿خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ﴾ واشی ئەفراندوە لەگەل سروشتو شیرازەی ئێمە

بسازیو بەرژەوەندیەکانمان بێنێتە دی. قورئان کە دەڵێ تەسخیر مەبەستی لەوە دێ کە باسمان کرد.

هەر هێندەش ناکا هەواڵێکی رەقو روتمان پێ بداو هیچی تر، بەڵکو لە ئاست ئەو تەسخیرەشدا هەڵوەستەمان لە بەرانبەر هەمو پارچەو بەشەکانی ئەم گەردونەدا پێ دەکات کە خودا ئەفراندونی.

پێمان دەڵێ:

ئەستێرەکان ئەفرێنراون تا لە تاریکێیی ئاو و وشکانیدا بەهۆیانەوە رێنوێن ببن.

﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ سورەتی ئەنعام/٩٧.

واتە: خودا ئەو خودایەیە ئەستێرەی بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە تا بە هۆیەوە لە تاریکێیی ئاوو وشکانیدا رێنوێن ببن. ئێمە ئەو نیشانەو ئاماژانەمان بۆ گەلیفامیدە هەڵناوە.

ئەرزو ئاسمانو بارانو کەشتیو روبارو مانگو شەوو رۆژ و... هەمو ئەو ئافەریدەکراوانە لەبەر خاتری ئێمەی مرۆڤو بەرژەوەندیەکانمان ئەفرێنراون ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الأَنْهَارَ ۞ وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ۞ وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ﴾ سورەتی ئیبراهیم/٣٢-٣٤، واتە: هەر خودا ئەرزو ئاسمانەکانی دروست کردوە، لە ئاسماندا بارانی ناردوەو بە هۆیەوە جۆرەها بەروبوم شین دەبن تا ببنە بژێوی ئێوە، کەشتی بۆ ئێوە رام کردوە کە لەسەر ئاودا بە ودمی خودا بگەڕێت. روبارەکانی بۆ ئێوە رام کردوە سودی لێ وەرگرن، خۆرو هەیڤی بەردەوام بۆ تەسخیر کردون، شەوو رۆژی بۆ تەسخیر کردون، هەرچی گەرەکتانە پێی بەخشیون.

## بەخششەکانی خودا

قورئان پێی ناساندین ئەم گەردونە خودا ئافەریدەی کردوەو لە پێناو ئێمەدا تەسخیری کردوەو لەگەڵ سروشتی ئێمەش دەگونجێ. بە ئەندازەیەکی وا فەراهەمی هێناوە ژیانی مرۆڤی پێ چاك بێ، قورئان لە فەرمودەکانیدا ڕێیەك رادەنوێنێ تا مرۆڤ سوپاسگوزاری پەروەردگاری ببێ، چونکە مرۆڤ سروشتی وایە یەکێك چاکەی لەگەڵدا بکات خۆشی دەوێت: ﴿هَلْ جَزَاءُ الإِحْسَانِ إِلاَّ الإِحْسَانُ﴾ سورەتی رەحمان/٦٠، واتە: پاداشتی چاکە هەر چاکەیە.

هەر بۆیە قورئان پڕیەتی لە باسکردنی ئەو بەخشش و بەهرانەی خودا بە مرۆڤی بەخشیوە ﴿قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ﴾ سورەتی مولك/٢٣ واتە: بڵێ خودا ئێوەی پەیدا کردوەو بیستن و دیتن و فامی بە ئێوە بەخشیوە بەڵام ئێوە کەمێکتان سوپاسگوزارن.

باسی ئەو بەخششانەی کردوە کە بە گەردون و دەروبەرمانی بەخشیوە ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ مَهْداً وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلاً لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ۝ وَالَّذِي نَزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً كَذَلِكَ تُخْرَجُونَ ۝ وَالَّذِي خَلَقَ الأَزْوَاجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْفُلْكِ وَالأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ ۝ لِتَسْتَوُوا عَلَى ظُهُورِهِ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ﴾ سورەتی زوخروف/١٠-١٣، واتە: خودا ئەو خودایەیە زەوی بۆ ئێوە راخستوەو چەندین کەنارو ڕێو ڕەوازی بۆ فەراهەم هێناون تا ڕێنوێن بن، هەروەها لە ئاسماندا بارانی بە ئەندازە ناردوەو خاکی مردوی ژیاندۆتەوەو گژو گیای لێ شین کردوە. ئێوەش ئاوەها زندو دەکرێنەوە، هەروەها هەمو جوتێکی دروست کردوە، کەشتی و وڵاخی بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە تا سواریان بن و لەسەر پشتیاندا ئارام بگرن پاشان ئەگەر سواریان بون یادی بەخشش و میهرەبخشیەکانی خودا بکەن.

ڕۆژو مانگی بە چەشنێك ئەفراندوە لەگەڵ بەرژەوەندیو قازانجمان بسازێ ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾ سورەتی یونس/٥، واتە: خـودا ئـەو خودایەیـە ڕۆژی درەوشـاندۆتەوە کە روناکی پەخش دەکات هەروەها مانگی درەخشاندۆتەوە کە روناکی دەداتـەوە، هەروەها چەند قۆناغێکیشی بۆ مانگ داناوە تاوەکو ئێوە بتوانن کاتەکانی خۆتـان پێ بزانن.

کە ئـەو هـەمو مـەڕو وڵـسـاتو چێڵو مانگـاو پـەزو هەسپو هێسترو کـەرو ئاژەڵەی دروست کردوە هەر هەموی بۆ سودو بەهرەی ئێمەیـەو لەگـەڵ سروشـتو ڕێختـی ئێمـەدا دەگونجـێ ﴿وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ۝ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ۝ وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ الْأَنْفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ ۝ وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ۝﴾ سـورەتی نـەحل/٥-٨، واتە: وشترو مەڕو ڕەشەوڵاغی بۆ ئێوە ئافەریدە کردوە، بە هۆی فـەروەو خـوریو پێستەکانیانەوە خۆتان لە سەرما گەرم دادەپۆشنو چەندین سودی تریـان هەیـەو لەبـەرو بومیـان دەخـۆن. هێـواران لـە لەوەڕگـە بـەرەو مۆڵگـە دەیانهێننـەوەو یـا بەیانیان بـەرەو لـەوەڕ دەیانبـەن دیمـەنی جوانـیو ئـارایش بـۆ ئێـوە دەبەخشن. هەروەها بارو بنەو بارگەتان هەڵدەگرن بۆ شوێنی ئاوەها کە زۆر بە شەکەتی نەبێ نەیدەگەیشتنێ. هەروەها ئەسپو هێسترو کەری بۆ ئێوە ئافەریدە کردوە تا ئێـوە هەم سواری بنو هەم ببێتە مایەی جوانی بـۆ ئێـوە خـودا شـتی تـری وا ئافـەریدە دەکات ئێوە نەیزانن.

دەریاکانیش هەر لە پێناو ئێمەداو بۆ وەدیهاتنی بـەرژەوەندیمان ئـەفرێنراون ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ سـورەتی نەحل/١٤.

تەنانەت هەنگیش، خودای گەورە خاسیەتێکی تایبەتی پێ بەخشیوەو بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ ئافەریدەی کردوە ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ۞ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِّلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ۞﴾ سورەتی نەحل/٦٨-٦٩، واتە: خودا سروشی بۆ هەنگ کرد: لە شاخ و داخ و دارو درەختو ئەو باخچەو مێرگانەی مرۆڤ دروستی دەکات شانەو هێلانە هەڵببەستە. پاشان هەر میوەیەکی حەزت لێیە بیخۆ، ئەنجا ئەو رێگایانە بگرە بەر کە خودا پێی ئاشنا کردوی بە هاسانی بگەرێیەوە بێئەوەی رێ بزر کەی. لە زگی ئەم هەنگەدا جۆرەها رەنگ هەنگوین دێتە دەرەوە کە شیفایە بۆ خەڵك. ئەم هەنگە گەلێ نیشانەی بۆ هۆشمەندان تێدایە.

## قورئانی پیرۆز هانمان دەدات لە رێی نیشانەو بەڵگەکانی گەردونەوە خودا بناسین و فرەزان و پێشەوا ناودارەکانیش ئەمەیان پەسەند کردوە

قورئان بەندەکانی خودا هان دەدات تا لەو نیشانەو بەڵگانە بروانن و تێی رامێنن کە خودا خستوتیە ئەم گەردونە، وەکو ئەرز، ئاسمان، هەرچی لە نێوانیان دایەو تێیایاندا هەیە. تێرامانو سەرنجدانی کردوتە یەکێك لەو یادوەریانەی کە بڕواداراانی پێ بەهرەوەر دەبێ.

بەڕاستی شادمانو هەست هەڵوەستەم لەمەڕ ئەو ناوەی هەندێ لە هاوچەرخان بۆ ئەم رێوشوێنە دایاننـاوەو پێیان وتوە (یاسای گەشتو رامان) ئەوەش لەبەر ئەوەیە قورئان بە ئەندازەیەکی زۆر هانی لەسەر داوە. رەنگە گەشتو رامان بەرهەستەکی بن.

ئەو گەشتو رامانو سەرنجدانە رەنگە بە (پێ) بێ، یان بە گواستنەوە بێ لە شارێکەوە بۆ شارێکی دی، رەنگە بە چاو بێ، یان بە بیرو هۆشو هزر بێ.

لە قورئاندا فەرمانێکی گشتی دەرکراوە ﴿قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ واتە: رامێنن لەو ئەرزو ئاسمانەو ئەو شتانەی لە نێوانیاندا هەیە.

هەروەها بە تایبەتیش هاتوە ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ﴾ واتە: با مرۆڤ تەماشا

بکات لە چ ئەفرێنراوە. ﴿فَلْيَنظُرِ الإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ﴾ واتـە: با مـرۆڤ بڕوانێتـە خۆراکیو تێی رامێنێ.

زانایـان ئێستاشـی لەگـەڵ دابـێ سـەمەرەکانی دروسـتکراوەکانی خــودا رون دەکەنەوەو خۆیانو خەڵکیشی پـێ ئامۆژدەکـەن. ئێمـەش کـەمێك لـەو هەقیقەتـە سەراسیمەکارانە دەخەینە رو کە زانایان پێی گەییون.

حەز دەکەم خوێنەر پتر لـە وتەکـەی موسـا پێغەمبـەر ﷺ رامێنێ کـە بـە فیرعەونی گـوت: ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ سـورەتی طاها/٥٠، واتە: خودا هــەمو رەخسـاویەکی بـە ئـەفراوەکانی بەخشـیوە، هـەروەها هەرچی بەرژەوەندی بێ بۆی رێنوێنی کردوە.

## لەشی ژینەوەران چۆن و لە ط پێکهاتوە؟

دکتـۆر (یوسـف عزالدیـن) یەکێکـە لــە توێــژەرەوە هاوچەرخــەکان دەڵــێ: (زۆربەی روەكو زیندەوەران لـە ژمارەیـەکی زۆر زەبـەلاحی ئـەو (یەکـە) بچوکانـە پێکدێن کە ئێمە پێیان دەڵێن خانە... وەکو بالاخانەیەکن لـە کۆمەڵـە خشـتێکی تێکچڕژاو پێکهاتبن).

## بۆچی خانەکان بەردەوام دابەش دەبن

خانەکانی لەشی ئێمەو گیانەوەرانی دیکەش بەردەوام لە دابەشبون دان. ئەم دابەشبونەش رەنگە لەبەر گەشەی لەش بێ یا لەبەر مـردنو لـەناوچونی خانـەکان بێ کە بەزۆر هۆ رودەدەن. هەر خانەیەك لە ماددەیەکی سەرەکی پێك دێـت پێـی دەڵێن (پرۆتۆپلازم)، خانــە چـەندین شـتی تێدایـە هــەر یەکـەیان ئـەرکو فـەرمانی دیاریکراوی خۆی هەیە. لەناو ئەو حەشـاماتەدا چـەند تەنۆلکەیـەکی بچـوك هــەنو هەڵگری سیفەتە بۆماوەییەکانن پێیان دەڵێن (کرۆمۆسۆم). هەر جۆرێك لــە روەكو گیانەوەران ژمارەیەکی دیاریکراوی تێدایە.

بۆ وێنە ژمارەی ئەو کرۆمۆسۆمانەی لە پشیلەدا هەن جیــاوازە کـە لەسـەگو فیلو کەروێشكو روەکی گێزەرو پاقلەدا هەن.

لە هەرخانەیەکی مرۆڤدا (٤٦)چلو شەش کرۆمۆسۆم هەیە، هەر خانەیەکیش بۆ دو خانە دابەش دەبێ، هەر یەك لە دو خانە پەیدابوەکە (دابەش بوەکە) دەبــێ ئەوانیش هەمان ژمارە کرۆمۆسۆمیان تێدا بێ کە چل وشەشە.

ئەگەر ئەم ژمارە کرۆمۆسۆمە کەمو زیاد بێ ئەوا مرۆڤ نابێتە مرۆڤ. وەکو گوتم خانەکانیش بەردەوام لە دابەشبوندان... ئەم دابەشبونە لە هەمو ساتێکی ژیاندا رو دەدات تەنانەت لە خەویشدا. ئێمە تا ئێستا نازانین هەقیقەتی ئەو هێزە زاڵە چیە کە تەگبیری ئەم دابەشبونە دەکات. زانست هەر ئەوەندەی پێکراوە وەسفی هەنگاوەکانی ئەم کردارە بکات، ئەوەش دەکرێ لە ژێر میکرۆسکۆبێکی ئاسایی یان ئەلکترۆنی ببینرێ. هەڵبەت میکرۆسکۆبە ئەلکترۆنیەکەش بە چەندین جار توانای گەورە کردنی لە ئاساییەکە زۆرترە.

## بۆچی خانەکانی جوتبون لە ئەوانی تر جیاوازن ؟

هەر خانەیەکی دابەشبوی لەشی مرۆڤ مەرجە هەمان ژمارە کرۆمۆسۆمی تێدا بێ کە چلو شەشن، تەنها دو جۆرە خانە نەبێ ئەوانیش خانەکانی جوتبونن. واتە سپێرمی نێرینەو هێلکۆکەی ئافرەت، کاتێ شانەخانەکانو خانەکانی جوتبون پێکدێنن، خانەی وا بەرهەم ناهێنێ ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی (٤٦) چلو شەش بێت بەڵکو نیوەی ئەم ژمارەیان تێدایە واتە هەر خانەیەکی جوتبونی نێرینەو مێینە تەنها (٢٣) بیستو سێ کرۆمۆسۆمی تێدایە.

بۆ پەیدا بونی یەکەم خانەی کۆرپە؛ دەبێ خانەی نێرینە (سپێرم) لەگەڵ خانەی مێینە (هێلکۆکە)دا ئاوێتە بێ ئەو کات پێی دەڵێن (خانەی پیتراو). تێیدا نێرینە خانەی خاوەن بیستو سێ کرۆمۆسۆم لەگەل مێینەخانەی خاوەن بیستو سێ کرۆمۆسۆم یەکدەگرنو خانەیەکی نوێی خاوەن چلو شەش کرۆمۆسۆم پێك دێنن. کە ژمارەی بنەڕەتی خانەکانی لەشی مرۆڤە.

ئەم خانە پیتراوەی چلو شەش کرۆمۆسۆمی تێدایە پەیدەرپەی دابەش دەبێو دەبێتە دوخانەو پاشان چوارو پاشان هەشت و.. بەم جۆرە تا دەبێتە کۆرپەیەکی رەخساوو لە زگی دایکی دەردەچێ، پاشان تا کامڵیش دەبێ هەر بە رێگای دابەشبونی خانەکانەو هەر خانەیەکیش خاوەنی (٤٦) کرۆمۆسۆم دەبێ، هەر وەکو جەستەی باوكو دایكو باپیرانو هەمو تاکێکی رەگەزی مرۆڤ خانەکانیان خاوەنی چلو شەش کرۆمۆسۆمن.

کە ژمارەی کرۆمۆسۆمی خانەکانی جوتبون نیوەی خانەکانی ترە بۆ ئەوەیە گەر ئاوێتە بێ بگەڕێتەوە ژمارەی بنەڕەتی.. ئەمە قەت ناکرێ لە ئەنجامی رێکەوتێکی کوێر بێ. بەڵکو دەبێ لە ئەنجامی نەخشەیەکی وردو لە خاوەن

هێزێکی بەرزەوە بێو زانیبێتی چ دەکات. لە هەمان کاتدا ناکرێ ئەزمونو ئەگەری هەڵەی تێدا بوبێ. چونکە لە کاتی دروست بوندا یەکجار هەڵەی تێ کەوێت ئەوا بەر لەوەی نەوەی دوەمی لێ بکەوێتەوە بونەوەرە زندوەکە لە ناو دەبات. کەواتە ئەم شیرازەیە دەبێ لە یەکەمین کۆرپەی سەر روی زەویەوە هەر وا بەرێکی بوبێ.

ئایە تەنها ئەم دیاردەیە بەس نیە بۆ سەلماندنی بونی خاوەن هێزێکی باڵاو تەگبیرکارو تەواناو دانا؟

## بۆچی خانەکانی مێشك دابەش نابن؟

یوسف عزالدین لەم بارەوە دەڵێ:

دەمارە خانەکان؛ مێشكو کۆئەندامە دەمارەکانی دی پێکدێنن. بە ئەزمونو شێمانەی راستو هەڵەش نەگەیشتینە ئەو رادەیەی بزانن نابێ دابەش بن. چونکە ئەگەر دابەش بوبان ئەوا کارەساتی تاسێنەری دەنایەوە.. ئەو سات خانەکانی مێشك نەیاندەتوانی کەسێتی مرۆڤ بپارێزنو هەرچی زانیاری نێو یادگە هەیە لە ماوەی چەند سەعاتێکدا رەش دەبۆوە.

کە مرۆڤو هەر گیانەوەرێکی دی لە دایك دەبێ تا دەمرێ ژمارەی خانەکانی مێشکی هەر ئەوەندەیەو یەك خانەش چیە بۆی زیاد نابێ. کەچی خرۆکە سورەکانی خوێن ئەوانیش هەر خانەن بەڵام لە ماوەی هەر سەد رۆژێکدا هەمویان لە ناو دەچنو خرۆکەی نوێ کە مۆخی ئێسك دروستیان دەکات جێگەی خرۆکە لە ناو چوەکان دەگرنەوە.

## نهێنی راددەداری هێزی ماسولکەکانی لەش

دکتۆر لەم بارەوە دەڵێ: بەهێزترین ماسولکەی لەشی مرۆڤو هەر گیانەوەرێکی دیکەی شیردەر، ماسولکەکانی منداڵدانی مێینەیە کە بە ئەرکی دەرهاویشتنی کۆرپەی نێو زگی دایك هەڵدەستێ. خۆ ئەگەر لە سەرەتای ئافەریدە بونی مرۆڤدا ئەم ماسولکەیە هێندە بە هێز نەبوایە ئەوا یەکەمین کۆرپەی ژین دنیای نەدەدیت.

لە بەهێزیدا لە دوای ماسولکەکانی منداڵدان ماسولکەکانی دڵو شەویلاگ دێن. ماسولکەکانی دڵ پێویستە ئاوەها بەهێز بن تا شەوو رۆژ بە درێژایی رەنگە سەد ساڵیش پتر بێ، بتوانن پاڵەپەستۆی نێو لولەکانی خوێن بکەن.

هەروەها ماسولکەکانی شەویلاگیش پێویستە بەو رادەیە بەهێز بن تا بتوانن ددانەکان وێك دادەن کە بە درێژایی تەمەن چەندین هەزار کیلۆ خواردن دەجوێت.

## بەرگری زیندەوەران لە دژی لەناوچون

دکتۆر یوسف دەڵێ سیفەتێکی گرنگ هەیەو هەمو بونەوەرێکی زندو لە نزمترینیانەوە تا بەرزترینیان تێیدا بەشدارن ئەویش توانای بەرگریکردنی هۆیەکانی لەناوبردنە، چونکە خودا ویستی وایە بمێننەوە.

ڤایرۆسی ئینفلۆوەنزا ناوە ناوە لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر خۆی دەگۆڕێ تا بەرگری لێکردنو لەناو بردنی ئەستەمتر بێت. مێروش نەوە بۆ نەوە لە دژی فەوتێنەرە کیمیاییەکان بەرگری پەیدا دەکات بۆ ئەوەی بەرگری توانابونی رەگەزی خۆی بکات. مرۆڤ لە کاتی شەڕەکاندا رێژەی لە دایکبونی زۆرتر بوە، هەروەکو تێبینی کراوە ئافرەت هەبوە لەبەر خواردنی حەبی منداڵ نەبون بۆ ماوەیەکی درێژ منداڵی نەبوە، بەڵام کاتێك لەبیری کردوەو چەند رۆژێك حەبەکەی نەخواردوە ئەوا زۆر جاران وا بوە چەند جمکێکی بوە، ئەمەش تا قەرەبوی ئەو کەمایەسیە بکاتەوە کە بەسەبارەتی حەبەکانەوە روی داوە.

مرۆڤ ئەگەر لەبەر هۆیەك گورچیلەیەکی لێ کراوە، ئەوا گورچیلەکەی تری قەبارەی گەورەتر دەبێو ئەرکی دو گورچیلان رادەپەڕێنێ.. وەك بڵێی لە لەشدا ئاوەزێك هەیە هەست بە کەمایەسیەکە دەکاتو خێرا قەرەبوی دەکاتەوە.

خودا خۆی بە تەنها ئەو توانا سەمەرەیەی بە ئافەریدان بەخشیوە کە هاوسەنگی لەناو چونیان رادەگرێ. هەروەها هەندێ هۆکاری بەرگریکردنی ئەوتۆی بە زیندەوەران بەخشیوە هیچی وای لە هی مرۆڤ کەمتر نیە وەکو دوپشكو مارو هەزارپێو زیندەوەری تر.

ئەم یاسایە سەرجەم بونەوەرە زندوەکان دەگرێتەوەو قەت رێی تێناچی بەرهەمی رێکەوتێکی کوێرو ئاهەڕای نێو تاریکی بێ. چونکە رێکەوت نابێتە دیاردەی یاسایەکی گشتیو سەرجەم بونەوەران ئەژنەوای بن.

# ڕێنوێنبونی هەنگ

ئیبنولقەییم[٤٢] لە (شفاء العليل /ل١٠١) لە بارەی ژینو ژیوارو ڕێنمونی هەنگدا دەڵێ: ڕێنمونی هەنگ یەکێکە لە سەمەرە هەرە جێسەرنجەکانی زیندەوەران. هەنگ لە نێوخۆدا فەرماندەو مشورخۆرێکیان هەیە لە هەمویان هەراشترو شۆخو شەنگو جوانترە.

مێینەکانیان لە سەرەتای بەهاردا گەرا دادەنێنو زۆربەیان مێ دەردەچن. نێرینەکانیشیان دەکوژن تەنها کەمۆکەکیان نەبێ کە لە دەوری شاژن دەمێننەوە. نێرینەکان نەکار دەکەنو نە شتیش پەیدا دەکەن.

پاشان داکانەکان وەچەکانیان لە لای شاژن کۆدەکەنەوە، شاژنیش نزیکترین ڕێگایان پێ دەگرێتە بەرو دەیانباتە نزیکترین باخچەو گوڵزارو ئەوەندەی بیانەوێ هەڵیدەمژن. کە بۆ شانەکەیان دەگەڕێنەوە شاژن لەبەر دەروازەدا دەوەستێو لێناگەڕێ نێرینەکان یان هەنگی لایدەو نامۆ وەژورێ بکەون، ئینجا خۆی پاشی هەمویان دەچێتە ژورەوە، پاشان هەنگەکان هەر یەکەیان دەچێتە جێی خۆی، شاژنیش وەك بیەوێ فێریان بکات، دەست بە ئیش دەکات. هەنگەکان دەبینن وا شاژن ئیش دەکات، ئەوانیش سەرجەمیان دەستبەکار دەبن. ئەنجا شاژن ئیش جێ دەهێڵێو دەچێتە کەنارێك تەماشایان دەکات کە خەریکی کۆکردنەوەی خۆشەو شیلەی گوڵو و گژوگیان تا بیکەن بە مۆم.

پاشان هەنگەکان دەبنە چەند گروپێك، گروپی نێرینە دەبێتە هاودەمی شاژنو نە ئیش دەکەنو نە لێی جیا دەبنەوە، گروپێکی تریان مۆم ئامادە دەکەن. مۆمیش خڵتەو نیشتوی هەنگوینەو شیرنابیەکی وەك هەنجیری هەیە. بێ لەوە بایەخێکی زۆریش بە خاوێنی هەنگوینەکە دەدەنو لە میزو شتی دیکە پاکی دەکەنەوە. گروپێکیان بە ئەرکی دروستکردنی شانە هەڵدەستێ. گروپێکیان بە ئەرکی ئاو هێنان هەڵدەستێ. گروپێکی تریان ناو شانەکە لە زبڵو شتی پیسو مردوی پۆرتکاو پاك دەکاتەوەو، ئەگەر هەنگێکی خەمساردو تەمبەڵ ببینن ئەوا پارچە پارچەی دەکەن و دەیکوژن نەبادا ئەوانی دیش توشی تەمبەڵی ببن.

---

[٤٢] باس لێوە کردنی ئیبنولقەییم ئاماژەمان پێ دەدات پێشینە چاکەکان بایەخیان بەوە داوە لە بونەوەر رابمێنن. هەروەها بەڵگەیە بۆ ئەوەی زانایانی ئیسلام تێبینی زۆر وردیان داوە، بەڵام ناگەیەنێ هەڵەیان نەکردبێ. پێشان وایان زانیوە شاهەنگ نێرینەیە، کەچی دەرکەوتوە مێینەیە.

هەنگەکان کە دەیانەوێ شانەیەك دروست بکەن، یەکەمین هەنگاو خانەو جێ دانیشتنێکی چوارگۆشەی وەك تەخت بۆ شاژن دروست دەکەن تا لەسەری دانیشێ، کۆمەڵە هەنگێکیش وەك بڵێی فەرماندەو راژەکارو دەمڕاستەکانی بن لە دەرێدا دەبن‌و قەت لێی جودا نابنەوە، خانەیەکی وەکو حەوزیشی لەبەردەمدا بۆ دروست دەکەن‌و تابکرێ پالاوتەترین هەنگینی تێدەکەن تا پڕ دەبێ، ئەم خانەیە دەبێتە خۆراکی شاژن‌و دەست‌و پێوەندەکەی.

پاشان دەست بە دروستکردنی شانە دەکەن کە خانەکانی هەموی وەکو کۆڵان‌و گەڕەکان لەسەر چەند هێڵێکی یەکسان بنیات دەنێن. هەنگەکان وەك بڵێی پەڕتوکی (ئیقلیدس)[42] یان خوێندبێتەوەو لەوێ فێری هەڵبژاردنی گونجاوترین شێوە بوبن کە خانەکانیان بە شەش گۆشەیی هەڵدەنێن. چونکە شانەکە دەبێ دو سیفەتی لێ بێتەجێ یەکەم توندوپوندی، دوەم فرەوانی.

بە تەنها شێوەی شەشگۆشەیی ئەگەر لە تەك یەك دابنرێن وەکو بەرداش شێوە بازنەیی وەردەگرن و، بە چەشنێك یەکانگیر دەبن هیچ کەلێنێکیان تێنەکەوێ‌و ببنە یەك چینی هێند توندو پوند دەرزیان بە بەیندا نەچێ.

ستایش بۆ ئەو خودایەی هەنگی فێر کردوە شانەکانیان بە توندو پوندییەکی وا دروست بکەن مرۆڤیش پێی نەکرێ. زانیویانە شانەیەکی وایان پێدەوێ دو سیفەتی هەبێ:

یەکەمیان: ئەوەیە گۆشەکانی هێندە تەنگو تریسك نەبێ لە کەڵك بکەوێت.

دوەمیان: بە شێوەیەکی وابێ ئەگەر تێکبەست بکرێن هیچ کەلەبەرو کەلێنێکی لێ پەیدا نەبێ‌و هیچ روبەرێکی لێ بە فیڕۆ نەڕوات. هەروەها زانیویانە تەنها شێوەی شەشگۆشەیی ئەم دو سیفەتەی لێ دێتە جێ. لەبەر ئەوەی شێوەی سێگۆشەو چوارگۆشە گەرچی کەلێن پەیدا ناکەن بەڵام گۆشەکانیان تەنگە، شێوەکانی دیش گەرچی گۆشەکانیان فرەوانە بەڵام کەلێن پەیدا دەکەن. بەڵام شەش گۆشە وا نیەو هەدرو سیفەتی لێ دێتە دی.

---

[42] ئیقلیدس: بیرکاریمەندێکی یۆنانی بوە و لەسەردەمی بەتلیمۆسی یەکەم زانستی ئەندازەی لە شاری ئەسکەندەریە خوێندوەو پرنسیپەکانی ئەندازەی روتەختی داناوە. لە سێیەم سەدەی بەر لە زایین ژیاوە. - وەرگێر لە مونجیدی راگواستۆتەوە -.

کارامەترین مرۆڤیش بێ، ناتوانێ بەبێ کەرەستەو ئامراز شانەیەکی شەشگۆشە بسازێنێ. کەچی هەنگ خودا وای فێر کردوە بەبێ ئامرازو راستە یان بێئەوەی نمونەیەکی لەبەرچاو بێ یەکسەر دروستی بکات.

پاکو پیرۆزی بۆ ئەو خودایەی هەنگی وا فێر کردوە بەهاسانی رێگەی لەوەڕگەو پەیدا کردنی خۆراك بگرێتەبەرو بێئەوەی رێ بزرکا لەوێدا بە ئارەزوی خۆی پاکترینو سافترن شیلە هەڵمژێ پاشان بگەڕێتەوە ناو شانەکەیو هەنگوینی فرە رەنگی وا هەڵڕژێنێ شیفای چەندین جۆرە نەخۆشی بدات. هەر هۆشمەندێك بیر بکاتەوە تێ دەگا مەزناتی ئەم خودایە چۆنە.

پاش ئەوەی شانەکەیان ساز دەکەن، بە زگی بەتاڵو برسی بە دەشتو شاخان وەردەبنو تێر تێر شیلەی گوڵو گەڵایان هەڵدەمژن.

خودای گەورە گەرمیەکی وای لە دەمی هەنگ فەراهەم هێناوە تامو چێژو خۆشیو شیرینی شیلەکە دەبەخشێتەوە.

پاشان هەڵی دەڕێژنەوە ناو خانەکان تا پڕ دەبن ئەنجا بە مۆمی پاڵاوتە سەری دەگرن. جا ئەگەر شانەکەیان پڕ هەنگوین کرد رودەکەنە جێیەکی دیو لەوێ بە هەمان هەنگاو شانەیەکی دی هەڵدەبەستن.

گەر هەواساردی کرد یان لەوەڕگەکەیان لە کاتی خۆی درەنگتر شین بو، یان نەیدەگەیشتنێ ئەوا لە شانەکەیان دەمێننەوەو هەنگوینی پەزمەندە کراوی خۆیان دەخۆنەوە.

رۆژانەش سەرگەرمی کۆکردنەوەو هەڵمژینی خۆشەو شیلەن، لەگەڵ گەردی بەیانیدا دەردەچنو هەر گروپەو کاری خۆی رادەپەڕێنێ، کە ئێوارەش دادێ بەرەو شانە دەگەڕێنەوە.

لە دەمی گەڕانەوەیاندا چەند دەروازەوانێك لەگەڵ یارمەتکارەکانیان لەبەر دەرگای شانە رادەوەستن. هەر هەنگێك بەر لەوەی بچێتەوە ژورەوە بۆنی دەکەنو دەیپشکنن، گەر بۆنێکی ناخۆش یان چڵکێکی پێوە نوسابێ ئەوا جودای دەکەنەوەو دەیخەنە لایەکو ناهێڵن بچێتە ژورێ. ئەوجا پاش ئەوەی سەرجەم هەنگەکان دەڕۆنەوە ژورێ؛ دەچنەوە لای هەنگە جودا کراوەکانو دیسان دەیان پشکنن ئەگەر یەکێکیان لە شتێکی بۆگەنو پیس گەوزابێ ئەوا دەیکەنە دوپارچەو دەیکوژن. بەڵام ئەگەر تاوانەکەی بچوك بێ ئەوا هەر لە دەرەوەی جێ دەهێڵن. دەروازەوانەکان هەمو ئێوارەیەك ئەرکیان بەو جۆرەیە.

شاژنیش مەگەر لەو کاتانەی حەز لە سەیران بکات دەنا زۆر ناچێتە دەرەوە. ئەو کاتیش بیەوێ بە رۆژ ماوەیەك لەگەڵ فەرماندەو راژەکارەکانی گەشتێك بۆ نێو گوڵو گوڵزاران دەکەنو پاشان دەگەڕێنەوە جێی خۆیان.

شاژن زۆر سەیرە! گەر هەنگەکان یان هەنگەوان یان راژەکارەکانی ئازارێکی بدەن، تورە دەبێو دەچێتە شوێنێکی دورو شانەکە جێ دەهێڵێ، هەنگەکانیش گشتیان بە دوایدا دەڕۆنو شانەکە چۆڵ دەکەن.

لەو بارەدا هەنگەوان لەوە دەترسێ هەنگەکان رەو بکەنو بچنە جێیەکی دیکە. بۆیە هونەر دەنوێنێ تا بگەڕێنەوە.. شاژن تورە دەبێو دەچێ لەسەر لکێکی زۆر بەرزی دارێك دەنیشێو هەنگەکانیش هەموی دەوری لێدەدەنو هەزارەزیلەیەکی وا پێکدێنن وەك بڵێی تۆپێکن. هەنگەوان بەم رەوشتە دەتوانێ شوێنی شاژن بدۆزێتەوە.

ئەنجا هەڵدەستێ رمێك یاخۆ قەمیشێکی درێژ دێنێ، دەستە گیایەکی پاكو بۆنخۆشی بەسەرێکەوە شەتەك دەدات لە جێی شاژنی نزیك دەکاتەوەو بە قامیشێك یا بە شتێکی تر دەیجولێنێ. ئەم دەستە گیایەی ماوەیەك لێ نزیك دەکاتەوە بەم جۆرە دەمێنێتەوە تا شاژن ئاشت دەبێتەوەو تورەییەکەی دەتارێ ئەوجا پاز دەداتە سەر دەستە گیایەکەو راژەکارو سەرجەم هەنگەکانی دیش وەدوای دەڕۆن، هەنگەوانیش تا دەیباتەوە لای شانەکەی هەڵیدەگرێ، ئیتر بە خۆو بە لەشکرەکەی دەچنەوە شانەکەیان.

هەنگ قەت ناچێتە سەر تەرمی پواوو ئاژەڵو خۆراکان.

یەکێکی تر لە سەمەرەکانی هەنگ ئەوەیە بەرفەرمانی شاژنی زۆردارو خراپکار نابنو دەیکوژن. هەنگی بچوكو پێگەیشتو، هەنگوین دەبەخشێ، لەگەڵ هەنگە درێژو کەم سودەکان دەجەنگێنو دەربەدەریان دەکەن، تەقەلاش دەدەن لە دەرەوەی شانەکەدا بیانکوژن تا شانەکە بە تەرمی کوژراوان پیس نەبێو خاوێنی بپارێزن، ئەگەر وابو ئەوا شانەکە بە پاکژی دەمێنێتەوە.

پۆلێکی تریان هەیە زلی زەلۆری کەم سودن، لەنێوان ئەوانو هەنگە بەرهەمهێنەکان شەڕو کوشتار هەیە. هێرش دەبەنە سەر خانەکانیانو دەیانەوێ بیانکوژن بەڵام هەنگە بەرهەمهێنەکان زرنگو وریان، هەر کە بێسودەکان هێرش دێنن، دەستو برد بەرەنگاریان دەبنەوەو تەقەلا دەدەن بیانخەنە دەرگەی

خانەکانیان تا بە هەنگوین وەنوسێنو نەتوانن بفڕن بـەمجۆرە هـەمویان دەکـوژنو کەس دەربازی نابێ مەگەر تەمەن درێژەکان (چونکە خاوەن ئەزمونێکی زۆرن).

کە شەڕ نەماو کوشتار کوژاوە شـانەکەیان لیٚ پـاك دەکەنـەوەو یەکەیەکـەیان فڕێ دەدەنە دەرەوە.

وەکو وتمان شاژن نـاوە نـاوە دەرەچـێ، کۆمـەڵێك لـە بێچـوو گەنجـەکانیش رەگەڵ خۆی دەدات. پێش دەرچونی بەڕۆژێك یان دوڕۆژ بێچوەکـان فـێر دەکـاتو رێکیان دەخـات، ئـەنجا بـەو رێـكو پێکیـەی فـێری کـردون دەردەچـنو کـەس لـە فەرمانی دەرناچێ.

ئەگـەر بونـە چـەند شـاژنێك ئـەوا یـەکتر نـاکوژن مـەبادا شـیرازەی شـانەکە تێکبچێتو هەریەکەی بەلایەکدا پەرت بێ. لەو کاتانەشدا هەنگەوان لە ترسـی دابـڕ دابڕو بڵاوە بونی هەنگـەکان هـەمو شـاژنەکان دەسـتگیر دەکـات تەنـها یـەکێکیان نەبێ، هەمویان لە ناو دەفرێك بەند دەکاتو بژێویشیان لەنێو دەفرەکەدا بۆ دابـین دەکـات. تـا ئەگـەر شـاژنی شانەکە نـەخۆش بکـەوێت یـان بمرێـتو یـان لەبـەر خراپکاری بکوژرێ ئەوا شاژنێکی دیکە بخاتە نێو شانەکەوەو هەنگەکان بێ شـاژن نەمێننـەوەو شـپرزە نـەبن. سـەمەرێکی تـر ئەوەیـە شـاژن لەگـەڵ فـەرماندەو لەشـکرەکەی بـۆ سـەیران دەردەچـێ رەنگـە توشـی شـەکەتی ببـێ، ئـەو کـات بێچوەکان هەڵی دەگرن.

هەنگـەکان پاڵـەی کۆڵنـەدەرو مشـەخۆریان تێدایـە، هـەروەها تەمبـەڵو تەوەزەلو خەمساردی کـەم سودیشـیان تێدایـە کـە سـەبارەتمەندی بێکـارین، جـا کۆڵنەدەرەکان یەکبینە تەقەلاّ دەدەن جێ بە تەوەزەلەکان لەق بکەنو وەدەریـان نێن نەبادا تەمبەڵیەکەیان بتەنێتەوە.

هەنگ یەکێکە لە پاكو خاوێنترینی زیندەوەران، تەنانەت لـە شـانەدا نـامرێ، بـە بۆنـی نـاخۆشو گـەنیو هەراسـان دەبـێ. بێچـو جەوانەکانیشـیان وریـاترو لــە خۆبوردە ترن، هەورەها کەمتر پێوە دەدەنو ئەگەر پێوەش بدەن هێنـدە ئـازاری نابێ وەکو گەورەکان.

هەنگ لەبەر ئەو هەمو سودو فەڕو فیتەیە خودای گەورە لە سروشـی خۆیـدا تایبەتیـەکی وای پـێ بەخشـیوە بـە هیـچ زیندەوەرێکـی تـری شـایەن نـەکردوە. هەنگوینەکەی چارەی دەردانە، بەڵام ئەم روناکیەی مرۆڤ لـە بـەریدا دەسـێتەوە، بۆ هەنگ مایەی هەراسانیەو دوژمنێتـی، دوژمنەکانیشـی لـە بـێ بەرهـەمترینو بـێ

سودترینی زیندەوەرانن. ئەمەیە ئەو شیرازەیەی خودای زاڵو دانا بۆ ئافەریدانی فەراهەم هێناوە.

## سەمەرەی دیکەی هەنگ

زانایانی هاوچەرخ ئەو ڕێگەیان تێبینی کردوە کە هەنگ چۆن چۆنی یەکتری پێ ڕێبەری دەکەن بۆ خۆراکێك کە دەیدۆزنەوە. دکتۆر (یوسف عزالدین) دەڵێ: ئەگەر پاڵەیەك لە هەنگەکان گوڵزارێك یان هەندێ ڕوەکە خۆراك بدۆزێتەوە، بەجۆرە سەمایەکی سەیرو سەمەر بۆ شانەکەی دەگەڕێتەوەو هەرچی پاڵەکانی دیکەیە ئاگاداریان دەکاتەوە. کە سەماکەش دەکات بە غەریزەیەو بێئەوەی بزانێ بۆچی دەیکات، هەروەها چەند ئامازەیەکی دیاری کراوی تێدایە؛ گۆشەیەکی وا بە لەشی پێکدێنێ گۆشەی خۆر نیشان بدات.

ئەو سەمایەی دەیکات بە پێی دوری نێوان گوڵزارەکەو شانەکە دەگۆڕێ. جا هەنگەکان بە هۆی ئەم سەمایە دەزانن وا لەو لاوە لە دوریەکی دیاری کراوەوە کۆمەڵە گوڵو گوڵزارێك هەیەو خواردنیان تێدا دەست دەکەوێت پێویستە بە گۆشەیەکی دیاریکراو لەگەڵ خۆر پێکدێت، تا بەرەو ئەوێ بڕۆن، ئەو دەمە پاڵەکانی تریش هەمان چەشنە سەما دەکەن.

پاڵەی هەواڵدەریش کە ئەمە دەبینێ لەوە دڵنیا دەبێو دەزانێ پێیان زانیوە. ئیتر هەر هەمویان یەکجێ دەگەنە گوڵزارەکەو خۆراکی خۆیانی لێ وەدەست دێنن.

ئەو هەنگەی کە گوڵزارەکەی دۆزیەوەو، بە ئەنجامدانی چەشنە سەمایەك توانی چەند زانیاریەك بگەیەنێتە هەنگەکانی تر، خۆ ئەگەر ئێمەی مرۆڤ بە هۆی چەند هێلێکی بیانیەوە لەو زانیاریانە بگەین هەنگەکان تێی گەیین، ئەوا بەلای کەمی بیست خولەکی گەرەکە بەو مەرجەی شارەزایەکی تەسەلیشمان لە زانستی بیرکاریدا هەبێ. بەڵام هەنگەکان یەکسەر لەو کۆمەڵە زانیاریە دەگەنو لەسەر هێلێکی ڕاست بەرەو گوڵزارەکە دەڕۆن تا خۆراکەکەیان بە دەست بێنن...
بەڕاستی سەیرە! پیاو لەبەریدا دۆش دا دەمێنێ، لێکدانەوەی بۆ ناکرێ تەنها ئەوە نەبێ خودای ئافەریدگار فامی بەم جۆرە زیندەوەرە بەخشیبێ.

چونکە هەنگ نەهێندە ئاوەزی هەیەو نە دەشتوانێ بیر لە ئەنجامدانی ئەم کارە بکاتەوە.

## رازێکی دیکەی هەنگ

جێی سەیرمانە هەنگ جۆرە رەنگێك دەبینێ ئێمەی مرۆڤ نایبینین و ناشتوانین بیهێنینە بەرچاومان. رەنگەکەش زۆر وەنەوشەیە کە ئێمە بە رەش دەیبینین. حیکمەتەکەش ئەوەیە رەنگە هەنگ بۆ چەندین مانگ لە ناوچە هەوراویەکان بژیێت، تەنها تیشکی زۆر وەنەوشەییش توانای سمینی هەوری هەیە، دیارە دیتنی خۆریش شتێکی زەروریە تا بەهۆیەوە شوێنی گوڵ و گوڵزارانی پێ بدۆزنەوە. بەڵێ، هەنگ بەو جۆرە دەتوانێ خۆر لەو دیو هەوریشەوە ببینێ و لەو کاتانەش دنیا هەور بێ و خۆریش دیار نەبێ کۆستی ناکەوێ و لەبرسان نامرێ.

هەڵبەتە ئەم دیاردەیە هەقیقەتێکی هەست هەڵوەستەکارەو بەڵگەیەکیشە بۆ هەبونی ئافەریدگاری تەگبیرکارو ئەندازەگرێکی ئەوتۆ دەزانێ چ فەراهەم دێنی و چی بۆ دەکات. هەنگ کە توانای دیتنی ئەم رەنگەی هەیە ناکرێ لەگەڵ تێپەربونی کات وەدەستی کەوتبێ بەڵکو دەبێ لە یەکەم چرکەی ژینیدا هەیبوبێ، خۆ ئەگەر وا نەبوایە ئەوا لەو ناوچانەدا هەنگ قڕی تێدەکەوت و لەناو دەچو.

## رێنمونی مێرولەو هەندێ لەو کردە سەمەرانەی خودا پێی بەخشیوە

ئیبنولقەییم لە پەرتوکەکەی (شفاء العليل/ل١٠٤)دا دەڵێ: مێرولە لەو زیندەوەرانەیە کە رێنوێنیەکی فرەیان هەیەو کردەی زۆر سەیرو سەمەرەی هەیە.

ئەو مێرولەیە لە مەڵبەندی خۆی دەردەچێ و بەدوای بژێویدا دەگەرێ، هەرچەندی دور بێ گوێی پێ نادات تا دەگاتە خۆراکێك، پاشان هەڵیدەگرێ و هێدی هێدی بە ریەکی دورو درێژی چفت و چەوێڵ و هەورازو نشێوێکی زۆرو دژواردا دەیهێنێتەوە تا دەگاتەوە مەڵبەندەکەی. لەوێدا خۆراکەکەی پەزمەندە دەکات و ئەو شوێنەش کە چەکەرە دەکات و دەیەوێ سەرلەنوێ دانەکەی پێ شین بێتەوە دەیکاتە دولەت، ئەگەر ئەم دو لەتەش بیەوێ چەکەرە بکات ئەوانیش دولەت دەکاتەوەو ئەنجام دەبێتە چوار لەت.

ئەگەر دانەکەیان تەڕ ببێ و مەترسی گەنینی لێ بکەن، چاوەڕێ دەکەن تا خۆر وەدیار دەکەوێ و لەدەوروبەری شارەکەیان لە بەرهەتاوێدا پەرش و بڵاوی دەکەنەوە تا وشك دەبێتەوە پاشان دەیبەنەوە ژورەوە، هیچ مێرولەیەکیش شت بۆ خۆی گل ناداتەوە.

ئەو هەندە بەسە خودا لە قورئاندا باسی مێرولەی کردوە لەگەڵ سولەیمان پێغەمبەر ئاخافتوەو قسەی لەگەل مێروەکانی تر کردوە ﴿يَاأَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ سورەتی نەمل/١٨ واتە: هۆ مێرولەکان! برۆنە ژورەکانتان، با سلێمانو لەشکرەکەی بێئەوەی ئاگایان لێ بێت، وێرانتان نەکەن.

لێرەدا ئەم مێرولەیە بە (هۆ!)ی بانگ کردن فەرمانەکەی کردوە تا هەمو مێرولەکان گوێبیست بن، پاشان ناوی (مێرولە)شی وتوە تا بە یەکجاری هەر هەموبیانی پێ مەبەست بێ.

پاشان فەرمانی بە مێرولەکان کرد بچنەوە شانەکانیانو خۆیان لەو لەشکرە بپارێزن، ئینجا هۆی فەرمانەکەشی دیارکردوە نەبادا لە ژێر پێی لەشکر پێخوست بکرێن، پاشان پاساوی بۆ سلێمان پێغەمبەرو سەربازەکانی داوەتەوە کە ئاگایان لێیان نیە. ئەم وتانە ئەوپەڕی جێ سەیرمانە.

بیر لەوە بکەوە خودا چ گەورەیەکی بە مێرولە داوە دەفەرموێ: ﴿وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾ سورەتی نەمل/١٧، پاشان دەڵێ: ﴿حَتَّىٰ إِذَا أَتَوْا عَلَىٰ وَادِي النَّمْلِ﴾ سورەتی نەمل/١٨، وا دیارە سەرجەمیان بەو دۆڵەدا رابوریونو ئەم دۆڵەش بە مێرولان ناسراو بوە وەکو دۆڵی دڕندانو ئەو جۆرانە.

کە فەرمانی پێداون هەریەکە بچێتەوە شانەی تایبەت بە خۆیەوە بەڵگەیە بۆ زیتو زرنگی مێرولە چونکە فەرماندەکەو مێرولەکانی دی زانیویانە هەر کۆمەڵەو شانەی تایبەتیان هەیەو یەکێکی تر بۆی نیە بچێتە ناوی.

پاشان دەڵێ سلێمانو لەشکرەکەی وێرانتان نەکەن، هەم ناوی سلێمانی هێناوە هەم بینیویانە کەواتە لەشکرو فەرماندەکەی پێ ناساندونو ئەنجا دەڵێ بێئەوەی ئاگادار بن. لێرەدا وەك بڵێی پاساوێکی بۆ لەشکرەکە هێناوەتەوە چونکە هەست بەو گەلە مێرولەیە ناکەن، لە هەمان کاتیشدا سەرزەنشتی مێرولەکان دەکات وریا نەبونو نەچوینەوە شانەکانیان.

لەبەر ئەوە سلێمانی پێغەمبەر ئەم وتەیەی گوێ لێبو پێکەنی، جا بەڕاستی جێی پێکەنینو سەیر هاتنەوەیە. زوهری لە عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی

عویەینە ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە دەبێژێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەرهەڵستی لە کوشتنی مێرولەو هەنگ و پەپوسلێمانەو (صُرد)[44] کردوە.

لە هەردو صەحیحانیشدا هاتوە ئەبا هورەیرە لە پێغەمبەر ﷺ دەبێژێتەوە فەرمویەتی: ((**نزل نبيّ من الأنبياء تحت شجرة فقرصته نملة فأمر بجهازه فأخرج وامر بقرية النمل فأحرقت، فأوحى الله إليه: أمن أجل قرصتك نملة أحرقت أمة من الأمم تسبح فهلا نملة واحدة؟!**)) واتە: پێغەمبەرێك لە ژێر شێخەڵێك دانیشتبو، مێرولەیەك گەزەیەکی لێدا، ئەویش فەرمانی کرد بارگەکەی لا بدەن‌و شارە مێرولەکە بسوتێنن. خودا سروشی بۆ نارد: لەبەر گەستنی مێرولەیەك شارەمێرولەیەکت سوتاند کە هەر هەمویان پاکیگاری خودایان دەکرد. هەر مێرولەکەت بکوشتبا.

هیشامی کوڕی حەسسان دەڵێ خاو خێزانی ئەحنەفی کوڕی قەیس زۆر ئازاریان بە دەست مێرولانەوە دەخوارد. ئەحنەف گوتی کورسیەکم بۆ بێنن، کورسیەکەی لە نێوان دو ئاگردان داناو لەسەری دانیشت، شادەیەکی هێناو گوتی: بڕوا بکەن ئەگەر واز نەهێنن دەبێ ئەوکورسیەتان بەسەردا بسوتێنم‌و وەهاو وەهاتان لێ بکەم. بەم هەڕەشەیە ئەوێیان جێهێشت.

(عەونی کوڕی ئەبا جەمیلە) لە قەسامەی کوڕی زوهێر دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەبا موسای ئەشعەری وتویەتی: هەمو شتێك سەرداری هەیە، تەنانەت مێرولەش.

یەکێکی دیکە لە ڕێنمونیەکانی مێرولە ئەوەیە دەزانن پەروەردگاریان لە ژور ئاسمانەکان لەسەر بارەگاکەی دایە. ئەحمەدی پێشەوا لە پەرتوکی (الزهد) دا فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺی هێناوەتەوە ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت گێڕاویەتیەوە: ((**خرج نبيّ من الأنبياء بالناس يستسقون، فإذا هم بنملة رافعة قوائمها الى السماء تدعوا مستلقية على ظهرها، فقال: إرجعوا فقد كفيتم أو سقيتم بغيركم**)) واتە: یەك لە پێغەمبەران بە خۆو بە خەڵکەوە چوە دەرەوەی گوندو دەیانویست داوای بارانبارین لە خودا بکەن. ئەو دەمە مێرولەیەکی دیت لەسەر پشت راکشاوەو پاکانی بەرز کردۆتەوەو لە خودا دەپاڕێتەوە. پێغەمبەرەکە گوتی: بگەڕێنەوە نزای غەیری خۆتان بەسەو بارانتان بۆ دەبارێ.

---

[44] باڵندەیەکی سەر زل، سك سپی و پشت سەوزە، باڵندەی بچوکتر دەخوات.

ئەم فەرمودەیە چەندین رێگەی تری هەیەو طەحاویش لە (تەهذیب)و کەسانی تریش گێڕایتیانەوە.

لە (موسنەد)ی ئەحمەدی پێشەوا هاتوە سلێمانی کوڕی داود دەچێتە دەرەوە نوێژە بارانە بکات،مێرولەیەك دەبینێ لەسەر پشت راکشاوەو پێیەکانی بەرز کردۆتەوەو دەپاڕێتەوەو دەڵێ: خودایە ئێمەش ئافەریدەی تۆین، بەبێ بژیوی‌و ئاوی تۆ نازین، خودایە یان نان‌و ئاومان بدێ یان بمانمرێنە. سلێمان گوتی: بڕۆنەوە بە نزای غەیری خۆتان بارانتان بۆ دەبارێ.

هەروەها دەڵێ بۆیان گێڕامەوە: مێرولەیەك لە شانەکەی دەردەچێ‌و توشی کەلە کللۆیەك دەبێ هێندەی دەکا پێی هەڵناگیرێ، بە ناچاری دەچێ چەند مێرولەیەکی تر دێنێ تا کۆمەکی بکەن، دێن یەکێك پارچە کللۆیەکە هەڵدەگرێت و نایدۆزنەوە، ئەوانیش بە دەستی بەتاڵ دەڕۆنەوە، پاشان دەڵێ دامناوە شوێنی خۆی. دیسان هات‌و تەقەلای دا بەلام نەیتوانی هەلیگرێ، دوبارە چو ئەوانی بانگ کردەوە، دەڵێ ئەمجارەش من هەڵم گرت، ئەوانیش لێی گەڕان‌و نەیاندۆزیەوەو رۆیشتن. دەڵی چەند جارێك هەمان شتم دوبارە کردەوە تا لە جاری ئاخری مێرولەکان لە دەوریدا ریزیان بەست‌و مێرولەکەیان خستە ناوەندی خۆیان‌و ، ئەنجا بە هەمویان پارچە پارچەیان کرد.

.مامۆستاکەمان[٤٥] کە ئەم روداوەیان بۆ گێڕاوە گوتی خودا مێرولەی وا ئەفراندوە رکی لە درۆ ببێتەوەو سزای درۆزن بدات.

مێرولە یەکێکە لەوزیندەوەرانەی هەردەم لە خەمی خۆراکی خۆی دایەو هەر کۆدەکاتەوەو دادەگرێتە سەر یەك تەنانەت پەندی پێ دەهێنرێتەوە، دەگێڕنەوە سلێمان ﷺ زانیویەتی مێرولە ئاوەها لە خەمی خۆراکی دایە، مێرولەیەك دێنێ‌و لێی دەپرسێ: ساڵێ چەندی دەخۆی؟ دەڵێ سێ دەنکە گەنم، ئەویش دەیخاتەناو دەفرە شوشەیەك‌و سێ دەنکە گەنمی بۆ دەخاتە ناوی‌و دەمەکەی دەگرێ، دوای ساڵێك دەفرەکە دەکاتەوەو دەبینێ دەنك‌و نیوێکی خواردوە. دەڵێ: کوا بۆ نەتخواردوە؟ نەت گوت ساڵێ سێ دەنك بژێومە، دەڵێ: بەڵێ، بەلام گوتم نەکو لەبەر کاروباری خەڵکان لە بیرم بکەیت‌و منیش ئەژمارم کردوە تەمەنم پترە لەو

---

[٤٥] مەبەستی شێخ ئیبنوتەیمیەی پێشەوایە. وەرگێر

ماوەیە، بۆیە نیوەی بژیوەکـەم هـەڵگرت. سلێمان پێغەمبـەر لـەو کـارەی مێرولـە سەیر ما... ئەمەیە رێنمونی مێرولە.

مێرولەی کۆڵنەدەر بـە درێژایـی هـاوین رەنـج دەداتو خۆراکو بژێـوی خـۆی کۆدەکاتەوە تا لە زستان بتوانێ بژێت، بێگومان لە وەرزی زستاندا پێویسـتی بـە خواردن هەیەو پەیداکردنیش ئەستەمەو ناکرێ. مێرولـە هەرچـەندە خـۆی بچوكو لاوازە کەچی بەقەد چەند جـاری کێشـی خـۆی خـۆراك هـەڵدەگرێو دەیخاتـە نێـو شانەکەی.

زۆر سەیرە ئەگەر لاسکێکی وشکی گیای گژنیژ بێنیو بۆنی بکەی هیچ بۆنـی نیـە کـەچی هەرکـە خسـتتە سـەر زەوی ئیـتر مێرولـە لـە دوراییـەکی زۆرەوە روی تێدەکەن، گەر پێشیان هەڵنەستێ ئەوا کۆمەڵێك لەگەڵ خۆیان دێنن. ئایا چۆن لـە ناو شانەی خۆیدا لەو دوراییەدا بۆنی کردو ئاوها بە خێرایی هات؟!

مێرولە لە دوراییەکی ئەوتۆ بۆن دەکات رەنگە زیندەوەری تر بە هۆی بیستن یان بینین پێی بزانـن. ئینجـا ئـەو مێرولـە لـەو دوراییـەوە بـەرێ دەکـەوێ تـا ئـەو جێگەیەی مرۆڤ هەندێ بەرماوەی لە نانو خواردنەکەی لێ بەجێ مـاوە، ئـەوانیش دێن هەڵیدەگرنو دەیبەنە شانەکەیان ئەگەر پێیان نەکرا مێرولەی تر بە یەك ریـزو یەك لە دوای یەك وەك دەزوی رەش بۆ گەلەکۆمەکی دەچن.

مێرولە کە دەچێتە لای گوڵە دانەوێڵەیەك بۆنی دەکات، ئەگەر گـەنم بـو ئـەوا پارچە پارچەی دەکاتو هەڵیدەگرێو دەیگوازێتەوە، بەڵام ئەگەر گوڵەجۆ بێ ئەوا هیچ.

مێرولە لە بۆنـدا هەڵـە ناکـات، رشـتیو لـە خۆراپـەرمونو جورئـەتێکی زۆری هەیە، لە گواستنەوەی ئەو ئەندازە خۆراکانـەی زۆر لـەخۆیان قـەبارە زلـترن کـۆڵ نادات.

مێرولە وەکو هەنگ فەرماندەو شـاژنیان نیـە بـەڵام رێبـەریان هەیـە بـە دوای بژێویدا دەگەرێت.

ئەگەر شتێکی دیتەوە ئەوانی تر ئاگـادار دەکاتـەوە، هـەر مێرولەیـەك هـەوڵ دەدات باری گشتی چاکساز بکاتو هیچ یەکێکیان بێ ئەوانی تر دان بـۆ خـۆی گـل ناکاتەوە.

سەمەرێکی دیکەی مێرولە ئەوەیە ئەگەر پیاوێك بیـەوێ هەنگوینەکـەی یـان شتێکی دیکەی لە مێرولان بپارێزێ هەڵدەسـتێ بـە دەوری هەنگوینەکـەی قۆرتێـك

هەڵدەکەنیو ئاوی تێدەکات، یان لە ناو دەفرێکی وای دادانێ چوار دەوری هەنگوینەکەی لێ دەکات بە ئاو، مێروولە کە دێ ناتوانێ بگاتە هەنگوینەکە، بەڵام بەسەر دیوار هەڵدەگەرێو بە بنمیچەکە دەڕوات تا دەگاتە نزیک هەنگوینەکە، لەوێدا خۆی هەڵداوێ.. ئێمە خۆمان ئەوەمان تاقی کردۆتەوە.

جارێکیان ئاسنگەرێك بازنەیەکی سورکردبۆوەو فرێی دایە سەرزەوی تا سارد بێتەوە، وا رێکەوت دەوری مێرولەیەکی گرت، مێرولەکە روی لە هەر لایەك دەکرد تاوی گەرمی بۆ دەهاتو نەیدەتوانی دەربازی بێ، تا لە چەقی بازنەکە گیرسایەوە کە دورترین جێیە لە چێوەکەی.

## مۆرانە (مێرولەی سپی)

چۆن خواردنی خۆی چارە دەکات، شارەکەیان، دارچۆن دەبێتە خۆراك، چۆن لە یەکتر دەگەن؟

مامۆستا (یوسف عزالدین) دەڵێ: خودای گەورە بەهرەی وای بەم زیندەوەرە بچوکە بەخشیوە پیاو لە ئاستیدا دەتاسێ، هەر یەکێ خاوەن ئاوەز بێ سوژدەی بەندایەتی بۆ ئافەریدگاری مەزن ومیهرەبانی دەبات. بۆ وێنە جۆرە زیندەوەرێك هەن پێیان دەڵێین (مۆرانە). ئەم زیندەوەرانە بە کۆمەڵگەیی دەژین. جا ئەگەر ژمارەی تاکەکانیان لە خواردنیان زۆرتر بێ لە سروشتی خۆیەوە هەست بەو دیاردەیە دەکاتو ژمارەیەکی زۆر لە گەراکانیان دەخۆن بەم جۆرە هەردو گرفتی زۆری تاكو کەمی خواردن چارە دەکەن چونکە خواردنی ئەم گەرایانە لەگەڵ ئەوەی خۆراکیشە ژمارەی نەوەکانیشیان کەم دەکاتەوە.

مۆرانە نازانێ بۆ وا دەکات. بەڵام میهری خودا فریایان دەکەوێو شتی وای پێ دەکات بە قازانج بۆی بکەوێتەوەو زیان لە خۆی دورخاتەوە.

ئەم جۆرە مێروە داریش دەخۆنو زۆر بە خێراییش هەڵیدەکرمێنن، زۆر جاران وابوە خێزانێك لە شوێنێك ئەو جۆرە مێروەی لێبوە لەسەر مێزێك نانیان خواردوە، بۆ بەیانی کە هاتونەتەوە، دیتویانە مێزەکەیان هەرچوار پایەی نەماوەو زۆر جێیتریشی داخورایە.

لە هەندێ ناوچەو هەرێمی ئوستورالیادا ئەو جۆە مۆرانەیەی تێدا دەژی، رەنگە گەشتیارێك بە شەمەندەفەرێك بەوێدا بڕواتو تەماشای پەنجەرەکەی بکاتو لە دورەوە گوندێك ببینێ گەر پێی بڵێن ئەو گوندە مرۆڤی لێ نازیێ بەڵکو مۆرانە

ئەم گوندەی بنیات ناوە تا تێیدا بژیێ واقی وڕ بمێنیێ. ئەم خانوانە چەند مەترێك لەسەر روی زەوی بەرزن و بە ماددەیەك كە لە لیكاوو هەندێ ماددەی تر پێكدێ دروستی دەكات لە چیمەنتۆ بەهێزترە. زیندەوەران ناتوانن درزی تێ بخەنو بارانیش ناتوانێ دیوارەكانی ئاوبوێر بكات، لە ناوەوەش چەندین تونێلی لیٚ بۆتەوە مۆرانەی تێدا دەژی.

مۆرانە بۆ هەواڵ دانی یەكدی جۆرە شیفرەیەك بەكاردێنن وەكو شفرەی تەلگرافە.

چەند جارێك سەری خۆی لە دیواری تونێلەكان دەداتو مۆرانەكانی تر لێی تێ دەگەن مەبەستی لەم لێدانە شیفرەییە چ بوە. ئەمە دەكات ناشزانێ چ دەكات. ئەم كردەیەی بە هۆی فروسمانێكی خودایی ئەنجام دەدات پێی دەڵێن غەریزە.

زانایان ماوەیەكی درێژ بو دامابونو سەریان لەوە دەرنەدەچو ئەم مێروە چۆن دەتوانێ دار بكاتە خۆراكو پێی بژێ. كەچی دار هیچ ماددەیەكی ئەندامی وای تێدا نیە بتوانرێ هەرس بكرێ. بەڵام لە كۆتاییدا رازیان واڵا كردو بینیان لە ناو كۆئەندامی هەرسی هەر مۆرانەیەك جۆرە زیندەوەرێكی وردی تاكخانەیی دەژی رژێنێك دەردەدات دارەكە بۆ خۆراكێك دەگۆڕێ تا هەرسی بكات. ئەوەی جێی سەرنجە تا ئێستا قەت نەبوە مۆرانەیەك ئەم زیندەوەرە تاكخانەییەی لە هەناودا نەبێ. جا ئەگەر ئەم زیندەوەرانە لە یەكەمساڵی ژیانیدا لە هەناوی مۆرانەدا نەبوبێ ئەوا لە یەكەم نەوەدا دەبڕانەوەو لە ناو دەچون. ئایە ئەمە كاری رێكەوتە یان ئەنجامی نەخشەو پلانێكی بە تەگبیرە؟!

## مێرولە دابەستە بەخێو دەكات و زەویش دەكێڵێ

دكتۆر (یوسف عزالدین) باس لە سەمەرەیەكی تری مێرولەكان دەكاتو دەڵێ: مێرولە بە ملیۆنان ساڵ بەر لە پەیدا بونی مرۆڤ توانیوێتی سەدان رەگەزی زیندەوەران كەوی بكات، كەچی خودی مرۆڤ تەنها توانیوێتی نزیكەی بیست جۆرە ئاژەڵی درندە رام بكاتو بۆ قازانجو خۆشی خۆی بە كاری بێنێ. مێرولە بە غەریزەوە كشتوكاڵو شوانی زانیوە. زیندەوەری مێشەگەزۆ هەندێ جار پێیان دەڵێن (ئەسپێی روەك) لەسەر گەڵای هەندێ دەرەختدا دەیانبینین، مێرولە ئەو جۆرە زیندەوەرانە بەخێو دەكات تا سودیان لیٚ ببینێ. لەسەرەتای بەهاردا

مێروولەکان چەند نێردراوێکیان دەنێرن تا گەرای ئەو مێشەگەزۆیانە کۆ بکەنەوە، پاش ئەوەی گەراکانیان کۆ کردەوە هەمویان دەبەنە نێو شانەکانیان وەکو گەراکانی خۆیان گرنگی پێ دەدەن، ئەنجا کە دەترووکێن خۆراکیان دەدەنێو ڕێزیان دەگرن، دوای ماوەیەکی کەم لە گەورە بونیان شلەو خۆشەیەکی وەکو هەنگوین دەردەدەن وکو چۆن چێڵ شیر دەردەدات. مێروولەکان شیری ئەو مێشە گەزۆیانە دابین دەکەن تا ئەم شلەیەیان دەست کەوێت، وەکو چێڵ.

مێروولە هەر تەنها پەروەردەی گیانەوەران ناکات بەڵکو بایەخ بە کشتوکاڵو کێڵانیش دەدات. زانایەك لە یەك لە دارستانەکاندا پارچە زەویەك دەبینێ برنجی دێمی تێدا چەکەرەی کردوە. روبەری پارچە زەویەکە (٥×٢)پێ دەبو، بەرزایی گوڵە برنجەکانیش نزیکەی شەش سەنتیمەتر بو.

مرۆڤ کە دەیدیت دەیگوت دەبێ یەکێك بەم کارە هەڵسابێ چونکە خۆڵی دەوری رەگەکان تاوتوێو گژوگیای رموزنی لێ ریشەکێش کرابو، ئەوەی جێی سەرنج بو لە نزیك ئەم پارچە زەویەدا هیچ گوڵە برنجێکی تر نەبو، کەواتە ئەم گوڵەبرنجانە لە خۆیانەوە سەریان دەرنەهێناوە، بەڵکو دەبێ کشتیارێك چاندبێتی. ئەوەش تێبینی کرا جۆرە مێروولەیەك دێتە ئەوێو پاشان دەڕوات.

زاناکە لەسەر زگ راکشاو لە کاری مێروولە ورد بۆوە. پاش کەمێك زانی ئەو مێروولەیە بە کاری چاندنی ئەو لاتە برنجە هەڵساوە. ئەو چاندنەشی کردۆتە پیشەو هەمو کاتەکانی بۆ تەرخان کردوە. کۆمەڵێکیان بە کێڵان خەریکە، کۆمەڵێکیان خەریکی ریشەکێش کردنی گژوگیای زیانبەخشەو، ئەگەر گیایەکی نامۆ شین بوبێ ئەوا چەند مێروولەیەك دەیکرتێننو لە دوری کێڵگەکەیان تورِی دەدەن.

ئەو گوڵەبرنجانە گەشەیان کرد تا درێژیان گەیشتە شەش سەنتیمەترو دەنکە برنجەکان پێگەیینو وەرزی دروێنە داهات. ئەو کات بینرا کۆمەڵە کارکەرێك یەکڕاست، بێ ئەملاوو ئەولا رو دەکەنە گوڵەکانو پێوەی هەڵدەگەڕێن، هەر کارکەرەو دەنکێکی دەچنێو بە خێرایی دادابەزێو دەیباتە کۆگەکانی ژێر زەوی.. لەوەش سەیر تر هەندێکیان لەسەر لکی گوڵەکە، دەنکێکی هەڵدەداشتە خوارەوە، لە خوارەوە مێروولەی تر هەبو ئەم دەنکانەیان بۆ کۆگاکان دەگوازتەوە.

ئەم جۆرە مێرولانە وەکو ئێمە لە چەند نهۆمو ژوران پێکهاتوە، هەندێکیان لە ژێر زەویە، هەندێکی تریان لەسەر روی زەویە. هەروەها راژەکارو کۆیلەشیان هەیە.

لەوەش سەیر تر پەرستاریان هەیە شەوو رۆژ لە خەمی نەخۆشاندایە، هەیانە بە فرێدانی تەرمی مردوەکان تەرخانە...

ئەم جۆرە مێرولەیە ئەم هەمو حەشاماتە بە بێ بیرکردنەوە دەکات، بەڵکو بە هۆی ئەو غەریزەیە دەیکات کە خوای گەورە خستۆتیە لاشە بچوکەکەیان.

## رێنوێنبونی پەپو سلێمانە

ئیبنولقەییم لەم بارەوە دەڵێ:

پەپوسلێمانکە یەکێکە لە بەڵەدترینی ئەو گیانلەبەرانەی لە بن هەردیدا ئاو دەدۆزنەوە. رێنوێنیەکیتر ئەوەیە خودا لە قورئاندا باسی کردوە، کاتێ بەڵێنی بە سلێمانی پێغەمبەر ﷺ دابو بگەرێتەوەو دوا کەوت، کە هاتەوە بەر لەوەی سلێمان گەڤ لێ بکات پۆزشی بۆ خواستو بە ئابوتابێکی وا لەگەڵیدا ئاخاوت سلێمان ئەژنەوای بو و پۆزشی لێ وەرگرت. گوتی: ئەوەی ئەمن زانیتم ئەتۆ نەتزانیوە. من هەواڵێکی هێندە گرنگم زانیوە کە تەواو تەواو پێی ئاگادارم ئەنجا هاتوم پێت رابگەیەنم.. لە سەبەئەوە هاتومەوە.

هەواڵێکی گرنگم بۆ هێناوی هەمو کەسێك حەز بە ئاشنا بونی دەکات. پاشان لەوە دڵنیای کردەوە کە هەواڵێکی راستو دروستو گومان هەڵنەگرە. لێرەدا پەپوسلێمانکە ئەو پێشەکیەی خستە بەردەستی سلێمانی پێغەمبەرو بە هۆیەوە دڵی ئەودالی ئەم هەواڵە کردو بەتاسەوە گوێدێری بو.

ئەم شێوازە پڕ لە چێژو ئابوتابو کەمەندێشە، زیرەکیەکە بۆ رێخۆشکردنی قسەکانی پاشتر.

پاشان بە دڵنیاییو بە بەڵگەی بەتینەوە کرۆکی هەواڵەکەی پێ رادەگەیەنێو دەڵێ: ئەمن ئافرەتێکم دۆزیوەتەوە. ئەنجا وەسفی ئافرەتەکە دەکات کە شاژنێکی ئەوتۆیەو خاوەن هەمو ئەو ئاکارانەیە بۆ پاشایان پێویستە، پاشان پتر وەسفی مەزناتیەکەی دەکاتو دەڵێ خاوەن بارەگایەکی زۆر مەزنەو لەسەری دادەنیشێ، ئەنجا ئەنگێزەیەکی وا دەخاتە رو ببێتە مایەی هێرشکردنە سەریانو، لە زێدی خۆیان دوای بانگەوایی کردنیان پەلاماریان بدەن، ئەنجا دەڵێ: شاژنو گەلەکەیم بینیوە سوژدە بۆ خۆر دەبەن نەك خودا. لێرەدا ئەم رستەیەی بە سەربەخۆیی هێناوە بێئەوەی ئامرازی عەطف بەکار بێنێو عەطفی بکاتە سەر پێشو، کە ئەمەی مەبەستەو هی پێشتر تەنها رێخۆشەکی بوە.

دوای ئەوە گومڕاکارو سەبارەتکاری دەرخستوە کە شەیتانەو کردەوەکانی بۆ ڕازاندونەتەوە تا وای لێکردون لە ڕاستەڕێ لابدەن‌و سوژدە بۆ خودا نەبەن. ئەو چیغەیە بۆتە مایەی دورکەوتنەوەیان لە ڕێنوێنی خودا. پاشان باسی هەندێ کرداری خودای کردوەو دەڵێ هەر خودا شاراوان لە ئەرزو ئاسماناندا دەردەهێنێ. وەکو باران‌و ڕوەك‌و کانزاو جۆرەها شتی تر کە لە ئاسمان دادەبارێ‌و لە زەوی دەردەچێ. پەپو سلێمانە لەم بارەوە کە باسی کردەکانی خودای کردوە بۆ ئەوەی بوە هەست بکرێ خودا بەهرەی دۆزینەوەی ئاوی بن هەردی پێبەخشیوە.

خاوەنی کەششاف دەڵێ: کە پەپوسلێمانکە باس لە دەرهێنانی شاراوان دەکات نیشانەیە بۆ ئەندازیاری‌و بەلەدیەکەی بە ئیلهامی ئەو خودایەی لە ئەرزو ئاسماناندا شاراوان دەردێنێ‌و ئاوی بن هەردی دەدۆزێتەوە.

خاوەنی تەفسیری کەششاف دەڵێ: لە قسەکەیڕا وا دەردەکەوێ پەپو سلێمانە ئەندازەناسیەکی شارەزای هەیە لە دەرهێنانی ئاوو شتی شاراوە، هەڵبەت ئەو بەهرەیەش ئەو خودایە پێی بەخشیوە کە شاراوەی ئەرزو ئاسمانەکان دەناسێ‌و توانایەکی گەورەو زانیاریەکی فرەی هەیە. هەر یەکێکیش خودا دڵی روناك کردبێتەوە هەست بەمە دەکات‌و دەزانێ هەمو هونەرو کارسازیەك تواناو دەسەڵاتی پەروەردگاری لێ پەخشان دەبێ.

## ڕێنوێنبونی کۆتر

ئیبنولقەییم لە(شفاء)دا دەڵێ:

کۆتریش ڕێنوێنیەکی سەیری هەیە، تەنانەت شافیعی دەڵێ: کۆتر ژیرترین باڵندەیە. کۆترە پەیامنێرەکان نامەو پەیام هەڵدەگرن‌و دەیگەیەننە جێی مەبەست، ڕەنگە نرخی ئەو کۆترانە لە نرخی بەندەو کۆیلەش زیاتر بێ چونکە ئەو کارەی ئەو دەیکات بە بەندەو گیانەوەرو ئەوانە ناکرێ چونکە ئەو کۆترانە ڕێی هەزاران فەرسەنگ[٤٦] و کەمتر هاموشۆ دەکەن‌و هەواڵ‌و مەبەست دەگەیەننە پادشاو وڵاتان.

کۆتربازان گرنگیەکی زۆر بە ڕەگەزو ڕەچەڵەکەکانی دەدەن، لە وەرزی زاوزێدا نێرو مێیەکان لە یەك هاوێر دەکەن‌و نێرینەکان بۆ لای مێینەی تر دەبەن‌و

---

[٤٦] یەك فەرسەنگ: (٥٥٤١)مەترە. وەرگێر.

مێینەکانیش بۆ لای نێرینەی تر. لەوە دەترسن رەچەڵەکی تێکبچێ‌و لەگەڵ غەیری خۆی جوت بێ. راست‌و دروستی رێوجێیان دەزانن.

کۆتربازان هێندەی منداڵدانی کۆترەکانیان دەپارێزن هێندە منداڵدانی ژنەکانیان ناپارێزن. کۆتربازان چەندین یاساو رێگەیان هەیە بۆ گرنگیدانیان بە کۆتران بە جۆرێك ئەگەر کۆترێك بەربێتەوە دەستبەجێ دەزانن نەژادو بنەچەو هەرێمەکەی چیەو کوێیە، رێزی خاوەن ئەزمون‌و لێزانەکانیش دەگرن‌و لایان بەرزن. کاتێکی زۆری ژیانیانی بۆ تەرخان دەکەن.

بۆ مەبەستی نامەبەری هەندێ کۆترباز هەن نێرینەکان هەڵدەبژێرن، پێیان وایە پتر سۆزو پەرۆشی بۆ ماڵێ دەبزوێ‌و شەنگ‌و هێزی زیاترو بەڵەدتریشە. بەڵام هەندێکی تر مێیەکان هەڵدەبژێرن لەبەر ئەوەی دەڵێن نێرینە رۆژگارێکی درێژ بەسەر کۆچەکەیدا تێدەپەرێ بۆیە ئارامی لێ دەبڕێ‌و لە ئەزرەتی مێیەکانیان ئۆقرەیان لێ هەڵدەگیرێ، جا رەنگە لە رێگادا مێینەیەك ببینێ رێی بگۆرێ‌و وەدوای بکەوێ‌و لەگەڵ ویدا هەڵبکات.

کۆتر بە گوێرەی فێرکردن‌و بەخێو کردنەکەی رام دەبێ، بەوەش ناسراوە فەرو فیت‌و هۆگری بۆ خەڵك هەیە. خەڵکی خۆش دەوێ‌و خەڵك خۆشیان دەوێت. متوی هێلانەکەی خۆی دەبێ‌و ئەمەکداری خاوەنەکەیەتی‌و تەنانەت ئازاریشی بدات ماڵەکەی جێ ناهێڵێت، لە ماوەو رێی زۆر دوریشدا دەگەرێتەوە، رەنگە دە ساڵان مەفتەنی خۆی بەجێ بێڵێ بەڵام هەر ئەمەکی بۆ خاوەنەکەی دەمێنێ‌و لەهەر دەرفەتێکدا بۆی برەخسێ دەگەرێتەوە لای خاوەنەکەی.

کۆتر کە دەیەوێ لەگەڵ مێیەکەیدا جوت بێ، ئەوپەری نەرمی دەنوێنێ، پەرەکانی کلکی دەکاتەوەو باڵەکانی رادەخات، ئینجا لە مێیەکەی نزیك دەبێتەوەو گمەگم دەکات‌و ماچی دەکات، خۆی شاش‌و واش دەکات‌و پەرەکانی دەکاتەوەو سنگی هەڵدەبرێ، پاشان تاسەیەکی وا دەیگرێ هەمو جەستەی بخرۆشێ. مێیەکەش لەو کاتەدا شان‌و باڵە راکشاوەکانی لەسەر زەوی راخستوە، کە نێرەکە تاسەی شکاندو دامرکا، مێیەکە خۆی دەخاتە سەر پشتی نێرەکە. تەنها کۆتر ئەم نەشمەی هەیە.

کە نێرینەکە دەزانێ کاری تەواو بوە رەنگە مێینەکە هێلکە بکات بە یەکەوە پوش‌و پەراش‌و چیلکە داران کۆدەکەنەوەو هێلانەیەکی تێکچرژاوو توندی ئەوتۆی

لیٚ دروست دەکەن کە بە گوشادی لە ناویدا کڕ بکەون. لێـواری هێلانەکـەش بـەرزو لەند دروست دەکەن تا هێلکەکان گلێر نەبنەوە.

هێلانەکـە دەکەنـە دایەنگـەو دەم نـادەم سـەردانی دەکـەن‌و گـەرم‌و خۆشـی دەکــەن. هــەروەها شــەقڵی یەکــەمجاری دەشــکێنن‌و شــەقڵێکی دیکــەی پـــێ دەبەخشن‌و بۆن‌و بەرامی خۆیانی پێ دەبەخشن، تا هێلکەکان لە شوێنێکی وەکو منداڵدانی کۆتر دابن‌و گەرم‌و ساردی‌و نەرمی‌و رەقییەکەی گونجـاو بـێ، تـا ئەگـەر داکانەکە بێ یەکسەر لەوێدا رۆنیشێ‌و هێلکەکەی لیٚ دانێ.

ئەگـەر کەوتـە بـەر هـەورە تریشـقەو گرمـەی گـەوالان لـە شـوێنێکی خوارتـر هێلکەکەی فڕێ دەدات، حاڵی وەکـو ئـەو ئافرەتـە وایـە لـە ترسـان منداڵـی لەبـەر دەچێ.

کە هێلکەکەی لە هێلانەکـە دانـا بـەردەوام هاموشـۆی دەکـەن‌و لەسـەری کـڕ دەکەون. تا ماوەکەی تەواو دەبێ، ئەنجا هێلکەکە دەتروکێ‌و یارمـەتی دەرهـاتنی بێچوەکەشیان دەدەن.

یەکەمجار فوی بە گەرودا دەکەن تا سیکڵدانی فرەوان ببــێ، چونکـە دەزانـن سیکڵدانەی تەسکەو خۆراکی پـێ شـۆڕ نابێتـەوە. ئـەنجا کـە فـرەوان بـو دەزانـن هێشتا بەرگـەی خـۆراك نـاگرێ. بۆیـە لیکـاوی دەکەنـە دەمـی. دەزانـن سـیکڵدانە پێویستی بە پتەو بون هەیە، بۆیە بەرەبەرە دانــی نـەرمترو نـەرم‌و پاشـان رەقـەو رەقتری لە دەم دەکەن، بەردەوام لەگەڵ هەراشـبونی بێچوەکـەدا بەرەبـەرە دان‌و ئاوی لە دەم دەکەن‌و بێچوش دەق بەمەوە دەگرێ‌و هەر داوای خۆراك دەکات، کە داکانەو بابانەی دیتیان گەورە بوەو توانــای دان هەڵگرتنــەوەی هەیـە چیـتری پـێ نادەن تابە خۆی فێر ببێ‌و لە دان پەیدا کردن رابێت. وە ئەگەر زانیان توندو پوند و هـەراش‌و زیـت‌و زرنـگ بـوەو دەتوانـێ دان پـەیدا بکـات‌و هەڵیگرێتـەوە، ئەگــەر داوایان لیٚ بکات خۆراکی پێ بدەن لێی دەدەن‌و نایدەنێ.

هەر کە زانیان لە خۆی رادەپەرموێ یەکسەر بەزەیی‌و سۆزی جاران نامێنێ‌و دان پەیدا کردنی دەخەنە ئەستۆی خۆی‌و بەو شێوەیە رەفتار دەکەن.

کۆتر لە سروشت‌و رەوشتدا بە مرۆڤ دەچێ، مێینە هەیە بـێ لـە نێرینەکـەی خۆی کۆتری تر قبوڵ ناکات، هەیانە لە نێرینەی تـر سڵ ناکەنـەوە، هەیانـە دوای چیرەیـەکی درێـژ خـۆی بەدەستەوە دەدات، هەیانـە هـەر لەگـەل داوای یەکــەمدا ملکەچ دەبێ، هەیانەنێرینەیەکی ناسراوی خۆی هەیە، بـەلام لـەکاتی کۆچکردنیـدا

لەگەڵ نێرینەیەکی دیکە جوت دەبێ، هەیانە کە نێرینەی دیکە دێ لەبەر چاوی نێرەی خۆی لەگەڵیدا جوت دەبێ، کەچی ڕێی لێ ناگرێو پێی ئاساییە. هەیانە نێرینەیەك دەکاتە هاودەمی خۆیو داوای لێ دەکات. مێینە هەیە لەگەڵ مێینەی تر پانپانۆکێ دەکاتو نێرینەش هەیە سواری نێرینە دەبێ.. ئەم حاڵەتانە هەر هەمو لە ناو مرۆڤدا هەیە.

مێینەی وا هەیە هێلکە ناکات، گەر بشیکات دەیشکێنێ وەکو ئەو ئافرەتەی نایەوێ منداڵی ببێ نەخۆ خەریکی بکات. مێینەی وا هەیە هەر نێرینەیەك خۆی بۆ ڕانوێنێ خێرا ڕادەکات و، بە نێرەی خۆی نەبێ ڕازی نابێ، وەکو ئافرەتی سەربەست وایە.

نێرینە هەیە ماوەیەك لەگەڵ مێینەیەك ڕادەبوێرێ پاشان جێی دەهێڵێو پەیوەندی لەگەڵ مێینەیەکی تر دەکات. هەروەها مێینەش هەیە جگە لەنێرەی خۆی لەگەڵ نێرینەی دیکەش هەڵدەکات پاشان جێی دەهێڵێو لەگەڵ یەکێکی تر دەستپێدەکاتەوە، هەموشیان لە هەمان کەلودا دەژین. هەیانە دو نێرینە یان زیاتر داوای دەکەن، ئەویش دەیانترخێنێ تا یەکێکیان بەسەر ئەوانی دی زاڵ دەبێ ئیدی ئەو هەڵیدەبژێرێو ڕو لەوانی تر وەردەگێرێ.

لە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ دا هاتوە کە کۆترێکی بینیوە ڕەدو کۆترێکی دی کەوتوەو فەرمویەتی، ئەمە شەیتانێکە وەدوای شەیتانەیەك کەوتوە.

هەیانە خۆراك تەنها بە بێچوەکانی خۆیان دەدەن، هەیانە بەزەییو سۆزی زۆرترە بەهی دیکەش دەدات.

سەمەرەیەکی دیکەی کۆتر ئەمەیە کە نامەیەك هەڵدەگرێ ڕێگایەکی دور لە خەڵکی دەگرێتە بەر نەبادا ڕاوبکرێ، تەنانەت دەچێتە دەم ئەو ئاوانەی خەڵك هاموشۆی ناکەنو لەوێ ئاو دەخواتەوە. لە ئاسماندا پەرواز دەکاتو کە خەڵك دەبینێ دەزانێ کام خەڵك دۆستنو کامەیان دژن، ئیتر خۆی دەپارێزێ. هەروەها لە یەکەم هەڵفڕینیدا خۆی لە ساڵۆزی دەداتو بە نێو هەڵۆو سیسارکو بازو قەلەڕەشو خەرتەلو ئەو فڕندانە دادەچێو دەزانێ کێ دوژمنەو کێ هەقی پێدا نیە. دەزانی کامیان قرمی لێخۆشەو کامیان هەقی پێدا نیە، بەلام کە شاهێن دەبینێ شپرزە دەبێو دەشێوێ وەکو بلێی ژەهری کوشندەی دیتبێ، وەکو مەڕو ماڵات کە گورگ دەبینێ، یان وەکو کەر کە شێر دەبینێ وای لێ بەسەر دێت.

یەکی تر لە ڕێنوێنییەکانی کۆتر ئەوەیە پەروەردەی بێچوەکانیان دابەش دەکەن، داکانەکە بە کاری پەروەردەو داڵدەیی خەریك دەبێو بابانەکەش بە کاری پەیداکردنی دانو خۆراك.. کەواتە بابانەکە ئەرکی بەخێو کردنو پەیداکردنی گرتۆتە ئەستۆو داکانەکەش ئەرکی داڵدەدانو پەروەردەو منداڵ بون.

سەمەرێکی دیکە ئەوەیە (جاحظ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێك دو جوت کۆتری هەبو، جوتێکیان باڵی کرابو، جوتەکەی تریان باڵدار بون، باڵدارەکان دو بێچویان هەبو، دەڵێ: کلاورۆژنەیەکم لە دیواری ژورەکەم بۆ کردبونەوە تا بتوانن هاموشۆی دەرێ بکەنو خۆراك بۆ بێچوەکانیان بێنن دەڵێ: لەنکاوێك سوڵتان بەندی کردم، زۆر خەمی جوتە باڵ قرتاوەکەم بو، گومانم نەما مردونە، چونکە نەیاندەتوانی لە کلاورۆژنەکەوە دەربچنو خۆراك پەیدا بکەن. دەڵێ کە ئازاد کرام، هەر خێرا چومەوە لایان، بەڵام دەرگام کردەوە دیتم هەم بێچوەکان هەراش بونە، هەم باڵ قرتاوەکانیش ژیواریان باشە، سەیر مام.

پاشان زۆری نەبرد جوتە کۆتری باڵدار گەڕانەوەو لە باڵقرتاوەکان نزیك بونەوەو دەمیان نایە دەمیانو وەکو بێچوەکانیان خواردنیان پێ دەدان.

تەماشای ئەم ڕێنوێنییە، ئەو دو باڵقرتاوە دیتیان ئەو بێچوانە کاتێ برسیان دەبێ چۆن چۆنی دەمو دەنوك دەبزوێنن ئەوانیش هەمان ڕەفتاریان دوبارە کردۆتەوە تا جوتە باڵدارەکە بەزەییان پێیان دا هاتۆتەوەو وەکو بێچوەکانیان خۆراکیان داونەتێ.

## چەندین سەمەری دیکەی ڕێنوێنی

زۆر وێنەو نمونەی ڕێنوێنی سەیرو سەمەرو جێسەرنج هەیە کە (جاحظ)و کەسانی دیکەش یادیان کردوە. جاحظ دەڵێ: ڕوداوێك هەیە لە لای ئێمەدا زۆر بەناوبانگە: کاتی خۆی لەبەسرە نەخۆشی پەتا تەنیەوە، ماڵێکی گرتەوە، خەڵك بێگومان بون کەسیان تێدا نەماوەو هەمویان مردون. دەرگەی خانوەکەیان گاڵە دا. بێئاگا لەوەی منداڵێکی شیرەخۆر بە زندویی بەجێماوە، پاش ماوەیەك خزمو کەسی ئەو ماڵە دەرگا دەکەنەوەو دەچنە ژورەوە دەبینن وا منداڵێك لەگەڵ دەڵە سەگێك –کە هی ماڵەکە بو– بێ ترس یاری دەکات.

کە نەخۆشیەکە بڵاو ببۆوە ئەم سەگە منداڵە جێماوەکە دەبینێو پەرۆشی دەبێو ماوەیەك خەریکی دەبێو چارەسەری دەکاتو ئاوی دەداتێ.

سەرەتا سەگەکە منداڵەکە دەبینێ خەریکە لە تێنان بخنکێ ئاوی بۆ دێنێو دەیخاتە دەمیو بەبەردەوامی ئەوەی لەگەڵدا دەکات، شێرەخۆرەش هەر کە نانو ئاوی ویستوە داوای کردوە.

ئەمەو سەیرتریش لەوە دورو مەحال نیە، ئەوەی منداڵی تازەبوی رێنمایی کردوە کە چەنجەی خۆی بمژێ تاکو رابێ لەسەر گرتنی مەمکی دایکی کە پێشتر لەسەری رانەهاتوە، وەك بڵێی پێی گوتراوە ئەوە کۆگەی خۆراکو خواردنەوەتە، ئەو کاتە بەجۆرێ دەیمژێ دەڵێی رۆژگارێکە لە مژتنی راهاتوە، ئەو خودایە رێنوێنی گەلێ سەرتریشی بە ئاژەڵەکان بەخشیوە.

کەڵەبابی گەنج ئەگەر دەنکۆڵەیەك بدۆزێتەوە پارچە پارچەی دەکاتو نایخوات، بەڵام پیرەکانیان یەکسەر بێئەوەی پارەپارەی بکات دەیخوات. (مەدائینی) دەڵێ (ئەیاسی موعاویە) بەلای کەڵەشێرێك رادەبورێ، دەنوك لە دەنکۆڵە دەداتو بێئەوەی پارچە پارچەی بکات یەکسەر دەیخوارد، ئەویش گوتی: کەواتە پیرە، چونکە کەڵەشێری گەنج دان کەرت دەکات تا مریشکی لە دەورەدا کۆبێتەوەو بەسەریاندا بفسێ، بەڵام پیر ئارەزوی مردوەو پێویستی بەم کارە نیە. ئەیاس دەڵێ: کەڵەشێر دانەکەی بە دەنوك هەڵدەگرێ تا مریشکەکان بیبیننو ئەنجا بۆیان فرێ دەدات، بەڵام کەڵەشێری پیر قوتی دەداتو نایداتە مریشکان.

ئیبنولئەعرابی دەڵێ: رۆژێکیان مارێك هێلکەی باڵندەیەکی خوارد، باڵندەکە دەیسیکاندو بەسەرسەریدا فڕکەی دەکرد، تا مارەکە دەمی کردەوەو ئەویش تفێکی پرژاندە ناو گەروێو مارەکەی پێ کوشت. ئەبا عەمری شەیبانی لەم بارەوە وتەکەی ئەسەدی دەگوتەوە:

إن كنت أبصرتني عيلاً ومصطلماً فربما قتل المكاء ثعباناً

## رێنوێنی رێوی

رێنوێنی گیانەوەران هێندە زۆرە وەکو دەریایەکە هەرچۆنی لێ باس دەکەی بیکە. یەکێك لە سەمەرەکانی رێوی ئەوەیە کاتێ کێچی زۆری دەکەوێتە فەروەکەی هێدی هێدی دەچێتە ناو تەنکاوێك تا کێچەکان دێنە چینی سەرەوەی فەروەکەی ئێنجا فڕێیان دەداتە نێو ئاوەکە.

سەمەرێکی دی جارێکیان گورگێک بێچوەکانی رێویەک دەخوات، گورگیش خۆی چەند بێچوێکی دەبێ و، لە نزیک لانەکەشیدا تەندورێك دەبێ رێوی خۆی دەخاتە ناو تەندورو بن کۆلێك لێ دەداتو لە سەرێکەوە دەردەچێ، پاشان رودەکاتە بێچوەکانو هەمویان دەکوژێ، ئەنجا لە کەنارێکەوە چاوەرێ دەکات تا گورگ دێتەوە، گورگ کە ئەمەی بینیو زانی رێوی وای کردوە، رێوی رادەپەرێو رادەکات، گورگ وەدوای دەکەوێ، رێوی خۆی داوێتە ناو تەندورەکەو لەو سەری بن کۆڵەکە دەردێ، گورگیش لە دوای ئەودا خۆی دەخاتە ناو تەندورەکەو رێوی نادۆزێتەوەو هەندی دەکا ناتوانێ لە تەندورەکە بێتە دەرەوە، خەڵکی ئاواییش کە گورگەکە دەبینن دەیکوژن.

جارێکیان کابرایەك دو مریشکی لە لا دەبێ، رێویەکیش خۆی لێ دادەنوسێنێو قەپ لە یەکێکیان دەگرێو دەیرفێنێ. پاشان بیری لەوە کردەوە چۆن ئەوەی تریش مسۆگەر بکات. لە دورەوەرا شتێکی وەك پەلەوەری لە دەم گرتو وای نیشاندا مریشکەکەیەو دەیەوێ بیهێنێتەوە، پاشان شتەکەی لە دەم فرێ دەدات، کابرا وا تێدەگات مریشکەکەیە خێرا بۆی دەچێ کەچی لەم لاوە رێوی لێی دەسورێتەوە مریشکەکەی دیش دەرفێنێ.

سەمەرێکی تر جارێکیان رێویەك دەچێتە دورگەیەك باڵندەو ماڵندەی زۆری لێیە، فێڵێکی داناوە؛ هێنای دەستەیەك گژو گیای خستە ناو ئەو ئاوەی روەو هەندێ باڵندە دڕۆیشت، باڵندەکان ترسانو هەڵفڕین بەڵام کە زانیان گژو گیایە نیشتنەوەو ترسیان نەما، رێوی دوجارو سێو چوار ئەم کردارەی کردەوە، تا باڵندەکان راهاتنو لێی بێ باك بون، ئەمجارەیان دەستە چیلکەدارو گژوگیایەکی گەورەتری هێناو خۆی لە ناو شاردەوە تا گەیشتە نزیك باڵندەکانو ئەوانیش وایان زانی هەروەکو جارانی پێشوە بۆیە هیچ کامیان لە جێی خۆی نەبزوا، تا لە ناکاودا پەلاماری باڵندەیەکی داو گرتی.

## وێنەی تر لە رێنوێنی

جارێکیان گورگێك بەرانگژی کابرایەك دەبێتەوەو دەیەوێ بیکوژێ، بەڵام کابرا تیروکەوانی پێ دەبێ، دەچێ کەڵلەسەرێکی وشتر دێنێو روەو کابرا دەڕوا، کابراش دەیداتە بەر تیران، بەڵام گورگەکە کەڵلەسەر دەکاتە قەڵغانو تیرەکان بەو

کەللەسەرە دەگێڕێتەوە تا کابرا تیری پێ نامێنێ.. کابرا کەسانێکی لێ هەڵدەکەوێو هاریکاری دەکەنو گورگ پاس دەکەن.

سەمەرێکی مەیمونان ئەوە بوە بوخاری پێشەوا لە صەحیحەکەیدا لە (عەمری کوڕی مەیمونی ئەودی) دەگێڕتەوە دەڵێ: لە سەردەمی نەفامیدا نێرەو مێیەی مەیمونێکم دیت لەگەڵ یەکتری زینایان کرد، مەیمونەکانی تریش لێیان کۆبونەوەو هەردوکیان سەنگەسار کرد تا کوشتنیان.. تەماشا! ئەم مەیمونانە سزای خودایان جێبەجێ کردوە کەچی مرۆڤ پشتگوێی خستوە!.

ئەم چێڵەش لە زرنگیدا پەندی پێ دەهێنرێتەوە. پێغەمبەر ﷺ باسی کردوە؛ جارێکیان پیاوێك سواری چێڵێك ببو و لێی دەخوڕی، چێڵەکەش گوتی: ئەمن بۆ ئەوە دروست نەکراوم. خەڵك کە ئەمەیان بیست گوتیان: سبحان الله! چێڵ قسان دەکات؟ فەرموی: منو ئەبا بەکرو عومەر بڕوای پێ دێنین ئەوانیش لەوێ نەبونە. پاشان فەرموی پیاوێك مەڕو ماڵاتەکەی دەلەوەڕاند گورگێکیش هاتو ویستی پەلاماری مەڕێك بدات بەڵام شوانەکە لەبەر چنگی ڕزگاری کرد گورگ پێی گوت: ئەوا ئەمڕۆ لە چنگمت ڕزگارت کرد ئەدی لە ڕۆژێ چی دەکەی هەر بە خۆم شوانم. خەڵك گوتیان: سبحان الله! گورگ قسان دەکات! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەمنو ئەبابەکرو عومەر بڕوای پێ دێنین، ئەوانیش لەوێ نەبون.

کەر ڕێی ڕۆیشتنی زۆر چاك دەناسێتەوە، لە شەوی زۆر تاریکدا لە دوریەکی بێئەندازەدا خاوەنەکەی بە کۆڵی پشتێ دێنێتەوە ناو ماڵێ بێئەوەی ڕێ بزر کات.

لە هەرکوێ بەرەلای بکەی دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی. جیاوازی لەنێوان هۆشو حەچەدا دەکاتو لێشی ناشێوێ.

سەمەرێیتر: مشك ئەگەر بیەوێ ڕۆنی نێو کوپەیەك بخواتو دەمی نەگاتێ، دەچێ بە دەم ئاو دێنێو لە کوپەکەی دەکات تا ئاستی ڕۆنەکەی پێ بەرز دەکاتەوە ئەنجا کە دەمی گەیشتێ دەیخوات.

نوژداران دەڵێن بیرۆکەی حوقنەیان لە باڵندەی دەنوك درێژ وەرگرتوە، کە شتێکی لە گەرو عاسێ دەبێ، دەچێت لە ئاوی سوێری دەریا فڕ دەکاتو ئەوەی گەروی دەست بەجێ دێتە دەرەوە.

ڕێوی کە برسی دەبێ خۆی هەڵدەدەفێنێو لە چۆڵیدا خامۆش دەبێت وەکو بڵێی مردوە، باڵندەو چۆلەکەش لێی نزیك دەبنەوە بەڵام ئەو فرەزەی ناکات تا بە

تەواوی وا دەردەکەوێ مردوەو کاری لە کار تەواو بوە، ئەنجا باڵندەیەك لەسەری دەنیشێو دەنوکێکی لێ گیر دەکات زو پەلاماری دەداتو دەیگرێ.

راسۆو ژوژك؛ مارو تولەماران دەخۆن یەکسەر لە دوای ئەمەدا (صتر)ی ئاوی دەخۆن تا بۆیان وەك ترياکێك بێ.

سەمەرێکی دیکەی رێوی ئەوەیە کە ژوژکێك دەگرێ لەبەر درکەکانی وەری دەگێرێ، ژوژکیش خۆی گرژو گرمۆڵە دەکاتو دەبێتە یەك تۆپەڵە درك، رێویش هەڵدەستێ میزێك دەکات بە ئاخری لای پشتی تا مەلاشوی، ژوژوك کە میزی پێکەوت تەسلیم دەبێو خۆی شلو خاو دەکاتەوە، رێویش هەناوی هەڵدەزڕێنێو دەستدەکا بە خواردنی.

زۆر لە زاناو دانایان پەندو ئامۆژیان لە کردەوەی ئاژەڵان وەرگرتوە لە ژیانو رەوشتو پیشەو شەڕو خۆڕاگریو ئارامیدا لێی بەهرەوەر بونە ئاژەڵان لە زۆر خەلك رێنوێنترن ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ سورەتی فورقان/٤٤. ئەبا جەعفەری باقر دەڵێ: بەو خودایە، هەر بەوەندە نەوەستاوە بە ئاژەڵانیان بچوێنێ بەڵکو بە گومڕاتریشی داناون.

مێینەی درندە باوی وایە بێچوەکان بۆ ماوەی چەندین رۆژ هەڵدەگرێو لەگەڵ خۆی دەیفڕێنێو جێ گۆڕکێیان پێ دەکات تا هەراش دەبێ، چونکە ساقەسۆرە وەك پشکێ گۆشت وایەو نەبادا گێرکەو مێرو تێی وروشێن.

ئیبنولئەعرابی دەڵێ: لە پیرێکی قورەیشیان پرسی کێ ئەو هەموەی فێر کردی، ئەو زانیارانە تەنها بازرگانو ئەزمونکاران دەیزانن؟ گوتی: لە کۆتر فێربوم، کۆتر هێلکەکەی هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکات تا هەمو لایەکی دایەن بگرێ، هەروەها نەوەکو هەردەکە کار لە یەك لای بکاتو بەس.

بە یەکێکی تریان گوت: تۆ کە لەسەر کارێك دەبی زۆر بە تابشتو لە سەرخۆی تا کارەکەت بۆ دەکرێ، ئەرێ لە کێ فێر بوی؟ گوتی لە قالۆچە، دەبینم کە بەسەر دیوارێکدا هەڵدەگەڕێ چەند جارێك بەر دەبێتەوە کەچی کۆڵ نادات تا دەگاتە مەبەست.

لە یەکێکی تریان پرسی چۆن ئاوەها فێر بوی لەگەڵ گەردی بەیانی بۆ بژیویت دەربچی؟ گوتی لە باڵندە کە بە زگی برسیو بەتاڵ لەگەل گزنگی بەیانی

دەردەچێو گوێ ناداتە ڕێگاکەی ئاخۆ دورە یا نزیکە، ئایە لە ئاسمانو زەویدا گرفت وناخۆشی بەسەردێ یان نا؟.

لە یەکێکی تریان پرسی ئەوە کێ فێری ئەو ئارامیو خامۆشیو ماتیەی کردوی کە تا نێچیرەکەت دەگری هەر خۆت دابنوسێنی؟ کە دەشیگری وەکو شێر پەلاماری دەدەی؟ گوتی: لە پشیلە کاتێك لەبەر دەرکی کونی مشك خۆێ مەلاس دەداتو خۆی وەکو مردو لێ دەکاتو جمەی نایێت تا مشك وەدەر دەکەوێو وەکو شێر پەلاماری دەدات.

بە یەکێکی تریان گوت: کێ ئارامیو خۆڕاگریو چالاکی فێر کردی؟ گوتی وشتر، چونکە لەسەر ئەرکو گرانایيو ڕۆیشتنو ماندوبونو قوڕسی بارو بارگە بە ئارامەو بەرگەی برسێتیو تێنوێتی دەگرێ. پەلوپۆی ماندو دەبێو شەنگیشی دەبڕێ، هێشتا ئارامی لێ ناتارێنێ.

لە یەکێکیان پرسی لە کێ ئەو هەمو فێڵو ساختەو پاختەیە فێر بوی بژێوی خۆتی پێ پەیدا بکەی؟ گوتی لە مام ڕێوی کە زانایان لە فێر بونو کردنیدا دەسەوسانن، فێڵو تەلەکەشی هێندە زۆرە بنی نایێت.

شێر کە لە ڕێیەکدا دەڕوات گەر هەست بکا کەوتونەتە شوێنی ئەوا لە پشتەوەڕا بە هۆی کلکی شونەکەی تەخشان دەکات.

شێری سەرکردە باوی وایە جگە لە نێچیرەکەی خۆی دەم بۆ هیچ نێچیری تر نابات، تەنانەت ئەگەر بەلای نێچیری شێری تریشدا بڕوات، هەرچەندە زۆریشی برسی بێ هەر دەمی بۆ نابات.

هەروەها بەور[٤٧] دەبینێ مەرایی لەبەردا دەکات تا لەگەڵی جوت دەبێ.

شێری سەرکردە ئەگەر دڕندەیەکی لێ یاخی بێ ئەوا بانگی شێرێك دەکات ئەویش وەکو سەربازێك وەلامی پاشای دەداتەوەو لەبەردەمیدا ملکەچ دەبێ، ئەویش میزێکی لە گوێ دەکات.

دڕندە کە ئەمە دەبینێ، ئەژنەوای دەبێ.

ڕێوی کە برسێتی زۆری بۆ دێنێ لەسەر پشت ڕادەکشێو هەناسەکەی قەتیس دەکاتو خۆی هەڵدەدەفێنێ، یەك بیبینێ وا دەزانێ مردوە، تا نێچیرێکی دێتە سەرو دەیگرێ.

[٤٧] بەور: جۆرە پڵنگێکە لە هیندستان ، ژێر زگ و قەپرغەکانی سپی و لەشی خەت خەتاری ڕەشە. وەرگێڕ.

هەروەها ئەگەر ڕێوی توشی سەر ئێشە ببێ یان توشــی برینێك ببـێ دەچـێ سمغێکی ناسراو دێنێو وەکو هەتوان لەخۆی هەڵدەسوێ.

ورچ ئەگەر لەشی بریندار بێ گیایەك دێنێو خۆی پێ دەرمان دەکاتو چـاك دەبێتەوە، ورچ ئەمە دەزانێ کەچی دەرمانزانان پێیان نەزانیوە.

مێینەی فیل کە وەختی زانی نزیك دەبێتەوە دەچێتە نـاو ئـاوو لـەوێدا دەزێ چونکە فیـل بـە پێچەوانـەی گیانــەوەرانی دیکــە پێیــەکانی بــەرزە ڕەنگــە کــە فەرخەکەی دەبێ بەربێتەوەو هەڵتەقیو بمرێ، بۆیە دەچێتە نێوەڕاستی ئاوەکەو لەوێ دەزێ تا زەمینەکەی وەکو جێگە نەرمو نیان بێ.

مێش ئەگــەر بەربێتــەوە نـاو شـلەیەك خـۆی بـەو باڵـە دەپـارێزێ کـە شـفای پێوەیە.

سـەگ گـەر تەماشـای مـامز بکـات دەزانـێ بـەهێزە یـان نـا، هـەروەها نــێرو مێیەشیان لێك جیا دەکاتەوە. کە ڕاویــان دەکـات ڕو دەکاتەنێرینـەکان ئەگـەرچی دەشزانێ ڕاکردنیان خێراترو پازیان گەورەترە وەك لە مێینەکان.

چونکە دەزانێ گەر ماوەیەك ڕاکات میزێکی زۆری لە زگدا پەنگ دەخواتەوە، جا هەر گیانەوەرێك کە ترسێکی زۆری دەگاتێ میزێکی زۆری دێـت، ئـەنجا مـامزی نێرینـە لەبـەر هەڵاتنەکـەی ناتوانـێ میزەکـەی بکـاتو لـە ئـەنجامدا خێراییەکــەی هێواشتر دەبێتەوەو سەگەکە دەیگـرێ. بـەڵام مـامزی مێینـە لـە بـەر ئـەوەی زێـی فرەوانە بە هاسانی مێزەکەی دەردەوێژێو هێواش نابێتەوە!

هەروەها کە بەفر دەبارێ سەگ لەو شوێنانە دەگەڕێ کە بەفرێکی تــەنکی لێ باریوەو کەمێك داکەوتوە، بە هۆیَ ئەوە دەزانێ کونە کەروێشکی لـە ژێـردا هەیـە، ئینجـا هــەڵی دەکۆڵـێو ڕاوی دەکـات، ئـەوەش دەزانـێ هەناسـەی کەروێشــکەکان کەمێك لە بەفرەکە دەتاوێنێتەوەو تەنکتر دەبێ.

گورگ بەنۆرە بە چاوێکی دەنوێو بە چاوەکەی تری واگایە تەنانــەت هــەندێ عارەب گوتویانە:

ينام باحدى مقلتيه ويتقى بأخرى المنايا فهو يقظان نائم

چۆلەکـە کـە بێچوی بـەر دەبێتـەوە هانـا وەبـەر چۆلەکــەکانی دەروپشــتی دەبـاتو دەجریکێنــێ، بــەمجۆرە هــەمویان دێـن دەورەی بێچوەکــەی دەدەنو هەڵیدەفڕێنن، تا هێز بداتەوە بەر خۆیو لەگەڵیان دەست بە فڕین بکاتەوە.

راوچیان گێراویانە جار هەبوە دەستی بۆ چۆلەکەیەکی سەر دیوار راداشتوەو وای نیاندوە بەردی تێ دەگرێ کەچی لە جێی خۆی نەبزاوە، جار بوە دانەویوەو وای پیشانداوە بەردێك هەڵدەگرێتەوە ئاراستەی بکات، کەچی هەر نەجولاوە بەلام هەرکە بەردێك یا ناوکە خورمایەکی هەلگرتۆتەوە یەکسەر بەرلەوەی دەستی بگاتێ فریوە.

داکانەی کۆتر کە ئاوس دەبێ لەگەڵ بابانەکەدا دەست دەکەن بە بنیادنانی هێلانەیەك‌و لێوارێکی وەکو دیواری بۆ بەرز دەکەنەوەو رەوشتێکی نوێی پێدەبەخشن پاشان چەند رۆژێك هەلگێرو وەرگێری دەکەن! ئەنجا دایەن‌و بژێوی پەیداکردن لە نێو خۆیان دابەش دەکەن، زۆربەی کات نێرینەکە بە پەیداکردنی بژێوی خەریك دەبێ‌و مێینەکەش بە کاروباری بەخێو کردن!

کە بێچوەکەیان دەبێ دەزانن سیکڵدانەکەی تەسکە، بۆیە پەیتا پەیتا فوی تێدەکەن تا گوشاد دەبێ، ئەنجا بەر لە خواردنیدا لیکاو یان شتێکی هاوشێوەی دەدەنێ، ئەم لیکاوە وەکو شیرخواردنی منداڵ وایە، پاشان کە دەزانن سیکڵدانەی پێویستی بە خۆشەویکردن هەیە بۆ ئەو مەبەستە لە بناغەی دیوار شتێکی وا تێکەڵ لە خۆڵ‌و خوێی دەردێنن‌و دەیخەنە ناو دەمی، کە خۆشەوی بو ئەنجا دانی پێدەدەن. ئینجا کە زانیان هەراش بوەو دەتوانێ شت هەلگرێتەوە، بەرەبەرە پتر شتی ناخەنە ناو دەمی. کە گەورە بو و لە خەم رەخسا ئەگەر داوای دانیان بکات پێی نادەن‌و لێی دەدەن.

کە دەیانەوێ جوت بن نێرینە داوای لێ دەکات، بەلام مێیەکە کەمێك لەبەر دەستی رادەکات تا نێرینەکە جۆش بگرێ، پاشان لە دڵەوە ئەژنەوای دەبێت‌و خۆشی گران دەکات تا نێرینەکە پتر پەرۆش بێ، پاشان هێدی دەبێتەوەو کەمێك خۆی دەگنخێنێ، ئەنجا کەشم‌و نەشمان دەکات‌و گەردنی بەرز دەکاتەوەو جوانی بۆ دەردەخات، پاش ئەمە خۆشەویستی‌و ماچ‌و موچان دەگۆڕنەوەو خۆ لە یەکدی هەڵەسون‌و ئەوانە دەکەن کە دەبینرێن!

کۆتری نامەبەر بەشەو کۆچ دەکات دۆڵ‌و روبارو شاخ‌و ئاراستەی باوو رۆژهەلات‌و رۆژئاوا نیشان دەکات‌و رێی خۆی پێ دەدۆزێتەوە، بە هۆیانەوە رێی خۆی دەناسێتەوە وەك رەوتی با رێ بڕ دەکات.

جۆرە جاڵجاڵۆکەیەك هەیە خۆی بە زەویەوە دەنوسێنێ‌و گرمۆڵە دەبێ، مێش‌و مەگەز بە لایدا رادەبورن وا دەزانن بێئاگایە، کەچی لە ناکاو وەکو شێر پەلاماریان دەدات‌و بەرزەفتیان دەکات.

هەروەها جاڵجاڵۆکە کە ئەو تەونۆکە تەنك‌و پتەوە دروست دەکات تاڵێکی لە بەرزاییەوە دەهێڵێتەوە تا ئەگەر پێشکەو مێشولە پێوە بن بە هۆیەوە بچێ راویان بکات.

مامزە کێوی پشتاوپشت دەچێتەوە ناو لانەکەی تا لەو کاتەدا ئاگادار بێ‌و وریای خۆ وەرگرێ!

پشیلە کە مشکێك دەبینێ بە بنمیچەوە هەڵگەڕاوە، سەری خۆی بۆ بەرز دەکاتەوە وەك پێی بڵێ دابەزە بەڵام مەبەستی ئەوەیە مشکەکە بترسێ‌و پێی بترازێ‌و بەربێتەوە !.

جورج لە خوارەوەی دۆڵ‌و بەرزتر لە ئاستی لافاو تا لە قازمەو بیوری خاك هەڵکەن‌و رادانی لافاو خۆی بپارێزێ؛ کونەکەی بە قوڵی هەڵدەکۆڵێ‌و پاشان لەم لاو ئەو لایدا چەند کونێکی تری لێ دەکاتەوە، ئەو کونانە لەگەل زەویدا تەنکە خۆڵێکی دەمێنێ تا لە کاتی تەنگانەدا بە پەلەو بە هاسانی بتوانێ کونی بکات‌و خۆی پێ رزگار بکات.

لەبەر ئەوەی لە بیرکردنی زۆرە بۆیە لە نزیك تاوێرێك یان تەپۆڵکەیەك کونەکەی لێ دەدات‌و دەیکاتە نیشانە تا پێی بدۆزێتەوە.

شێر کە قەڵەو دەبێ لەبەر سست‌و سۆڵی خۆی دەشارێتەوەو ماوەیەك وەدیار ناکەوێت تا لاواز دەبێتەوە ئەنجا وەدیار دەکەوێتەوە.

ئاسکی کیوی گەر شاخەکەی لێببێتەوە خۆی دەشارێتەوە لەبەر ئەوەی چەکی پێنەماوە، تا شاخەکەی دێتەوە، لەو ماوەیەشدا قەڵەو دەبێ، جا ئەگەر شاخەکەی بێتەوە ئەوا وەدەردەکەوێتەوەو خۆی دەداتە بەر هەتاوو باو جولەو بزاوتی زۆر ئەنجام دەدات تا گۆشتی توند دەبێ‌و قەڵەویەکەی نامێنێ دەبێتە مایەی سستبونی لە راکردندا.

ئەم سەیرو سەمەرانە تا بڵێی زۆرو زەوەندن، هێندە بەسە خودا فەرمویەتی:

﴿ وَمَا مِنْ دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ۝ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا صُمٌّ

وَبُكْمٌ فِي الظُّلُمَاتِ مَنْ يَشَإِ اللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَنْ يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾

سورەتی ئەنعام/٣٨-٣٩، واتە:هەر گیانلەبەرێکی سەر زەوی‌و هەر باڵندەیەکی فڕندە کە بە دو باڵانی دەفڕێ سەرجەمیان وەکو ئێوە نەتەوەن. هیچ شتێکمان لە پەڕتوکدا جێ نەهێشتوە، پاشان هەمویان بۆ لای خودا کۆدەکرێنەوە. ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە نەکردوە کەڕو لاڵی نێو تاریکستانن. خودا هەر کەسێکی بوێ گومڕای دەکات‌و هەر کەسێکیشی بوێ دەیخاتە سەر راستەڕێ.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((**لـولا أن الكلاب أمة من الأمم لأمرت بقتلها**)) واتە: ئەگەر سەگیش نەتەوەیەك نەبوایە فەرمانم دەكرد بیانكوژن، ئەم فەرمودە دو لێكدانەوە هەڵدەگرێ، یەكەمیان ئەوەیە هەواڵمان پێدەدات ئەمە كارێكە كردنی مەحاڵە، چونكە سەگیش نەتەوەیەكەو هێندە زۆرو بڵاوە لە زەویدا تونا نابن، جا ئەگەر بكرابا تونا بكرێن فەرمانم دەكرد بكوژرێن. دوەمیان وەكو ئەم فەرمودەیە: هەر لەبەر گەستنێك ئەو نەتەوەیەت لە مێروان كوشت كە پاكی خودا دەكەن. كەواتە سەگیش نەتەوەیەكە لەبەر دانایی‌و بەرژەوەندیەك ئافەریدە كراون‌و توناكردنیان ناسازە لەگەڵ ئەو مەبەستەی خودا لە پێناویدا ئەفراندونی – خودا بە مەبەستی پەیامبەرەكەی زاناترە–.

ئیبنوعەبباس لە گێڕانەوەیەكی (عەتا)دا دەڵێ: مەبەست لە ﴿ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ ﴾ ئەوەیە خودا بناسن‌و بە تاكی بزانن‌و پاكی‌و ستایشی بكەن.

خودا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ ﴾ سورەتی ئیسراء/٤٤، واتە: هەمو شتێك پاكی ستایشی خودا دەكات.

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ ﴾ سورەتی نور/٤١، واتە: ئەدی نەتبینیوە هەرچی لە ئەرزو ئاسمانان‌دا هەیە پاكی خودا دەكەن، باڵندە باڵكراوەكانیش هەمویان پاڕانەوەو پاكی كردنەكانی خۆیان دەزانن.

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ ﴾ سورەتی حەج/١٨، واتە: نەتدیتوە هەرچی لە

ئاسمانەکانو زەویدا هەیەو ڕۆژو مانگو ئەستێرەو چیاو درەختو ژینـەوەران هـەر هەمویان پاکی خودا دەکەن.

﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مِنْ دَابَّةٍ﴾ سـوڕەتی نـەحل/٤٨، واتە: هەرچی ڕۆیندەی ئەرزو ئاسمانانە پاکیگاری بۆ خودا دەکەن.

﴿ يَاجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ﴾ سـوڕەتی سـەبەء/١٠، واتـە: چیـا! بـاڵندە! لەگەڵیدا ئەژنەوا بن.

﴿ وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ﴾ سـوڕەتی نـەحل/٦٨، واتـە: خـودا سروشـی بـۆ هەنگ کرد.

﴿ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَاأَيُّهَا النَّمْلُ﴾ سـوڕەتی نـەمل/١٨، واتـە: مێرولەکـە گوتـی: هـۆ مێرولەینە! وتەی سلێمانی پێغەمبەریش ﴿عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ﴾ سوڕەتی نەمل/١٦، واتە: زمانی باڵندانمان فێر کراوە.

موجـاهید دەڵـێ: ﴿أُمَـمٌ أَمْثَالُكُـمْ﴾ واتـە جۆرێکـی پۆلێنکـراونو بـە ناوەکانیـان دەناسرێن. (الزجـاج) دەڵـێ: ﴿أُمَـمٌ أَمْثَالُكُـمْ﴾ لـەو بارەیـە کـە ئەوانیش زنـدو دەکرێنـەوە. ئیبنوقوتەیبـە دەڵـێ: ﴿أُمَـمٌ أَمْثَالُكُـمْ﴾ لـەبارەی پەیدا کردنی بژێویو خۆ پاراستنە لە لەناو چون.

سـوفیانی کـوڕی عویەینـە دەڵێ: لـە زەویـدا ئـادەمیزادێك نیـە هــەندێ لــە سیفەتی گیانەوەرانی تێدا نەبێ: هەیانە وەکو شێر هەنجن هەنجن دەکات، هەیانـە وەکو گورگ هــەڵدێ، هەیانـە وەکـو سـەگ دەحـەپێ، هەیانـە وەك تـاوس ڕەفتـار دەکات، هەیانە وەکو بــەراز ئەگـەر خواردنێکـی خـۆشو پـاکی بـۆ فـڕێ بـدەی ڕو وەردەگێڕێ کەچی پیاو هەر لە پێشاوێ هەڵسا دەمی تێ دەسوێ.

بۆیە ئادەمیزاد هەیە ئەگەر پەنجا پەندی بۆ بێژی یەکی ئەزبەر ناکات کەچی یەك هەڵەی گوێبیست بکەی وای لەبەر دەکات تا دەمرێ لە یادی نەکات.

خەتتاب دەڵێ: ڕاڤەکەی سوفیان بۆ ئەم ئایەتە چەند جوانە کە ئەو پـەندەی لێ فامیوە، چونکە وتە ئەگەر لە ڕواڵەتدا مەبەستو فامەکەی ئاشـکرا نـەبێ دەبـێ ڕوبکرێتە دەرونی قسەکەو شاراوەکانی بفامرێتەوە. خودای گەورە لێکچونێکـی لـە

نێوان مرۆڤو باڵندەو گیانەوەران راگەیاندوە، کە ئەوەش لە روی ئافەریدەیی‌و شێوەدا نیەو هەورەها لە روی قسەکردن‌و زانینیش نیە، کەواتە بزانە تۆ لەگەڵ گیانەوەرو دڕندان جیاوازی بۆیە دەبێ بە گوێرەی لەیەك جیاوازیتان لەیەك دور بن، قسەکەی تەواو.

خودای تاك‌و بڵند هەندێ گیانەوەری وا ئەفراندوە بژێو پەیداکەری فێڵزان بێ، هەیانە پشت بە خودایەو فێڵ ناکات. هەندێ مێرو و مەگەز هەیە خۆراکی ساڵێکی دادەگرێ هەندێکیان بە بەشی رۆژانەی رازیە، هەندێ هەیە پەزمەندە دەکات‌و هەیە پەیدا ناکات. نێرینە هەیە بێچوەکەی بە خێو دەکات‌و هەیە بێچوی خۆی هەر ناناسیتەوە، هەیانە تەنها بێچوەکانی خۆی بە خێو دەکات‌و هەیانە بێچوی دیکەش لە ئەستۆ دەگرێ هەیە دەستبەرداری بێچوەکەی دەبێ ئیتر نایناسێتەوە هەیانە دەیناسێتەوەو بەردەوام سۆزی بۆی هەیە، هەیانە داکانەکانیان بێچوەکانیان بە خێو دەکەن، هەیانە بابانەکان بەخێوی دەکەن، هەیانە توخنی بێچوەکانی ناکەوێت، هەیانە خەمیان لێ ناخۆن، هەیانە چاکەی لەبەر چاوو سوپاسگوزارە، هەیانە سپڵەیە، هەیانە لە خۆبوردەیە، هەیانە مێینەیەك دەکاتە جوتی خۆی‌و لێ ناگەڕێ هی تر توخنی بکەوێ، هەیانە حەز لە جوتبون دەکات‌و زۆر خەریکی دەبێ، هەیانە ساڵانە یەك جار جوت دەبێ، هەیانە تەنها لەگەڵ مێیەکەیدا هاوژین دەبێ، هەیانە سڵ ناکاتەوە گەرچی داکانەو خوشکیشی بێت، هەیانە بەنێرەی خۆی زیاتر رازی نابێ، هەیانە نێرەی دیکە رەت ناکەنەوە.

هەیانە هۆگری مرۆڤ دەبێ‌و لەگەڵیاندا رام دەبێ، هەیانە رام نابێ‌و دورەپەرێز خۆی رادەگرێ، هەیانە خۆراکی چاك‌و باش نەبێ نایخوات هەیانە تەنها شتی پیس دەخوات، هەشیانە پاك‌و پیس دەخوات.

هەیانە ئەگەر زۆر ئازار بدرێ ئازار دەدات، هەیانە ئازاریشی نەدرێ ئازار دەدات، هەیانە خراپە لە بیر ناکات‌و هەیانە لە بیری نامێنێ، هەیانە تورە نابێ‌و هەیانە هێندە تورە دەبێ تا رازی نەکرێ دانامرکێتەوە. هەیانە زانیاری وا وردی پێیە مرۆڤیش پەی پێ نابات هەیانە گەمژەیەکەو هیچ نازانێ. هەیانە ناشیرینی لە لادا بێزراوەو لێی دەسەنگرێتەوە هەیانە ناشیرین‌و جوانی لەلا وەك یەکە. هەیانە زو فێر دەبێ هەیانە درێژ دەخایەنێ تا فێر دەکرێ هەیانە هەر فێر نابێ.

ئەمانە هەر هەموی بەڵگەنە بۆ بونی خودای بەرزو پاك، بەڵگەیە بۆ لێزانیو نایابی دروستکردنو تەگبیرکاریەکەی، بۆ دانایی، ئەو زانیاریە سەیرو سەمەرانەو ئەو مەتەڵۆ نەخشانەو ئەو دانسقەییو شیرازە ناوازەیە.. هەمو وا لە زمان دەکا پاکی بکات، دڵ پڕ لە زانینو ناسینی داناییو دەسەڵاتی خودا بکات. هەمو ژیرێك دەزانێ ئەم هەمو شتە لە خۆڕاو بەبێ مەبەست ئافەریدە نەکراون، هەر ئافەریدەیەك خودا دروستی کردبێ مەبەستێکی لە جێو بەڵگەیەکی ئاشکرای تێدایە.. بەڵگەیە بۆ خودا کە پەروەردگارو خاوەنی هەمو شتێکە، هەر خۆی بە تەنها خاوەنی بێکەمایەسیە هەر خۆی توانادارو زانایەو بە هەمو شتێك.

## ئافەریدگار چۆن بونەوەری ڕێنوێنی کردوە تا زۆر بن و ئەو شتانەش چیە کە بۆی داین کردون[٤٨]؟

یەکێك لەو شتە جێسەرنجانەی هەمو بونەوەران تێیدا بەشدارن، توانای زۆر بونە، تا نەوەیان لێ پەیدا بێو ژیانیان بەردەوام بێتو جۆرەکەیان بمێنێو نەفەوتێن. ڕێگەی زۆربونی بونەوەران فرەجۆرو جیاوازە بەڵام هەر هەموی هەمان ئامانج وەدیدێنێ.

بەکتریا کە زیندەوەرێکی روەکیە زۆر دەبێ، هەروەها هەمو روەکو زیندەوەرانی دیکەش بە پێی جیاوازی پلەی باڵا بونیان.

بە پێی زانستی بیرکاری قەت ناکرێ پەیدا بونی ئەم هەمو نێرو مێیە لەو هەزارەها جۆرەی روەکو زیندەوەران بە ڕێکەوت بێ کە ئامانجێکی نەخشە کێشراوو دیاریکراوی هەیە کە بریتیە لە وەچە خستنەوە.

هەندێ زیندەوەر هەیە نێرو مێی لێك جیا ناکرێتەوە کەچی زۆریش دەبێو وەچەش دەخاتەوە. زیندەوەرێکی بچوکی سەرەتایی وەکو ئەمیبا لەنێو ئاودا دەژیێو لەیەك تاکە خانە پێکهاتوە، دەبینین بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕێنەر زۆر دەبێ. ئەم زیندەوەرە لەیەك خانە پێکهاتوە دابەش دەبێ بۆ دو بەش، هەر بەشەو دەبێتە زیندەوەرێکی دی، هەر یەك لە زیندەوەرە دابەش بوەکانیش بۆ دو زیندەوەر دابەش دەبنەوە، ئیتر بەم جۆرە... ئەم چەشنە زۆر بونە لە بارێکی ئاساییو گونجاوی بارودۆخی ژیان رودەدات، بەڵام ئەگەر زیندەوەرەکە هەست بە

---

[٤٨] بریتییە لە چەند مەقالەیەکی د. عزالدین یوسف لە رۆژنامەی (الأهرام)ی قاهیرەیی بلاو کردۆتەوە.

مەترسیەك بكات ئـەوا لـە دەورەی خۆیدا سـیكڵدانەیەك دەردەداتو تێیدا بـۆ دو زیندەوەر بەڵكو بۆ دەیان زیندەوەر دابەش دەبێ تا قەرەبوی ئـەم كاتـە بكاتـەوە كە لەناو سیكڵدانەكە بە فیڕۆی داوە تا گونجاوی باری ژیان دەگەڕێتەوە.

زۆر جـۆرە زینـدەوەری تـری سـەرەتایی -جگــە لــە ئــەمیبا- بــە ڕێگــەی دابەشبون زۆر دەبن، بۆ وێنە وەكو پارامیسیۆم لەناو ئاودا دەژێو وەكو ئەمیبا بە ڕێگەی دابەشبونی دوانی لە باری گونجاودا زۆر دەبێ، بەڵام نـاوە نـاوە پێویسـتی بە نۆژەنكردنەوەی چالاكیو گورجوگۆڵی هەیە، بۆیە پـەنا دەباتـە بـەر ڕێگەیـەكی تری زۆر بون ڕێگەیەكی تا بڵێی ئاڵۆزە. ناوكێك تەرخان دەكات (وەكـو ئاشكراشـە هەر خانەیەك ناوكێكی هەیە) ئینجا لەم بارەدا هەر بێچوێك چوار وەچە دەخاتــەوە نەك هەر یەكەیان ببێتە دو زیندەوەر.

هەندێ زیندەوەری تـری بـالاتر لـەو زینـدەوەرە سـەرەتاییانە گـەر بـارودۆخ هاسان ئەبو تا نێرو مێ جوت ببن، ئەوا زیندەوەرەكە لە یـەك كـاتدا هـەم دەبێتـە نێرو هەم دەشبێتە مێ، واتە دەبێتە نێرەموكو ئەندامی زاوزێی نێرینەو مێینەی لە تەك یەكدا بۆ دروست دەبێ، ئەو كات دتوانێ وەچە بخاتــەوە بێئـەوەی چـاوەڕێی دەرفەتی جوتبون بێ لەگەڵ غەیری خۆیـدا. ئـەم چەشـنە زۆربونـە بـۆ نمونـە: لـە كرمی جگەردا هەیە كە لە ناو زەرداوی هەندێ گیانەوەران دەژێ كـەزۆر ئەسـتەمە نێرو مێیەكانی بتوانن لــەو شـوێنە تەنگەبـەرە وەدوای یـەكدا بگـەڕێن. لـە هـەمان كاتدا ئەگەر جوتێكیان بەیەك گەیشتن ئـەوا یـەكتر دەپیتێنـنو یـەكێكیان دەبێتـە نێرینەو ئەوەی تر دەبێتە مێینە.

روودانـی ملیۆنـان ڕێكـەوت لـە یــەك كـاتداو بـە ئامـانجێكی هاوبـەشو لـە زینـدەوەری جیـاوازو بـە ڕێگـای جـۆراو جـۆر، شـتێكە زانسـتو بیركـاری قـەت هەڵیناگرێ.. چار نیە دەبـێ بـۆ توانـای ئافـەریدگارێك ملكـەچ بـبن كـە ئـەو هـەمو كارانە ئەنجام بدات.

هەڵبەت مێینەی یەكەم گیانەوەری شیردەر لەسەر زەویدا كارگەیەكی هـەبوە تا شیری بۆ بەرهەم بێنێ، تا بەڵكو بێچوەكـانی هـەر لـە یەكـەم سـاتی بونیانـەوە خۆراكیان هەبێ.

خۆ ئەگەر ئەم مەمكە نەبوایە شیری پێ بدابا یەكەم بێچو نەیدەتوانی گەشـە بكـاتو لـە ژیـان بمێنێتـەوە. كەواتـە لـە یەكـەم سـاتەوە كردارێكـی بـە تــەگبیرو نەخشەدار بوەو ناچێتە بەر ئەزمونو ئەگەری هەڵـە كـردن. ئـەم حاڵەتـە تەنانـەت

یەك هەڵەش هەڵناگریێ، جا ئایا هیچ مرۆڤێکی ژیر هەیە پێی وابێ داکانە لەئەنجامی رێکەوتێکی وێڵو کوێر شیری بۆ بێچوەکەی فەراهەم هێنابێ؟ ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە شیری دایك جگە لە خۆراکیەکەی چەندین ماددەی واشی تێدایە کە دەبێتە مایەی بەرگری لە نەخۆشیانو بەرگە بە لەش دەبەخشێ. مرۆڤ لەگەڵ ئەوەی ئەو هەمو کردو کۆشەی کردوە تا شیرێك بەرهەم بێنێ هەمان سیفەتی شیری دایکی تێدا بێ کەچی تا ئێستا نەیتوانیوە.

## گرنگی ئارەزوی سێکسی

ئەوەی زانایانی پێ داماوە چیەتی ئەو ئارەزوە سێکسیە کە نێرو مێ بۆ یەکتر پەرۆش دەکات. ئارەزوی سێکسی بەهێزترین جۆری ئارەزوەکانە چونکە مایەی مانەوەی جۆرو تونابونیەتی.

هەندێ زیندەوەر هەیە ئامانجی مانەوەی لە ژیاندا تەنها جوتبونەو پاشان یەکسەر دەمرێ. سورِی تەواوی ژیانی ئەو مێشو مەگەزانەی پێیان دەڵێن (مێشی مایۆ)، چەند رۆژێکەو لەو ماوەیەدا هیچ خۆراکێك ناخواتو لەبەر ئەوەی دەمی نیە، ئەرکی ئەم مێشە لەو چەند رۆژە کورتەی ژیانیدا تەنها جوتبونی نێرو مێیەکانیانە تا وەچە بخەنەوە. پاشان کە پەیامی بەرزو پیرۆزی سەر شانیان جێبەجێ کرد یەکسەر داکانەکە دەمرێو دواتریش بابانەکە.

## قەرەبوکردنەوەی ئەندامە فەوتاوەکانی لەشی زیندەوەران

سیفەتێکی دیکەی سەر سورِهێنەر ئەوەیە گیانەوەرو روەکەکان هەر یەکەو بە گوێرەی خۆی قەرەبوی ئەندامە فەوتاوەکانیان دەکەنەوە.

زیندەوەرێکی وەکو (هایدرا) شتی زۆر سەمەرەی هەیە کە زانست تەنها توانیویەتی باسی بکات نەیکراوە لێکی بداتەوە. ئەم گیانەوەرە لە ناو ئاودا دەژێ، شێوەکەی لولەکیەو درێژیەکەی لە چەند ملیمەترێك تێناپەرێ.

کۆتاییەکەی داخراوەو پێشەوەکەی کراوەیەو وەکو دەم بۆ خواردن بە کاری دێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا وەك دەرچەی کۆمیش بەکاری دێنێو پاشەرۆکی پێ فرێ دەدات.

لە دەوری ئەم کونیلەیەدا چەند پەلێکی زیادی ناوپۆش هەیە بۆشاتیەکەی بە بۆشاتی لەشیەوە بەندە. ئەم زیندەوەرە ئەگەر بکرێتە دولەت لەتێکی خوارەوەو

لەتێکی سەرەوە؛ خانەکانی هەر لەتێك زۆر دەبن و پارچە کەمبوەکە تەواو دەکەن، ئەنجام دەبێتە دو زیندەوەری رەخسکاوو بنەڕەتی، هەر هێندەش نا بەڵکو ئەگەر ئەم زیندەوەرە بکرێتە چەند پارچەیەکیش هەروا دەبێ، هەر پارچەو گەشەی خۆی دەکات و هەمو پارچە کەمبوەکانی قەرەبو دەکاتەوەو دەبێتە زیندەوەرێکی تەواو و بێ کەمایەسی.

دیواری لەشی ئەم زیندەوەرە لە دو چین خانە پێك دێت: چینێکی دەرەکی، چینێکی ناوەکی کە دەورەی بۆشاییە ناوەکیەکەی لەشی زیندەوەرەکەی داوە، لە هەر یەك لەم چینانە چەند جۆرە خانەیەك هەن هەر جۆرەیان ئەرکی دیاریکراوی خۆی هەیە. زۆربەی خانەکانی چینی دەرەوە ئەرکی بنچینەییان ئەوەیە لەشی زیندەوەرەکە بپارێزن، بەڵام خانەکانی چینی ناوەوە بریتیە لە هەرسکردنی ئەو خۆراکەی زیندەوەرەکە لە رێی دەمیەوە ئاوای دەکات. ئەگەر ئەم زیندەوەرە – وەکو گۆریە– بەراوەژو بکەینەوە ئەوا خانە دەرەکیەکان دەبنە ناوەکی و دەورەی بۆشاییە ناوەکیەکە دەدەن، خانە ناوەکیەکانیش دەبنە خانەی دەرەکی لەم بارەدا چ رو دەدات؟ زانایان ئەم تاقیکردنەوەیان ئەنجام داوە بینیان، ئەو خانانەی ئێستا بوینە خانەی دەرەکی بەرەو ناوەوە کۆچ دەکەن کەچی ئەو خانانەش بونەتە ناوەکی بەرەو روی دەرەوە کۆچ دەکەن تا زیندەوەرەکە شێوەی پێشوی وەرگرێتەوە. خۆ ئەگەر ئەمە روی نەدابا زیندەوەرەکە دەمرد، چونکە هەر دەبێ بەم جۆرە بێ، کە خانەکانی روی ناوەوە دەوری بۆشاییەکەی داوە بە ئەرکی هەرسکردنی خۆراك هەڵسن و خانەکانی روی دەرەوەش لەشی زیندەوەرەکە لە لەناوچون بپارێزن.

کرمی زەویش هەر بەم جۆرە ئەگەر بکرێتە دو لەت هەر لەتەو گەشەی خۆی دەکاتەوەو دەبێتەوە کرمێکی تەواو.

زیندەوەری تری وەکو (رۆبیان و کاپۆریا) و هی دیکەش ئەگەر پێیەکی بفەوتێ ئەوا پێیەکی دیکەی لە باتی دێتەوە. خەمەگرو ئەگەر هەست بە مەترسیەك بکات یاخۆ مرۆڤ یان زیندەوەرێك کلکی بگرێ ئەوا کلکەکەی دەپچڕێنێ تا لە مەترسیەکە رزگاری بێ و پاشان کلکێکی نوێی سەرلەجێ بۆ دێتەوە.

ئێمەش ئەگەر لە كاتی تراشدا یان بە هەر هۆكارێكی دی بێ شوێنێكی لەشمان بریندار بێ؛ لە جێی خانە تێكچوەكانی جێ برینەكە خانەی تازە جێی دەگرنەوە.

هەورەها ئەگەر ئێسقانمان بشكێ ئەوا خانەی تازەو نوێ لە شوێنیدا دێتەوەو شكانەكە سارێژ دەكات.

ئەمانە قەت ناكرێ بە رێكەوت روبدەن بەڵكو لە ئەنجامی نەخشەیەكی هۆشمەندانەیەو ئامانجێكی دیار دەپێكێ ئەویش پاراستنی ژینی تاكە.

لە ناو لەشی زیندەوەردا هێزێكی شاراوە هەیە ئەم دیاردانە ئەنجام دەدات هێشتا زانست لە چیەتیەكەی نەگەیشتوە... ئەوە هێزێكە خودا بە گیانەوەرانی بەخشیوە، گیانەوەریش چی لێ نازانێو ناشزانێ چ دەكات.

## كرداری هەناسەدان لە لای گیانەوەراندا

كرداری هەناسە لە لای هەمو گیانەوەرێك لە نزمترینیانەوە بگرە تا باڵاترینیان كردارێكی جێسەرنجو سەمەرەیە، لە هەمو بارەكانیشدا هەر بریتیە لە كرداری ئۆكسان. ئۆكسانیش بریتیە لە یەككگرتنی ئۆكسجین لەگەڵ ئەو ماددە خۆراكیانەی لە خانەكانی لەشی زیندەوەراندا هەیە. لە ئەنجامی ئەو ئۆكسانەشدا هێزێكی پێویستی ئەوتۆ پەیدا دەبێ ئەگەر زیندەوەر نەیبوایە نەیدەتوانی تەنانەت یەك چالاكیش ئەنجام بدات.

ئەم كردارە لە زیندەوەران دا بە چەندین شێواز ئەنجام دەدرێ، بەڵام ئەنجامی هەر هەمویان یەك شتە ئەویش بریتیە لە پەیداكردنی وزە، هاوكات لەگەل ئەم كردارەشدا ئاو و دوەم ئۆكسیدی كاربۆن پەیدا دەبن. كەواتە روی ئاشكرای كرداری هەناسە بریتیە لە وەرگرتنی ئۆكسجینی پێویست بۆ ئۆكسانی ماددە خۆراكیەكانو دەردانی دوانە ئۆكسیدی كاربۆنو ئەو ئاوەش لەو ئەنجامە پەیدا دەبن.

لە زیندەوەرێكی وەكو ئەمیبای تاكخانەدا، كرداری هەناسە بە رێگەیەكی زۆر هاسان ئەنجام دەدرێ. ئەم زیندەوەرە وەكو پارچە (جیلاتین)ێكی خاوەو لە ناو ئاودا دەژێ. هەڵبەت لە ناو ئاوی دەوروبەریدا ئۆكسجینی تواوە هەیە، دەچێتە نێو لەشی ئەمیباكەو ماددە خۆراكیەكانی نێو لەشی دەئۆكسێنێو وزەیەكی پێویستی ئەوتۆی پێ دەبەخشێ بتوانێ بە هۆیەوە جولەو گەشەو هەر كردارێكی تری

پێویست ئەنجام بدات. لە ئەنجامی ئەو کردارەدا دوانە ئۆکسیدی کاربۆن‌و ئاویش پەیدا دەبن.

ئەنجا بە رێگەیەکی زۆر سەیر خۆی لەم ئاوە پەیدا بوە رزگار دەکات، دلۆپە ئاوەکان لە لەشیدا کۆ دەکاتەوەو تا دەبێتە بۆشەکێکی پڕ لەم ئاوە، ئەم بۆشەکە بەرەو لێواری لەشی دەباتو لەوێ دەیتەقێنێ‌و ئاوەکە فرێ دەداتە دەرەوە.

ئیتر بەم شێوەیە.. هەرچی دوەم ئۆکسیدی کاربۆنەکەشە بە دەلاندن دەیخاتە نێو ئاوەکەوە.

کرداری هەناسەدانی زیندەوەرانیش لە رێی چەندین دەمیلەوە هەردو تەنیشتەکانی هەن، ئەنجام دەدرێ. ئەم دەمیلانە بە تۆڕێك لەمولولە بەستراون کە بە نێو هەمو لەشی زیندەوەرەکە پەرش‌و بلاو بۆتەوەو لکی بچوك‌و بچوکتری لێ دەبێتەوە تا لە ئەنجامدا نزیکەی هەمو خانەکانی دەگرێتەوە. بەم سیستەمە ئۆکسجین راستەوخۆ لەم دەمیلانەوە بۆ هەمو خانەکانی لەش دەچێت.

بەلام لە مرۆڤ‌و زۆر گیانەوەری دیکەش خڕۆکە سورەکانی ناو خوێن ئۆکسجین دەگەیەننە شانەکانی لەش. ئەم خڕۆکانە ماددەیەکیان تێدایە پێی دەلێن هیمۆگلۆبین و، یەك لە سیفەتە سەیرەکانی ئەوەیە زۆر خێرا لەگەل ئۆکسجین‌و دوەم ئۆکسیدی کاربۆن یەکدەگرێ‌و بە هاسانی جودا دەبێتەوە.

کە ئەم خڕۆکانە دەگەنە سیەکان لەوێدا ئۆکسجین هەلدەگرن‌و لەگەل سوڕی خوێن گوزەر دەکات تا دەگاتە ئەو مولولە خوێنانەی لە شانەکاندا هەن، لەوێدا بە دەلاندن لە رێگەی تەنکە دیواری مولولەکانی خوێن ئۆکسجینەکە دەچێتە نێو شانەکەو بۆ ئۆکسانی خۆراکەکەی بەکاری دێنێ، هاوکات خڕۆکەکان ئەو دوانە ئۆکسیدە کاربۆنەی لە کرداری ئۆکسانی شانەکانەوە پەیدا بوە وەریدەگرێ‌و بۆ سیەکان دەیباتو لەوێدا لە هیمۆگلۆبین جیا دەبێتەوە ئینجا بە هۆی هەناسەدانەوە فرێ دەدرێن. پاشان دوبارە ئۆکسجین وەردەگرێتەوەو ئیتر بەم شێوەیە...

بەلێ، زیندەوەرو گیانەوەران هەر جۆرەو بە جۆری جیا هەناسە وەردەگرێ، بەلام ئامانجی هەمو جۆرەکان ئەمەیە ئۆکسجین بگاتە خانەکانی لەش‌و لە دوەم ئۆکسیدی کاربۆنیش رزگاری ببێ. ئەمە دو شت دەردەخات:

یەکەم/ ئەم نەخشە پڕ لە وردەکاریە ڕیژەوی ئافەریدگاریکی تەگبیرکارو نەخشە داڕێژە. چونکە ناکرێ بە ڕیکەوت ئەم هەمو ڕیگە جۆراو جۆرە پەیدا بوبن و هەمان ئەنجامیش وەدی بێنن.

دوەم/ ئەم ئافەریدگارەش تاکو تەنیاو یەکتایە، چونکە شێوازی ئافەریدەکردنەکەی هەمان نەشمەو هەمان تاکە ئەنجامیش وەدەست دەدات.

## بونەوەران چۆن خۆراك دەستەبەر دەکەن؟

هەمو بونەوەرێك روەك بێ یان گیانەوەر دەبێ خواردن بخوات. روەك بە ڕێگەیەکی تەواو جیاواز لە ڕێگەی خۆراکی گیانەوەران، خۆراك پەیدا دەکات. روەك جێگیرەو ناتوانێ وەکو گیانەوەران وەدوای خۆراك بگەڕێ. هەر لە جێی خۆی بە کرداری رۆشنە پێکهاتن خۆراك پەیدا دەکات، کەچی گیانەوەر دەگەڕێ و دەسوڕێ تا خواردنێکی ئامادە وەدەست دێنێ جا روەکی بێ یان گیانەوەری.

ئەو خواردنەی گیانەوەر دەیخوات دەبێ هەرس ببێ تا لەشی گیانەوەرەکە بتوانێ هەڵیمژێ و سودی لێ ببینێ.

کرداری هەرسکردن تا بڵێی ئاڵۆزە، ئەرکەکەشی بریتیە لە گۆڕینی ئەو ماددانەی پێکهاتەیان ئاڵۆزە بۆ ماددەی پێکهاتە سادە تاکو لەشی بتوانێ هەڵیمژێ و سودی لێ وەرگرێ.

ماددە خۆراکیەکان یا ئەوەتە چەورین، یان پرۆتینین یان نیشاستەن... تاد.

هەر جۆرێك لەو ماددە خۆراکانە جۆرە ئەنزیمێکی تایبەتی کاری لێ دەکات، بۆ وێنە ئەو ئەنزیمەی کار لە ماددە چەوریەکان دەکات کار لە ماددە پرۆتینەکان ناکات هەروەها ئەو ئەنزیمەی کار لە ماددە پرۆتینەکان دەکات کار لە ماددە چەوریەکان ناکات.. ئەوانی تریش ئاوەها. جا ئایا ئەم هەمو شتە دەکرێ لە ئەنجامی پەلکوتانێکی بێسەروبەرو ڕێکەوتێکی کوێر بێ یان لە ئەنجامی ئەزمونێك بێ بەرتوانی هەڵەو ڕاست بێ؟!

هەر ئاوەزێك توانای بیر کردنەوەی هەبێ دەزانێ مەحاڵە وابێ هەروەها دیدەوەریەکانی شێمانەی زانستی بیرکاریش ڕێ بەوە نادەن.

لە زیندەوەرێکی وەکو ئەمیبای بچوك و تاکخانەدا کرداری خواردن زۆر بە سەیری ئەنجام دەدرێ. خۆراکی ئەمیبا رەنگە روەکێکی تاکخانەی لە ئەمیبا بچوکتر بێ کە جولە ناکات و جێگیرە وەکو قەوزەو، یان رەنگە زیندەوەرێکی زۆر

بچوکی بە جولە بێ. سەیر لەوەدایە ئەمیبا.. ئەو پێکهاتە سادەیە کە مێشکو کۆئەندامی دەماریشی نیە، ئەنجا جیاوازی لەنێوان خۆراکە بزێوو نەبزێوەکانی دەکات، ئەگەر زیندەوەرێکی بزێو بێ ئەوا بە وریایی‌و دور لە زیندەوەرەکە چەند پەل‌و قۆڵێکی بۆ رادەهێڵێ پاشان گلی دەداتەوە، بەڵام گەر خۆراکەکەی نەبزێو بێ ئەوا بێباکانە قۆڵی لیٚ دەهاڵێنێ‌و لە خۆی دەگرێ چونکە دەزانێ لە بەری راناکات.

ئایە زیندەوەرێکی بچوکی وەکو ئەمیبا ئەگەر بە میکرۆسکۆب نەبێ هەر نابینرێ، نەمێشکو نە کۆئەندامی دەمارو نە چاوو نە هیچ هەستەوەرێکی هەیە چۆن ئەم هەمو شتە دەزانێ؟.

ئەوجا کاتێ خۆراکەکە گل دەداتەوە لە ناو لەشیدا بە دڵۆپە ئاوێك دەورە دەدرێ. ئەوکات لەشی ئەمیباکە ئەنزیمێکی ترشی هەرسکەر دەردەدات تا نێچیرەکەی پێ بکوژێ، نەخۆ هێشتا گیانی تێدا مابێ. پاشان ئەنزیمێکی قلّیەیی دەردەدات چونکە گرنگترین ئەنزیم ئەوەیە ماددەی پرۆتینی هەرس بکاتو، ئەگەر لە نێوەندێکی قلّیەدا نەبێ کاریگەری نابێ.

## سوڕی خوێن

سوڕی خوێن لە گیانەوەراندا جیاوازەو بە جۆرەها رێگە ئەنجام دەدرێ. هەروەها دڵی هەر جۆرەیان بە جۆرێکە، بەڵام لە ئەنجامدا هەمان ئامانج وەدی دێنن کە بریتیە لە سوڕانی خوێن بە هەمو لەشدا.

گەر لە دڵی مرۆڤو زۆر گیانەوەری دیکەش رامێنین دەبینین ئەم ئەندامە دانستەو شێوە دانسقەیە، لە چەند ژورێك پێکدێت کە رێڕەوەکانیان بە هۆی زمانەوە لەگەڵ یەکدیدا بەندە، ئەرکی زمانەکانیش ئەوەیە رێگە بە خوێن بدەن تەنها بە یەك ئاراستە تێپەڕێتو ئاڕاستەکەی تری لیٚ بەربەست بکەن، هەمان شت ئەو زمانانە لە لولە گەورەکانی خوێنیشدا هەنو هەمان مەبەست وەدیدێنن.

تۆڕی لولە خوێنهێنەرو خوێنبەرو مولولەکانی خوێن شێوەیەکی وایان هەیە پیاو لەبەریدا سەرسام ببێ. خوێنبەرەکان تا دێ لكو پۆپی بچوكو بچوکتریان لیٚ دەبێتەوە تا دەگاتە مولولەی زۆر بچوك کە دیوارێکی زۆر تەنکیان هەیە، مەبەست لەم تەنکیەش ئەوەیە هیمۆگلۆبینەکان بتوانن لەگەڵ شانەکانی لەش ئاڵوگۆڕی ئۆکسجین‌و دوانەئۆکسیدی کاربۆن بکەن.

خڕۆکە سورەکانی خوێن لە شوێنە جیاجیاکانی لەشدا هەم ئۆکسجین دەبەخشن‌و هەم دوەم ئۆکسیدی کاربۆن وەردەگرن‌و دەیبەنەوە سیەکان‌و لەوێدا ئۆکسجین وەردەگرنەوەو لە دوەم ئۆکسیدی کاربۆنیش رزگار دەبن، ئیتر بەردەوام بەم جۆرە.

دڵ بە درێژایی ژیانی بە ترپەیەکی رەزمدار لێدەدات، هەندێ لە ژورەکانی گرژ دەبن‌و هەندێکی دیش دەکشێن تاکو خوێنی بە ئۆکسجین بگەیەننە لولەکانی خوێن‌و پاشانیش لە دوای سوڕانی بە لەشدا خوێنی بە دوەم ئۆکسیدی کاربۆن بێنێتەوەو بینێرتەوە سیەکان‌و لەوێدا لە دوەم ئۆکسیدی کاربۆن رزگاری ببێ‌و ئۆکسجین وەرگرێتەوە.

لە ناو لەشی مرۆڤ‌و زۆران گیانەوەری تریشدا زۆر جۆرە شلەی وەکو خوێن‌و لیمف هاموشۆ دەکەن. لیمف پێناوێکە لە نێوان خوێن‌و شانەکاندا، هەر یەك لەم شلانە ئەرکی دیاری خۆی هەیە.

خوێن چەند ئەرکێکی هەیە. لەوانە گەیاندنی خۆراکە بۆ هەمو شوێنەکانی لەش. جا ئەگەر گیانەوەرێك خوێنی نەبێ وەکو کرمی جگەر ئەوا پێکهاتەی لەشی ئەم جۆرە گیانەوەرانە بە جۆرێکی وایە بەرێگەیەکی تر خۆراك بگاتە هەمو لەشی.

خوێنی لەشی ئێمەو زۆر گیانەوەری تر لە شلەیەك پێك دێت جۆرەها خانەی ئەرك جیاوازی تێدا مەلە دەکەن پێیان دەڵێن خڕۆکەی سورو خڕۆکەی سپی.

خڕۆکەی سور وەکو وتمان ئەرکی هەناسەی لە ئەستۆیە، بەڵام خڕۆکە سپیەکان چەندین شێوەو ئەرکی جیاوازیان هەیە، هەندێکیان ئەرکیان قوتدانی میکرۆبەکانە کە دێنە ناو لەش، وەکو ئەمیبا هەڵیان دەلوشن.

ئێمە رۆژانە بە شەوو بە رۆژ لەگەڵ هەڵکێشانی هەناسەدا ملیۆنان میکرۆب ئاوا دەکەین کەچی نەخۆشیش ناکەوین، لەبەر ئەوەی خڕۆکەی سپی توانای هەیە لەکاتی تەنگانەدا رەوتی خوێن ببەزێنێ‌و بچێتە شانەکان‌و میکرۆبەکان هەڵلوشێ‌و لەناویان ببات. بۆیە نەخۆش ناکەوین مەگەر لەو کاتانەی لەبەر هۆیەك رێژەی ئەو میکرۆبانە گەلێك زۆر بێ‌و بەرگری لەشمان لاواز بێ ئەنجا توشی نەخۆشی ببین.

## پێکهاتەی هەستی بونەوەران

زۆربەی بونەوەران ئەندامی هەستی وەکو چاوو کەپوو دەستپێکەوتن‌و گوێیان هەیە. پێکهاتەی چاوی شیردەرەکانیش هەموی وەکو یەکە. پێکهاتێکی تا بڵێی سەمەرو هاڵۆزە.

چاو هاوێنەیەکی هەیە پێشوازی لە تیشك دەکات، هەروەها فەتحەیەکیشی هەیە تیشکی پێدا تێپەڕ دەبێ تا تیشکەکە هاوێنەکە ببڕێ. ئەم فەتحە لە خۆوە تەسك‌و بەرین دەبێ، ئەگەر روناکی کز بێ‌و دنیا تاریك بێ بەرین دەبێ‌و، ئەگەر روناکی بە تین بێ‌و دنیا روناك بێ ئەوا تەسك دەبێتەوە.

حیکمەتەکەش ئەوەیە کە دنیا تاریك بێ چاو پێویستی بە روناکیەکی زۆرتر هەیە تا ببینێ، بەڵام کە روناکی بەتینەو دنیا روناکە پێویستی بە روناکیەکی کەمتر هەیە.

چاوی مرۆڤ لە روناکیەکی کزو تاریکیشدا دەبینێ، کەچی ئاوەزی مرۆڤ تا ئێستا نەیتوانیوە ئامێرێکی وێنەگری وا دابهێنێ لەم جۆرە تاریکیانە ببینێ.

چاوی هەنگ دەتوانی تیشکی ژور وەنەوشەیی ببینێ، کەچی چاوی کوندەبۆ تیشکی ژێر سور دەبینێ کە ئێمە نایبینین ئەم تیشکە تیشکێکی گەرمیە، لەبەر ئەوە کوندەبۆ دەتوانێ لە تاریکی ئەنگوستەچاودا مشك ببینێ، تیشکەکەش لە لەشە گەرمەکەیەوە پەخش دەبێ.

ئینجا تیشك لە هاوێنەوە تێدەپەڕێ‌و دەکەوێتە سەر تۆڕەی چاو کە لە بنی بنەوەی چاودایە. تۆڕەی چاو لە نۆ چینی جیاواز پێك دێت‌و ئەستورایی سەرجەمیان لە ئەستورایی روپەڕێك پتر نیە. چینی ژێر ژێرەوە لە ملیۆنان چیلکەو قوچەکی هاوسازو رێك پێکدێت کە توانای جیاکردنەوەی رەنگەکانیان هەیە.

دەماری چاویش ئەو هەستانە دەگەیەنێتە مەڵبەندێکی دیاری کراوی مێشك، لەوێدا ئەم هەستانە دەکرێنە وێنەی بینراوی ئەوتۆ چاو بیانبینێ.

ئەم هەمو رێکوپێکیەی هاوێنەو چیلکەو قوچەك‌و وردەکاریانەی چاو دەبێ هەموی لە یەك کاتدا پەیدا بوبێ چونکە ئەگەر هەموی بە یەکجار پەیدا نەبوبێ ئەوا بینین مەحاڵ بو.. ئایە چۆن ئەم هەمو هۆکارە توانیان لە یەك کاتدا یەکتری تەواو بکەن؟.

زانستی بیرکاری پێمان دەڵێ: پەیدابونی ئەم هەمو هۆکارە لە یەك کاتدا مەحاڵە بە ڕێکەوت بوبێ. تەنانەت کامیرەی تەلەفزیۆنیش هەر بریتیە لە دوبارە سازدانەوەی کرداری بینینی چاو. بەڵکو تا ئێستا ئەوەی زیری مرۆڤایەتی پێی گەیشتوە هەر بریتی بوە لە دوبارە سازدانەوەیەکی ساکاری ئەو میکانیزمەی لە چاوی ئافەریداندا هەیە.

جا ئایە ئەگەر کامیرەیەکی سادەو سادەکار پێویستی بە ئاوەزو زیری هەبێ بۆ ئەوەی دروستی بکات؟ ئاخر چۆن دەکرێ چاوی مرۆڤو بونەوەران بە ڕێکەوت پەیدا بوبێ؟.

ئەوەی جێی سەرنجە هەر گیانەوەرێك پێویستی بە بینین هەبێ خودا چاوی بۆ ئەفراندوە ئەگەر چی لەگەڵ چاوی مرۆڤ جیاوازیەکی زۆریشی هەبێ بەڵام هەمان ئامانج دەپێکن کە بریتیە لە بینین.

- بۆ وێنە کرمی زەوی چەند خانەیەکی لە پێستەکەیدا هەیە هەست بە روناکیو تاریکی دەکات، هەڵبەت ئەم کرمە لە نێو تاریکێیو تونێڵەکانی خاكو خۆڵدا دەژێو هەر ئەوەندەی پێویستە.

هەروەها چاوی مێرولە تەواو جیاوازە لەگەڵ چاوی مرۆڤو مەیمونو چێڵو کیسەڵو ماسی. وێڕای ئەم جیاوازیە مێرولە ئەو شتانە دەبینێ کە تەماشای دەکات.

ئاشکرایە جیاجیایی لە هۆکارەکانی بینین و هەمان ئامانجو پێکان؛ ناکرێ لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە پەیدا بوبێ بەڵکو لە ئەنجامی نەخشەیەکی داڕێژراوو ئامانجێکی دیاری کراوەوە هاتۆتە ئارا.

خودای بەخشندە هەستو پەی پێبردنی بە پێی پێویست بە هەمو بونەوەرێکی بەخشیوە، بۆ وێنە مێشی ناو ماڵان ئایە پێویستی بەوە نیە خۆراکەکەی ببینێ؟ هەروەها هەمو جولەیەکیش کە مەترسی بخاتە ژیانی؟ بۆیەکا دەبینین خوای پەروەردگار جوتە چاوێکی پێ بەخشیوە ئێمە پێی دەڵێین چاوی ئاوێتە.

هەر چاوێکی لە سەدان یەکەی پێکچوی لەتەك یەك پێکهاتوە. هەر یەکێکیان خاڵێکی شتەکە دەبینێ. کۆی بینیی ئەم خاڵانە وا دەکا مێش ئامانجی خۆی بە تەواوی ببینێ.

خودای گەورە جگە لەم جوتە چاوە، سێ چاوی دیکەشی پێبەخشیوە ئێمە پێیان دەڵێن چاوی سادە، لە لوتکەی سەریدایەو ئەرکیان پەیبردنە بە هەر جولەیەك لە ئاستی بکرێ، لەبەر ئەو چاوانە خەریکە گرتنی مێشان ببێتە مەحاڵ.

## شێوەی ئێسقان و جومگە

ئێسقانی مرۆڤو گیانەوەری تریش لە جومگەکانەوە دەبزوێن. لە کاتی جولاندا بە هاوسازیەکی زۆر سەیر کۆمەڵێك ماسولکە گرژ دەبن‌و کۆمەڵێکی دیش خاو دەبنەوە، بۆیە مرۆڤ یان گیانەوەر بۆ هەر لایەك بیەوێ دەتوانێ دەست‌و قاچ‌و پەنجەی بجولێنێ.

جومگەکان بە جۆرێکی وا شێوە ڕێژ کراون بە هاسانی لەسەر یەك بخرێن بێئەوەی گیانەوەرەکە هەست بە هیچ لێخشاندنێك بکات. هەروەها بڕبڕەکانی پشت بە جۆرێکی وا شێوە ڕێژ کراوە بەرگەی فشاربگرێ‌و لەیەك نەخشێن.

تێك بەستراونیان بە جۆرێکی زۆر سەیرو تاسێنەرە، بڕبڕەی پشت درکە پەتکی لەخۆ گرتوەو دەیپارێزێ، هەروەك چۆن کەللەی سەر مێشك دەپارێزێ.

درکە پەتك لە نێو سەرجەمی ئەو کونانە درێژ دەبێتەوە کە هەمو بڕەیەك هەیتی‌و سەرجەمیان کەناڵێك پێکدێنن.

هەمو ئەو شێوەرێژیە دەبێ لەیەك کاتدا هاتبێتە ئارا، چونکە ئەگەر یەك جێ شپرێوی تێ کەوتبێ ئەوا بزوانەکە نەدەهاتە ئارا. جا ئایە ئەم هەمو ڕێکوپێکیە دەکرێ لەیەك کاتدا بە ڕێکەوت هاتبێتە ئارا؟!.

## مەبەست لە مەیینی خوێندا

ئاشکرایە لەشمان کە شوێنێکی بریندار دەبێ زۆری پێ ناچێ ئەو خوێنەی لە لولە بریندارەکانەوە دەردەچێ دەمەیێت. مەبەست لەم مەیینەدا ئەوەیە لولە بریندارەکە دابخات‌و چیتر خوێن نەپژێت. خۆ ئەگەر ئەم مەیینە روی نەدابا ئەوا تامردن ئەو خوێنە هەر بەردەبو. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر مشورخۆری ئافەریدگار کە ویستویەتی ئەم بونەوەرە زندوە بپارێزێ. سارێژ بونی برین لە زیندەوەرە جۆراو جۆرەکاندا بە ڕێگەی جیاواز رو دەدات. بەڵام ئەنجام هەر هەمان شتە.

بۆ وێنە لە زۆربەی مێروواندا خوێن نامەیێت بەڵکو ئەگەر شوێنێکی زیندەوەرەکە -بۆ نمونە سیسرکە- بریندار بێت. ئەوا کۆمەڵێك خانە لە جێی برینەکەدا کۆ دەبنەوەو دەمی برینەکە قەپات دەکەن تا ئیتر خوێن نەپژێت.

کەچی لە هەندێ مێرو و جرووجانەوەری تردا وەکو ئێمەی مرۆڤ خوێنەکەیان دەمەیێ.

بونی چەند رێگایەك بۆ هەمان ئامانج -وەکو پێشتر گوتم- بەڵگەیەکی قسەبڕە بۆ بونی ئافەریدگارێکی تاك و تەنیاو مشورخۆر کە جۆرەها رێگە فەراهەم دێنێ بۆ ئەوەی هەمان ئامانج وەدی بێنێ کە بریتیە لە پاراستنی گیانی بونەوەرانی زندو.

کاری رێکەوت نیە کە دەبینین موەکانی دوشاخەی هەستی نێرینەی پێشکە لەهی مێینە درێژترن. پێشو وا لێك دەدرایەوە گوایە تەنها بۆ جوانی نێرینەیە تا لەبەر چاوی مێینەکەی شۆخ و جوان بێ، بەڵام ئێستا زانراوە ئەم موانەی بە دوشاخەی هەستی نێرینەوە هاتون توانای وەرگرتنی ئەم دەنگە تایبەتەیان هەیە کە مێینەکان لە دوراییەکی زۆرەوە پەخشی دەکەن.

دەنگەکان شەپۆلێکیان هەیە تا رادەیەکی زۆر بە شەپۆلی رادیۆیی دەچێت، نێرینە دو شاخە هەستیەکەی -ئێمەو ئاریێل ئاسا- بۆ هەمو لایەك ئاراستەی دەکات تا جوانتر وەریگرێ. لە بارێکی تایبەتیدا ئەم دو شاخەیە دەنگی مێینەکەی زۆر بە ساف وەردەگرێ و، لە رێگەی ئەو گۆشەیەی شاخەکەی پێکی دێنێ نێرینەکە بە غەریزەوە دەزانێ شوێنی مێینەکەی لە کوێیەو هەر بە خێرا بۆ ئەوێ دەفرێ و لەگەڵ یەکدا جوت دەبن.

بەڵێ، خودای ئافەریدگار ئەو توانستە سەمەرەی بەو پێشکەیە بەخشیوە کە بە هۆیەوە دەتوانێ لە دوری دەیان مەتر دەنگی مێینەکەی وەرگرێ، لەگەڵ ئەوەی لە هەوادا چەندین شەپۆلی تریش هەن. ئەم پێشکەیە ئەگەر ئەم توانایەی نەبوایە نەیدەتوانی مێینەی خۆی بدۆزێتەوەو وەچە لە دوای وەچە بخاتەوە.

ئەو پێشکەیە دو شاخەکەی وەك ئێزگەیەکی رادیۆییەو بە ملیۆنان ساڵ بەر لە مرۆڤ پێش ئەوەی نهێنیەکانی ناردنی بێتەل بدۆزێتەوە، بەکاری هێناوە.

ئایا دەکرێ ئەمە کاری رێکەوتێکی کوێر بێ؟.

مێرو هەیە مێینەکانیان لە تاریکیدا بە لەرەلەرەیەکی دیاری کراو ورشە (کلپە) دەدات و نێرینەکانیان بێنەوەی لەگەڵ لەرەلەری مێروی تر لێی تێکەڵ بێ

دەیناسێتەوە. نێرینەکە ئەو ورشانە دەبینێ –رەنگە چاوی مرۆڤ هەر نەیبینێ– یەکسەر وەدوای دەچێت تا ئارەزووەکەی جێبەجێ بکاتو جۆریان نەفەوتێ.

بیرکاریزانی قەت رێ بەوە نادات ئەم جۆرە شتانە سروشتێکی بێئاوەز هێنابێتیە ئارا، بەڵکو نەخشەیەکە خودای ئافەریدگار داێرشتوەو دەزانێ چ دەکاو چ رێك دەخاتو بۆ ئەم مەبەستەش نایابترین نەخشە دادەرێژێ تا ئامانجێکی دیاری کراو وەدی بێنێ.

ئەو ئافەریدگارەی توانای قسەکردنی بە مرۆڤ بەخشیوە، جۆرە زمانێکی بە زیندەوەرەکانی تریش بەخشیوە تا لەیەکدی بگەن. لێرەدا بوارمان نیە سەدان وێنەو نمونەی وا لەو بارەوە بێنینەوە کە زیندەوەران غەریزەی وایان بۆ نەخشە کێشراوە بەڵگەیە بۆ خاوەن هێزێکی ژیر.

زیندەوەر نازانێ بۆ وادەکات بەڵکو فروسمانی پێ دەدرێ بە غەریزەوە ئەم شتانە بکات، ئیدی بێئەوەی بیر بکاتەوە ئەنجامیان دەدات تا ئامانجێکی مەزن وەدیبێنێ بەڵام بێئەوەی بزانێ مەبەست چیە؟.

ئێمە دەزانین جوینی خواردن کردارێکی پێویستە بۆ هەرسکردن.

پێکهاتەو ریزبەندی ددانی گیانەوەرە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ یەکتر جیاوازە بەڵام هەموویان یەك ئامانج دەپێکن ئەویش جوینی خواردنە. لە مرۆڤ دا ددان بە ریزبەندیەکی زۆر سەیر رێکخراوە، برەو کەڵبەو کارێژەکانی بە شێوەیەکی تایبەتو نایاب رێکخراونو هەر جۆرەشیان ئەرکێکی تایبەتی راپەرێنێ.

ئەو گیانەوەرانەش کە پێویستیان بە ددان نیە، نیانە. وەکو ئەوانەی لەسەر خۆراکی شلە دەژین بەرێگەی تایبەتی قوم لەخۆراکە شلەکە دەدەنو دەیگەیەنتە کەناڵی هەرسکردن.

ئەو گیانەوەرانەی دداندارن لە کاتی جوینی خواردندا لیکە رژێنەکانی ناو دەمی لیکاو دەردەدەن تا یارمەتی جوین بدەنو ببێتە سەرەتای کرداری هەرسکردن. لە گەدەو ریخۆڵەشدا وەکو پێشتر باسمان کرد ئەنزیمەکان دەرژێنرێنو هەر یەکەیان کار لە جۆرە خۆراکێکی تایبەتی دەکاتو کار لەوانی تر ناکات.

# چۆن کۆرپە دروست دەبێ؟

کرداری دروست بونی کۆرپەی هەر گیانەوەرێك شتێکی نایابو سەرنج ڕاکێشە. زانست هەر بەوەندە وەستاوە تێبینی قۆناغەکانی بکاتو ڕاڤەیان بکات، بەڵام لە ئاست زانینی چیەتیەکەیو ئەو هێزەش دەستەوسانە کە ئەنگێزەی وەدیهێنانی ئامانجی دروستکردنی کۆرپەلەیە.

سەرەتای ئەم کردارە وا دەست پێ دەکات: خانەی نێرینە (تۆو) بەرەو خانەی مێینە (هێلکۆکەی مێینە) دەچێتو دەیپیتێنێو (خانەی پیتراو) پێکدێت. پاشان بە سای هێزێکی شاراوەو سەمەر خانە پیتراوەکە دابەش دەبێ بۆ دو خانەو پاشان بۆ چوارو پاشان بۆ هەشتو بەم جۆرە... تا دەگاتە ژمارەیەکی دیاریکراو. سەرجەم ئەم خانانە شێوەی دەنکە (تۆو)ێك وەردگرن.

پاشان ئەم تۆپەڵەیە بۆشایەکی تێ دەکەوێو وەکو (گۆ)یەکی ناو بۆشی لێ دێت کە دیوارەکەی لە یەك چین خانە پێك دێت. پاشان نیوەی گۆیەکە نقومی نیوەکەی دی دەبێتو لە ئەنجامدا دو دیواری خانەیی بۆ دروست دەبێ. لە هەمو گیانەوەرێکدا تەنانەت مرۆڤیش لەنێوان ئەم دو چینەدا چینێکی تری خانەیی کە چینی سێیەمە دروست دەبێو خانەکان لە دابەشبوندا بەردەوام دەبن تا ئەو کاتەی هەر چینێك لەم سێ چینە چەند ئەندامێك دروست دەکات.

چینی دەرەوە پێستو کۆئەندامی دەمارو هەندێ ئەندامی تر دروست دەکات، چینی ناوەڕاست ماسولکەو ئێسقان دروست دەکات، چینی ژورەوەش هەندێ ئەندامی کۆئەندامی هەرس دروست دەکات.

دابەشبونی خانەکان هەر بەردەوام دەبێ تا کۆرپەلەکە لە نێو منداڵدانی شیردەرەکان یان لە ناو هێلکەی گیانەوەرە هێلکەکەرەکان دروست دەبێت.

ئینجا دوای ئەوەی کۆرپەلە گەشەی کردو تەواو ڕەخسکا ئەوا گوشاری منداڵدانەکە فڕێی دەداتە دەرەوە، یاخود هێلکەکە دەشکێنێو دێتە دەرەوە.

## ڕێنوێنی خودا بۆ ڕووەکـان

بە ڕێکەوت نیە ڕەگوڕیشاڵی ڕوەك بەرەو ژێـر زەوی ئاراستـە دەبـێ و لاسـك و قەدیش بەرەو ئاسمان.

بۆ وێنە ئەگەر دەنکە تۆوێکی پاقلە یان هەر ڕوەکێکی تـر بچێنـین ئـەوا ئـەو ڕەگـەی لـە تۆوەکـە چەکـەرە دەکـات بـەرەو زەویو قەدەکـەش بـەرەو سـەرەوە ئاراستە دەبێ.

خۆ ئەگەر تۆوەکە سەربەرەو ژێر بکەینەوەو ڕوی ڕەگەکەی بەرەو سەرەوەو ڕوی قەدەکەشـی بـەرەو خـوارەوە بـێ، ئـەوا شـتێکی سـەیرو سـەمەر دەبینـین، ڕەگەکە دەچەمێتـەوە تـا بـەرەو خـوارەوە داکشـێ و قەدەکـەش دەچەمێتـەوە تـا بەرەو سەرەوە هەڵکشێ.

ئەو هێزەی ڕەگو قەد وا دەبزوێنێ قەت ناکرێ لە ئەنجامی ڕێکەوتەوە پەیدا بوبێ، بەڵکو ئەنجامی نەخشەیەکی ژیرانەی ئەوتۆیـە ئـەزمون و هەڵـە هەڵنـەگرێ. چونکـە ڕەگ چـاری ناچـارەو هـەر دەبـێ ڕوەو زەوی چەکـەرە بکـات و ڕۆبچـێ تـا بتوانێ خۆراکی پێویست و ئاو بگەیەنێتە ڕوەکەکەو وشك نـەبێ، هـەروەها قـەدیش مەرجە ڕو لە هەوا بێت تا بتوانێ خۆراکی خۆی بە کرداری ڕۆشنەپێکهاتن لـە خـۆر وەرگرێ.

## پێکـهاتەی گـوێ

پێکهاتەی گوێی مرۆڤ و گیانـەوەری تریش قـەت ڕێـی تێناچـێ بـە ڕێکـەوت هاتبێتە ئارا.

گوێ پەردەیەکی هەیەو لەرەلەرەکانی دەنگ وەردەگرێ و دەلەرێتەوە ئـەو لەرەلەرانەش کار لە سێ ئێسقانی وردو لەتەك یەك و پوخت ڕێکخراو دەکات. دەبێ پەستانی هەردو دیوی پەردە یەکسان بێ، بۆ ئەم مەبەستەش لـە پشـت پـەردەوە کونێك (جۆگەیەك) درێژ دەبێتەوەو دەگاتە کونی کەپو.

لەبەشی ناوەوەشـدا ئێسـقانێکی وەکـو هێلکـە شـەیتانۆکە (ڕوبنـدن)ی شـێوە پێچـاوپێچی هەیـەو، ئـەرکی شـیکردنەوەی دەنـگو جیـا کردنـەوەی ئـاوازە جیاوازەکانە، هەروەها هاوسەنگی لەشیش دەپـارێزێ، خـۆ ئەگـەر ئەمـە نەبوایـە هەنگاوێکیش چیە نەماندەتوانی بە هاوسەنگی بیهاوێین و لاکەلا دڕۆیشتین.

لەرەلەرەكانیش بەهۆی دەمارەكانەوە دەگەیەندرێنە مەڵبەندی بیستن كە لە مێشكدایە. ئەوەش تا مرۆڤ و ئاژەڵان بتوانن دەنگی جیاجیا ببیستن و لە یەكیان جیا بكەنەوە.

ئایە ئەم هەمو حەشاماتە دەكرێ بە یەكجار بە رێكەوت پەیدا بوبن؟ دیدەوەریەكانی شێمانەی بیركاریزانی قەت قبوڵی ناكات.

## كرمی فیلاریا

زیندەوەران شتی هێندە سەرسوڕێنەرو سەمەریان تێدایە ناكرێ هەژماریش بكرێن، هەموشی بەڵگەن بۆ بونی هێزێكی وا كە نەخشەو ڕێوشوێن دادەڕێژێ تا بونەوەران لە ژیان بمێننەوەو تونا بن... شتی وا هەیە مەحاڵە ڕێكەوت پشكی تێدا هەبێ.

بۆ وێنە ئەوەی لە سوڕی ژیانی ئەو كرمانە رودەدات دەبنە هۆی توشبونی نەخۆشی فیل پێیان دەڵێن: كرمی فیلاریا.

ئەم جۆرە كرمە لە دۆخی تەواویدا لە ناو لیمفە لولەو لیمفە رژێنەكانی مرۆڤدا دەژێ‌و دەبێتە مایەی داخستنی لیمفە لولەكان‌و هەندێ ئەندامی تری لەش بە تایبەتی قاچێك یان هەردو قاچی مرۆڤەكە هەڵدەئاوسێ‌و قەبارەكەی وەكو قاچی فیلی لێ دێت.

ئەم جۆرە كرمە كاتێ لە ناو لیمفە لولەكانی مرۆڤدان جوت دەبن‌و كرمۆڵەی بچوك دەخەنەوە، كرمۆڵەكان لە لیمفە لولەكانەوە دەچنە ناو لولەكانی خوێن، بەڵام ئەگەر ئەم كرمۆڵانە هەر لە ناو لولە خوێنەكانی مرۆڤ بمێننەوە ئەوا ناتوانن سوڕی ژیانیان تەواو بكەن بۆیە ناچارن خۆ بگوازنەوە لەشی جۆرە مێشولەیەك‌و لەوێدا سوڕەكەیان تەواو بكەن، هەر بەم جۆرەش توانای لێكدی گرتنەوە پەیدا دەكات. كە مێشولەیەك دێت‌و خوێنی مرۆڤێك هەڵدەمژێ ئەوا كۆمەڵێك لەو كرمۆڵانەش هەڵدەمژێ تا لە ناو لەشی مێشولەكەدا گەشەی خۆی تەواو بكات. ئەو كات توانای تەنینەوە پەیدا دەكات‌و كاتێك هەمان مێشولە خوێنی لەشی مرۆڤێكی تر هەڵدەمژێ ئەوا بۆ لەشی مرۆڤەكە دەتەنێتەوە.

زانایان تەقەلایەكی زۆریان دا تا بتوانن لە خوێنی توشبوانەوە ئەم كرمە وەدەست بێنن، بەڵام بێ هودە بو. تا ئەو كاتەی شتێكی سەیر رویدا، زانایەك تا درەنگی شەو لە ئەزمونگەكەی مابۆوەو نەنوستبو، چەند دڵۆپێكی خوێنی

توشبوێکی وەرگرتو لە ژێر میکرۆسکۆب سەرنجیدا، ژمارەیەکی زۆری ئەم کرمانەی تێدایە. بۆ سبەینێ بەڕۆژ چەند دلۆپە خوێنێکی هەمان توشبوی هێناو سەرنجیدا هیچ کرمێکی تێدا نەدۆزیەوە. لەو کارە سەیرماو داما بۆچی لەخوێنی شەواندا وەدیار دەکەوێو لەخوێنی رۆژاندا بزردەبێ؟.

پاشان رون بۆوە ئەم کرمە بە شەوان دەچێتە لولە خوێنەکانی ژورەوەو بە رۆژیش دەگەڕێتەوە لولەخوێنەکانی نزیك پێست. هۆی ئەوەیە مێشولەکان کە لەم ناوچانەدا لەسەر خوێنی مرۆڤ دەژین تەنها بەشەو چوستو چالاك دەبن، کرمەکانیش بۆیە دێنە لولە خوێنەکانی نزیك پێست تا لەگەڵ هەڵمژینی خوێن بگوازرێنەوە لەشی مێشولەکەو لەوێدا سوڕی ژیانیان تەواو بکەن. هەڵبەت ئەم کرمانە نازانن بۆ وا دەکەنو هیچ شتێکیش لە بارەی مێشولەکان نازانن بەڵام بە هۆکارێکی غەریزی ئەو کارە ئەنجام دەدەن، هێزێکی باڵا هەیە ئەم هەڵسو کەوتەی پێ دەکات.

سەیر ئەوەیە لە هەندێ هەرێمی دنیادا مێشولە هەیە بە رۆژ گورجو گۆڵ دەبێو خوێن دەمژێ، کەچی بەشەو خامۆشە. لەو شوێنانەدا کرمەکان بە پێچەوانەوە هەڵسو کەوت دەکەن، بە شەوان لە لولە خوێنەکانی ژورەوە خۆی مات دەکاتو بە رۆژانیش دێتە لولە خوێنەکانی نزیك لە پێست، ئەوەش تاکو لەگەڵ مژینی خوێن هەڵلوشێن. ئەرێ ئەمەش رێکەوتە؟!.

## ئەندازەگیری و رێنوێنی لە ئەفراندنی گەردوندا

ئەگەر پێکهاتەی بونەوەران جێ بهێڵین کە مێشك لەبەریدا دەتاسێو کەمێکیش لەو گەردونە بەرفراوانو سەمەرەیە رابمێنین هەر بە یەکجار دۆش دادەمێنین.

یەك لەو سەمەرانە موگناتیسی شاراوەی گۆی زەمینە کە ئێمەی بە خۆ بەند کردوەو لێناگەڕێ بە ئاسماندا پەرشو بڵاو بین، ئەم موگناتیسەی زەوی لە موگناتیسی ئاسایی جیاوازە ئێمە دەزانین موگناتیسی ئاسایی توانای کێش کردنی هەندێ شتی هەیەو لە هەندێکیش دەسەوسانە وەکو گۆشتو کاغەزو شوشەو بەردو لمو ئاوو ئەوانە... بەڵام موگناتیسی زەوی هەمو شتێك کێش دەکات، شوشە، دار، بەرد، لم، ئاو، کاغەز.. هەمو شتێك، گەر وا نەبوایە هیچ شتێك بەسەر زەویەوە نەدەما.

# گەورەیی ئەستێرو هەسارەکان

(فردهوێل)ی مامۆستای فەلەکناسی لە زانکۆی لەندەن لە پەڕتوکەکەی بە ناوی (سروشتی گەردون)دا دەڵێ:

هەندێ ئەستێرە هەن قەبارەیەکی هێندە گەورەیان هەیە مێشک ناتوانێ بیهێنێتە بەر چاو. زەوی لە چاو ئەو جۆرە هەسارانە وەك دەنکە لمێك وایە لە چاو زەوی.

فرەزانی ئەمریکی (کریستی مۆریسۆن) سەرۆکی پێشوی زانستە ئەکادیمیەکانی نیۆیۆرك بو، دەڵێ: شیرازەی هەسارەکانی ئاسمان کاری رێکەوت نیەو هەر ئەوە نیە لە ئاسماندا پەرش‌و بڵاو بوبن، بۆ وێنە مانگ چارەگێکی دوریەکەی ئێستای لە زەوی نزیکتر بوا؛ هەڵچون‌و داچونی ئاو ئەوەندە بەهێزو بەتەوژم دەبو وشکانی هەمو نقوم دەکرد. لە ئەنجامدا هەمو گیانەوەرە وشکانیەکان دەمردن. هەروەها ئەگەر تەوەرەی زەوی نزیکەی (٢٣) بیست‌و سێ پلە لار نەبوایە ئەوا لە هەردو جەمسەرەکاندا یەکبینە هەر شەو دەبو، هەروەها لە هەڵمی ئاوی ئۆقیانوسەکان بڕێکی گەلێ زۆر سەهۆڵ لەهەردو جەمسەرەکان دروست دەبوو فشارێکی گەورەی دەخستە سەر هێلی کەمەرەی زەوی‌و بەرینتری دەکرد. باران بارین هێندە کەم دەبۆوە بە جۆرێك ژیان لەسەر زەوی مەحاڵ بو.

خێرایی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا نزیکەی هەزار میلە لە یەك سەعاتدا خۆ ئەگەر وا گریمان بکەین سەد میل لە یەك سەعات بێ ئەوا شەوو رۆژ درێژتر دەبون بەجۆرێك سەرجەم روەك‌و گیانەوەران لەبەر تاوی گەرمی هەتاو دەسوتان‌و لە شەویشدا دەیانبەستا.

(جود) تا ماوەیەك پێش ئێستاش مامۆستای فەلسەفە بوە لە زانکۆی لەندەن، لە پەڕتوکێکی قەبارە گەورەدا لە روی زانستی‌و فەلسەفیەوە هەمو ئەگەرو شێمانەیەکی تۆژیوەتەوە ئاخۆ ئەم گەردونە چۆن دروست بوە؟، ژیان لەسەر روی زەویدا چۆن پەیدا بوە؟.. لە ئاکامدا تۆژینەوەیەکەی پوخت کردۆتەوەو دەڵێ: گەردون دەبێ لە ئەنجامی کردارێکی دانسقەی ئەفراندنەوە پەیدا بوبێ[1].

---

[1] خودا راستی فەرموە: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾ سورەتی فوصیلەت/٥٣.

قورئانی پیرۆز نیشانەکانی گەردون دەکاتە بابەتێك و گفتوگۆی پێدەکات و بیانویان پێدەبڕێ ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ۞ وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ۞ وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ ۞ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ۞﴾ سورەتی ئەنبیاء/٣٠-٣٣، واتە: مەگەر بێبڕوایان نەیانبینیوە ئەرزو ئاسمانەکان یەکپارچە بون و پاشان لە یەکمان جودا کردنەوەو هەمو شتێکمان لە ئاو فەراهەم هێناوە، ئایە بڕوا ناهێنن. لە زەویدا چەندین چیاو کێوی تۆکمەو پتەومان فەراهەم هێناوە نەبادا زەوی بلەخشێ؛ هەروەها چەندین ڕەوازمان لە کێوەکانەوە فەراهەم هێناوە تا بتوانن پێیدا گوزەر بکەن و بەرژەوەندی خۆیان بەدەست بێنن. هەروەها ئاسمانی کردۆتە بانێکی پارێزراو، کەچی ئەوان "لە نیشانەکانی ئاسمان -وەکو ئەستێرەو ڕۆژو مانگو تاد- ڕو وەریدەگێڕن". هەر خودا شەوو ڕۆژو خۆرو مانگی ئەفراندوە کە هەر یەك لەمانە لە ئاسمانی خۆیدا مەلە دەکات و دەخولێتەوە.

هەروەها گەندەڵی بیروباوەڕەکانیان لە بارەی پەرستراوەکانیان ڕەت دەکاتەوەو پێیان دەڵێ پەرستراوەکانیان خاوەنی سیفەتەکانی پەروەردگارێتی و خواوەندێتی نین و شایەنی پەرستن و خوایەتی نین ﴿قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَامٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَىٰ آللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ۞ أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنْبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُنْبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَٰهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ۞ أَمَّنْ جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَإِلَٰهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ۞ أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَعَ اللَّهِ

قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ ۞ أَمَّنْ يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَنْ يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ أَإِلَٰهٌ مَعَ اللَّهِ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ۞ أَمَّنْ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ۞﴾ سورەتی نەمل/٥٩-٦٤، واتە: سوپاس بۆ خوداو سڵاو بۆ بەندە هەڵبژاردەکانی کە پێغەمبەرانن، ئایا خودا باشترە یاخۆ ئەو هاوبەشانەی دەیپەرستن؟. کێ ئەرزو ئاسمانەکانی ئەفراندوەو کێ ئاوی لە ئاسمان باراندوە کە بوەتە مایەی روانی باخچەی جوانو بەروبوم ئێوە بۆتان ناکرێ درەختێکیش برووێنن. ئایە خواوەندێکیتر لەگەڵ خودا هەیە ئەم کارە بکات؟! نەخێر، بەڵکو ئەوان هاوبەش بۆ خودا پەیدا دەکەن.

کێ زەوی بە ئارامی فەراهەم هێناوەو روبارو کانیاوی تێدا هەڵقوڵاندوە هەروەها چەندین کێوو چیای لەسەر دروست کردوە، هەروەها لە نێوان دو دەریادا لەمپەرێکی داناوە تا تێکەڵ نەبن، ئایە لەگەڵ خودا هیچ خواوەندی تر هەیە؟! نەخێر بەڵکو زۆربەیان نازانن. کێ نزای ناگزوران وەلامدەداتەوەو گرفتاریو تەنگانەیان لەسەر هەڵدەگرێو نەوە لە دو نەوە جێنشینتان دەکات؟ ئایە لەگەڵ خودا پەرستراوی تر هەیە؟ نەخێر بەڵکو زۆر کەمتان یادەوەر دەبن. کێ لە تاریکستانەکانی بەژو دەریاکان رێنوێنتان دەکات؟ کێ لە پێش باران باریندا وەکو موژدەیەك با دەنێرێ ئایە هیچ خواوەندێکی تر لەگەڵ خودا هەیە؟، خودا بەرزترە لەو هاوبەشییەی بۆی پەیدا دەکەن. کێ ئافەریدە پەیدا دەکاتو پاشان کەدەمرێ زندوی دەکاتەوە. کێ لە ئەرزو ئاسمان بژێویتان پێدەبەخشێ؟ ئایە خودا خواوەندی دیکەی هەیە. ئەگەر راست دەکەن بەڵگە بێنن.

ئەم ئایەتانە ئەو بەناو پەرستراوانە رون دەکاتەوە کە شایەنی پەرستن نین. رون دەکاتەوە هەر خودایە ئەرزو ئاسمانی ئەفراندوەو باران دەبارێنێو گوڵو گوڵزارو باخچەو مێرگ دەروێنێ کە نەفسی پێ شادمانو چاوی پێ گەش دەبێ. هەر خودایە زەوی سەقامگیر کردوەو روباری بەکەنارەکانیدا رەوان کردوەو شاخو چیاکانی جێگیر کردوە... هەر خودا شایەنی پەرستنەو بێ لەوی شیاوی پەرستنو روتێکردن نیە.

ئێمەش لەسەرمانە ئەم جۆرە بەڵگانە بۆ بەرانگژی بیروباوەڕە خوانەناسان بێنینەوە. چونکە پێغەمبەران لە پێشودا زۆر بەڵگەیان لەم جۆرە هێناوەتەوەو بیانوی بیروایان پێ بریوە. ئەوەتانێ پێغەمبەر ئیبراهیمی ئازیزی خودا گفتوگۆ لەگەڵ ئەو هاوبەشپەرستە دەکاتو بە بەڵگەی لەم جۆرە بیانوی دەبڕێ، هەروەها دەمکوتی دەکاتو بیری دەتاسێنێ.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٨ واتە: مەگەر تەماشای ئەو رکەبەرەت نەکردوە مشتومڕ لەگەڵ ئیبراهیم دەکات کە ئیبراهیم گوتی: پەروەردگار دەمرێنێو دەژیێنێ. گوتی منیش دەمرێنمو دەژیێنم. ئیبراهیم گوتی: خودا خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێنێو لە رۆژئاواوە نشینی دەکات، تۆ لە خۆرنشینەوە هەڵیبێنە. بیبڕوا دەمکوت بو، خودا ستەمکاران رێنوێن ناکات.

موسا پێغەمبەریش ئەم جۆرە بەڵگە هێنانەوەیەی لە روی یاخیبوی سەردەمی خۆی کە فیرعەونی سەرکەش بو، بەکاردێنێ. پێغەمبەر موسا بەردەوام بەڵگە لە دوای بەڵگەی بۆ دەهێنایەوە تا قسەی بڕیو ناچار هەڕەشەو گورەشەی لە موسا کرد. ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ الْعَالَمِينَ ✿ قَالَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنْتُمْ مُوقِنِينَ ✿ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ✿ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ ✿ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ الَّذِي أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ✿ قَالَ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ ✿ قَالَ لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ ✿﴾ سورەتی شوعەراء/٢٣-٢٩، واتە: فیرعەون گوتی: پەروەردگاری جیهانیان چیە؟ گوتی: پەروەردگاری ئەرزو ئاسمانەکانو نێوانیانە ئەگەر ئاوەردارن. فیرعەون بەوانەی دەوروپشتی خۆی گوت: گوێتان لێیە؟! موسا گوتی: پەروەردگاری ئێوەو باوانی پێشوتانە. فیرعەون گوتی: ئەو پێغەمبەرەی بۆ ئێوە هاتوە شێتە. موسا گوتی پەروەردگاری رۆژئاواو رۆژهەڵاتو نێوانیانە ئەگەر

ئاوەز بەکار بێنن. فیرعەون گوتی: ئەگەر بێ لەمن خواوەندێکی تر هەڵبژێری بەندت دەکەم.

هەڵبەت هەمو پێغەمبەرەکان ئەم جۆرە بەڵگەخوازیەیان بەکار هێناوە، بگەڕێوە بۆ سورەتی ئیبراهیم ئایەتی (٩-١٠) کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى قَالُوا إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا تُرِيدُونَ أَنْ تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ ۞﴾، هەروەها قسەی گەلە بێبڕواکانی وەکو گەلی نوحو عادو سەمودو نەوەکانی پاشوشیان، ئەنجا سەیرکە وەڵامی پەیامبەران وتویانە ﴿أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى قَالُوا إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا تُرِيدُونَ أَنْ تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾ سورەتی ئیبراهیم/١٠، پێغەمبەران بۆ راستی بانگەشەکەیان ئەوەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە کە خوای گەورە وەدیهێنەری ئەرزو ئاسمانەکانە.

## بێبڕوایی لالوت و خۆ پێ پەسندە، ئەگەر چی بەڵگەکان رون و رەوانیش بێ

لەبەر ئەوەیە قورئان بە سەیرمانێکەوە پرسیارێك ئاراستەی بێبڕوایی بێبڕواکان دەکات، چونکە بەڵگەو سەلمێنەکان رونو ئاشکران ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنْتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٨.

له ئایەتێکی دی دا دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ ۞ الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ۞ فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ ۞﴾ سورەتی ئینفگار/٦-٨، واتە: ئەی مرۆڤ لە ئاست خودای پەروەردگارت چ شتێك تەفرەی داوی کە تۆی ئافەریدە کردو تۆی کردۆتە کەسێکی ژیرو بیسەرو بیناو رێکی خستوی، بە هەر شێوەیەك خۆی ویستبی فەراهەمی هێنای.

ئەگەر مرۆڤ لە خۆی‌و گەردون ورد بێتەوە هەڵبەت رو دەکاتە ئافەریدگارو بە مەزن‌و گەورەی دەزانێ، بۆیەکا بێبڕوایی‌و سەرکەشیی بێبڕواکان شتێکی رمونن‌و سەیرە ﴿ مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ۞ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ۞ أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا ۞ وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا ۞ وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا ۞ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ۞﴾ سورەتی نوح/١٣-١٨، واتە: ئەوە چیتانە؟ بۆچی خودا بە گەورە ناگرن‌و لێی ناترسن، کە ئێوەی بە چەندین قۆناغ ئافەریدە کردوە. نەیاندیتوە خودا چۆن حەفت ئاسمانی بە شێوەی چین چین لەسەر یەك ئافەریدە کردوە. لە ئاسمانی دنیادا خۆری درەخشان‌و مانگی روناکی بۆ ئێوە داناوە. ئێوەی لە خاك ئافەریدە کردوە. پاشان دەمرن دەبن بە خاك‌و پاشان هەر لە خاك زندوتان دەکاتەوە.

## هۆی رێنوێنی نەبون بە بەڵگەکانی گەردون

نیشانە گەردونیەکانی پەروەردگار تەنها بۆ دڵانی یادوەرو پەرستکار هەقیقەتە فروسماویەکەی پەخشان دەکات، چونکە ئەو دڵانە پەردەی لەسەر هەڵماڵراوەو گەش‌و گوشاد بوەو لەگەڵ گەردونی پڕ سەمەرە بەندە.

قورئان‌و سروشتی خودایی پەیوەندی لە نێوان دڵی مرۆڤ‌و رەزامەندی ئەم گەردونە بەرفراوان‌و جوانە پەیدا کردوە، ئەم پەیوەندیە وا دەکات مرۆڤ کە لە پەرتوکی گەردون ورد دەبێتەوە کاریگەری لە دڵدا وەدی بێنێ‌و رەوشت‌و بەها لە ژیانیدا بچەسپێنێ.

قورئان ئەم جۆرە پەیوەندیە لەنێوان ناسین‌و زانین‌و مرۆڤی زانیارو ناسەر پەیدا دەکات. بۆیە قورئان دەفەرموێ ئەوانەی بە نیشانەکانی گەردون ڕێنوێن دەبن پۆلێکی دیاری کراون لە خەڵکی ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُولِي الأَلْبَابِ ۞ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ۞﴾ سورەتی ئالی عیمران/١٩٠-١٩١، واتە: ئافەریدەکردنی ئەرزو ئاسمان‌و جیاوازی شەوو ڕۆژ چەندین نیشانی تێدایە بۆ ئەوانەی خاوەن هۆشن. ئەوانەی بە راوەستاون‌و بە دانیشتن‌و بە پاڵکەوتنیش یادی خودا دەکەن‌و بیر لە ئافەریدەکردنی ئاسمانەکان‌و زەوی دەکەنەوەو دەڵێن: پەروەردگار! تۆ ئەم ئەرزو ئاسمانەت بە بێهودە ئافەریدە نەکردوە،پاکی بۆ تۆ. لە سزای ئاگری دۆزەخ رزگارمان بکە.

ئەم جۆرە کەسانە لەنیشانەکانی گەردون بەهرەوەر دەبن چونکە لە سنوری رواڵەتی بینینی چاو هەڵوەستە ناکەن بەڵکو تەماشای ئەو دەسەڵات‌و توانایەش دەکەن کە ئەم گەردونە بەڕێوە دەبات. ئەوانە چاوو گوێ‌و ئاوەزو هزریان لەم بوارەدا بە باشترین شێوەو بەپێی ڕێبەرایەتی ئایەتەکانی قورئان بەکار دێنن‌و بەمەش دەگەنە باشترین ئاکام ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ ۞ وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُم مِّن فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ۞ وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ۞﴾ سورەتی روم/٢١-٢٤، واتە: یەکێك لە نیشانەکانی خودا ئەوەیە لە رەگەزی خۆتانەوە خێزانی بۆ ئافەریدە کردون تا ئارامی پێ بگرن، هەروەها خۆشەویستی‌و میهرەوەری لە نێوفەراهەم هێناون. کەسانێك ئەگەر بیر بکەنەوە نیشانەی زۆری لێ وەدی دەکەن. یەکێکی تر لە نیشانەکانی ئافەریدە کردنی ئەرزو ئاسمانەکان‌و جیاوازی نێوان زمان‌و رەنگ‌و روتانە. ئەمەش نیشانەگەلێکی بۆ زانایان تێدایە. یەکێکی تر لە نیشانەکانی خەوی شەو و ڕۆژو هەوڵ‌و کۆششتانە بۆ

وەدەست هێنانی بژێوتان. نیشـانە گـەلێکی بۆ ژنـەوایان تێدایـە. یـەکێکی تـر لـە نیشانەکانی ئەوەیە بروسکو هەورە تریشقەی ترسێنەرو خۆشیبەخشتان پێنیشـان دەدات، هەروەها لە ئاسماندا باران دەبارێنیّو خاکی مردوی پیّ زنـدو دەکاتـەوە. نیشانە گەلێکی بۆ هۆشمەندان تێدایە. نیشانەکان بۆ ئەوانـە وەدەر دەکـەون کـە رێوشوێنی راستو دروستو بۆ ئامانجیخوازراو بیرو گوێو ئاوەزیان بەکار دێنن.

بەلاّم بێبڕواکان تەنها روداو و دیاردەکە دەبینن و هزروئاوەزیان تێپـەڕ ناکـات دەسەلاّتی دروستکارو ئافەریدگار ببینیّو پەی بە حیکمەتی ئەفراندنەکەش نابـەن ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ سورەتی روم/٧.

لەبەر ئەوەیە لـە نیشـانە گەردونیـەکان بەهرەمـەند نـابن چونکـە لەروانگـەی قورئانەوە ناڕوانن ﴿قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ سورەتی یونس/١٠١، واتە: بلیّ: دە تەماشای ئـەرزو ئاسمانـان بکەن بزانن چی تێدایە؟ بەلاّم نیشانەو هەڕەشەکاری بۆ گەلێك گەر بـڕوا نـەهێنێت داد نادات!.

بۆیـەکا قورئـان سـەرکونەی بێبڕواو سەرکەشـان دەکـات چونکـە وازیـان لـە وردبونەوەو تێڕامانو پەندوەری هێناوە ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ﴾ سـورەتی ئـەعراف/١٨٥، واتـە: مەگـەر بیریـان لـە بونـەوەری نێـوان ئەرزو ئاسمانەکانو هەرچی خودا ئافەریدەی کـردوە نەکردۆتـەوە، رەنگـە بمـرنو پیّ رانەگەن.

ئەگەر بە قورئان بڕوا نەهێنن ئەدی بە چ بڕوا دێنن؟!.

## هەڵوێستی زانستی تازە :

سەیید قوتب –بەر میهری خوا بیّ– دەڵیّ: (ئـەو رێوشـوێنە توێژینەوەییـەی لـەم سـەردەمەدا پێـی دەڵێـن (زانسـتی) پـەیوەندی نێـوان گـەردونو مـرۆڤ دەپچڕێنیّ. هەڵبەت مرۆڤ ژینو ژیواری راستو راستەریّ نابیّ مەگـەر ئـەو کاتـەی

لێدانی دڵیان لەگەڵ ڕەزمی گەردوندا هاوچون بێ کە سەروساختێکی بەهێز لە نێوان دڵو ڕەزمەکانی گەردون پەیدا بکات.

هەر زانیاریەك لە بارەی هەر ئەستێرەو خولگەیەکی ئەستێران یا لەبارەی هەر تایبەتمەندیەکی ڕوەكو گیانەوەران، یان بە شێوەیەکی گشتی لە بارەی گەردونو ئەو جیهانە زندوو نازندوانەی تێدایە -ئەگەر جیهانی نازندو بێ گیان هەبێ یا تەنانەت ئەگەر شتێکی نازندوش هەبێ!-، هەر زانیاریەکی (زانستی)پێویستە یەکسەر بۆ ڕەزمی دڵی مرۆڤو هۆگریەکی ئاشنای گەردون بگەڕێندرێتەوە، بکرێتە ئاشناییەکی ئەوتۆ پەیوەندی دۆستانەی نێوان خەڵكو شتو گیانەوەران پتەو بکات. بخرێتە ئەو خانەیەی هەمو گەردونو ئەوەی تێیدایە خودا ئافەریدگارێتی.

جا هەر زانیاریو زانستو توێژینەوەیەك تێکەڵ بەو ئامانجە زندو و فروسەمەندە نەبێ کە کار لە ژینی مرۆڤ دەکات، ئەوا زانیاریەکی کەمو کوڕو زانستێکی درۆزنو توێژینەوەیەکی نەزۆکی لێ دەردەچێ.

گەردون پەڕتوکێکی هەقو کراوەیە، بە هەمو زمانێك دەخوێندرێتەوە، بە هەمو ئامرازێك پەی پێ دەبردرێ. هەم سادەو ساویلکەیەکی نێو ڕەشماڵو ساباتان هەم شارستانێکی نێو کۆشكو باڵاخانان هەردوکیان بە ئەندازەی فامو ژیری خۆیان دەتوانن لێی وەخوێنن.

ئەم پەڕتوکە هەردەم کراوەیە ئەگەر یەکێك بە هەستێکی هەقناسانە بیخوێنێتەوە توێشوی هەقی لێ وەدەست دێنێ. ﴿تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾ سورەتی ق/٨، واتە: بۆ هەمو بەندەیەکی ژیوان بەرچاو ڕونیو یادوەریە.

بەڵام زانستی تازە ئەم چاو ساغیە تارومار دەکات، پەیوەندی نێوان دڵی مرۆڤو گەردونی ڕاستبێژ دەبڕێ. لەبەر ئەوەی لە کەللە سەری ئەو کەسانەوە گوزارشت دەکرێ کە ئەفسانەی (ڕێوشوێنی زانستیانە) مێشکی پەردەپۆش کردون.. ئەو ڕێوشوێنەی نێوانی گەردونو بونەوەرانی تێیدا دەژین بێپایان دەکات.

خۆ ڕێوشوێنی بڕوایی تەنانەت تۆزکاڵێکیش لە بەرو بومی ڕێوشوێنی زانستی کەم ناکاتەوە لە بارەی پەی بردن بە هەقیقەتە تەنیاکان، بەڵام ئەو هەڵدەستێ ئەم هەقیقەتە تەنیا تەنیایانە بەیەکەوە گرێ دەداتو بە هەقیقەتە گەورەکانی

بەند دەکاتو دڵی مرۆڤی پێ پەیوەند دەکات، مەبەست پەیوەند کردنیەتی بە ڕێساکانی گەردونو هەقیقەتەکانی بون. پاشان ئەم ڕێساو هەقیقەتانە بۆ ڕەزمێکی ئەوتۆ دەگۆڕێ کار لە هەستو ژینی مرۆڤ بکات. نەك بیکاتە چەند زانیاریەکی وشكو ماتی نێو هزرو، ڕازی جوانی خۆی لێ بزر بکات.

کەواتە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەکان دەبێ بە ڕێوشوێنی بڕوایی هەوێن بکرێن وهەقیقەتە زانستیەکان لەگەڵ پەیوەندی بەهێزی ڕێوشوێنی بڕوایی بەند بکرێن..)[٥٠].

## کردەوە، ئاوێنەی دەسەڵات و هەندێ کاری بکەرە

ئەگەر سەرنج بدەینە ئامێرێك بە وردەکاری دروست کرابێو پێکهاتەیەکی داهێنانەی هەبێو ئەوپەڕی هێزو پتەوی هەبێ، بە باشترین شێوە ئیش بکات. لەو کاتەدا بیئەوەی بیرێکی زۆری لێ بکەینەوە یەکسەر دەزانین دروستکارەکەی خاوەنی ژیانو زانستو تواناو ویستو هەمو ئەو سیفەتانەیە ئامێرەکە بۆمان ئاشکرا دەکات.

گەردونیش ئاوا ئاماژە بۆ چەندین سیفەتی ئافەریدگار دەکاتو دەیناسێنێ.

### تواناو زانستی خودا

ئەم گەردونە بەرینو فرەوانو زەبەلاحە کە بە پێی سیستەمێکی ورد بەڕێوە دەچێت، دەبێ دروستکارێکی بە تواناو زانای هەبێ. خودا ئافەریدانی بەو شێرازە دانسقە و سیستەمە ڕێکو پێکە ئەفراندوە بۆ ئەوەیە تا تواناو زانستی خۆیمان پێ بناسێنێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ سورەتی طەلاق/١٢، واتە: خودا ئەو خودایەیە حەفت ئاسمانو زەویو هاوچۆنی زەوی ئەفراندوە، بارانی بۆ دەبارێنێ، تا بزانن خودا توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیەو پەی بە هەمو شتێك بردوە.

ئەو زانستەی کە گەردونیش بەڕێوە دەبات، دەبێ زانستێکی تەواو و هەموگر بێ ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ

---

[٥٠] في ظلال القرآن –سورەتی ق– ئایەتی/٨: ﴿ تَبْصِرَةً وَذِكْرَى لِكُلِّ عَبْدٍ مُنِيبٍ ﴾.

﴿الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ سورەتی ئەنعام/٥٩ واتە: خـودا هەرچی لە بەژو دەریایە دەیزانێ، هەر گەڵایەك بوەرێ دەیزانێ هەر دەنكۆڵەیـەكی نێـو تـاریكێیی نـاخی زەوی‌و هـەر وشـك‌و تەڕییـەك هـەبێ خـودا هـەر هـەموی لـە پەڕتوكێكی رون‌و ئاشكرا نوسیوە.

## خودا دانایە

گەر یەكێك لە گەردون رامێنێ تێدەگا چەند بە پوختـی‌و نایـابی ئـەفرێنراوە، هەمو شتێكی بە ئـەندازەی گونجـاوی خـۆی لـە شـوێنی گونجـاوی خـۆی دانـاوەو ئەوپەڕی دانایی‌و دانستەیی تێدا كراوە ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ سـورەتی نـەمل/٨٨، واتـە: تـۆ چیـاو شاخەكان دەبینی وا دەزانـی راوەسـتاوە كـەچی خێرا وەكـو هـەور دەڕوات ئەمـە دروستكراوی خودایە كە هەمو شتێكی بە پوختەیی دروست كردوە.

﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الإِنسَانِ مِن طِينٍ﴾ سـورەتی سەجدە/٧، واتـە: ئـەو خودایـەی هـەمو شـتێكی بـە پوختـەیی دروسـت كـردوە، مرۆڤیشی لە سەرەتا لە قوڕ ئەفراندوە.

سەرەنجدەری ئەم گەردونە جگە لە تەواوی‌و پوختی ونایابی چی تر نابینـێ تەنانەت بۆ یەك دانە خەوش‌و كەمایەسیش بگەڕێت نایدۆزێتەوە ﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَانِ مِن تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِن فُطُورٍ ۞ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ۞﴾ سورەتی مولك/٣-٤، واتە: ئەو خودایـەی حـەفت ئاسمـانی چـین چینـی ئافـەریدە كـردوەو كەمایەسیەكی تێدا نابینیـەوە، دیسـان بـۆ دوەم جـار بنـوارە بـەڵام تەنـها چـاوت ماندوو شەكەت دەبێ‌و هیچ كەمایەسی تێدا بەدی ناكەیت.

## چەندین سیفەتی تر

ئەوانەی هێنامانەوە تەنها چەند نمونەیەك بون خودا ئافەریدانی پێ یادەوەر دەكات ئەگینا بە دەیان‌و سەدان نمونەی تر هەن هەر یەكێكیان بگری لەسەر یەكتایی خوداو سیفەتەكانی بەڵگەیەكی رۆشن‌و ئاڵ‌و والآیە، خودا لە كۆتایی هەر ئایەتێك بزانە چ دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَتُصْبِحُ الْأَرْضُ مُخْضَرَّةً إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ۝ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ۝ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ وَالْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ۝﴾ سورەتی حەج/٦٣-٦٥، واتە: نەتدیوە خودا باران دەبارێنێ‌و زەوی پێ كەسك دەكات خودا بەخشندەو كارزانە. هەرچی لە ئاسمانەكان‌و زەویدایە هی ئەوە. خودا بێنیازی سوپاسكراوە. ئەدی نەتدیوە هەرچی لە زەویدایە خودا بۆ ئێوەی تەسخیر كردوە هەروەها بە ودمی خودا كەشتی لەسەر ئاودا دەڕوات‌و ئاسمانی گرتوە نەبادا بكەوێتە سەر زەوی مەگەر ئەو كاتەی ودمی بدات. خودا بە بەزەیی‌و بەخشندەیە بۆ خەڵك.

## خودا شایەنی پەرستنە

ئەو رێنوێنیەی لە ئەنجامی بیر كردنەوەو تێوە رامانەوە وەئەنجام دێت، بەرەو پەرستنی تەنها خودا كەمندكێشمان دەكات، ئەو خودایەی تەنها خۆی ئافەریدگارو مشورخۆری ئەرز وئاسمانەكانەو بژێویدەرو مرێنەرو ژیێنەرە... بۆیە هەر خودا شایەنی پەرستنە ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ۝ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَّكُمْ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝﴾ سورەتی بەقەرە/٢١-٢٢، واتە: خەڵكینە! ئەو خودایە بپەرستن كە ئێوەو خەڵكانی پێش ئێوەی ئافەریدە كردوە تاوەكو لە خوا بترسن، ئەو خودایەی زەوی بۆ راخستون‌و ئاسمانی بۆ كردونەتە بان، بارانتان بۆ دەبارێنێ‌و بەروبومتان

بۆ سەوز دەکات تا ببێتە بژێوتان، کەواتە هاوبەش بۆ خودا دامەنێن لە کاتێکدا دەزانن خودا ئاوەهای کردوە نەك هاوبەش ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ سورەتی فاطیر/٣، واتە: ئەی خەڵکینە یادی بەخششەکانی خودا بکەن ئایە ئافەریدگاری تر جگە لە خودا هەیە لە ئاسمان و زەوی بژێویتان بداتێ. جگە لە خودا خواوەندی تر نیە جا چۆن رو لە هەق وەردەگێڕن؟!.

بەڵێ، بەم رێگایە وەکو هێنامانەوە- قورئان بەناو خوداکانی پوچەڵ کردو رونی کردەوە شایەنی پەرستن نین ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ۞ هَٰذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ ۞﴾ سورەتی لوقمان/١٠-١١.

هەر لەبەر ئەوەیە بە نیشانەکانی گەردون و بەرێوەبردنی کاروباری گەردون و مشورگێرانی؛ بەندەکانی یادەوەر دەکات و پاشانیش لە زۆربەی ئایەتەکانی قورئاندا دەفەرموێ ﴿ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ واتە: ئەوە خوداتانە هەر ئەو شایەنی پەرستنە. گوێ بدێرە ئەم ئایەتەو تێبینی دوا وتەکەشی بکە ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ۞ خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ الْأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ۞﴾ سورەتی زومەر/٥-٦، واتە: خودا ئەرز و ئاسمانەکانی بە هەق ئەفراندوە. شەو دەخاتە ناو رۆژو رۆژ دەخاتە ناو شەو، خۆرومانگی رام کردوە هەر یەکەیان تا ئاکامی خۆی لە خولگەکەی دەسوڕێتەوەو دەڕوات، ئاگادار بن خودا زاڵ و لێبوردنگارە. ئێوەی لە یەك کەس

ئەفراندوە پاشان هەشت جوتە مەڕو وشترو رەشەوڵاغی بۆ فەراهەم هێنـان. ئێـوە کە لە زگی دایکتانن قۆناغ قۆناغ ئافەریدەتان دەکات لەنێو سێ تاریکێیی. ئەوەیە خودای پەورەردگارتان، پاشایی بۆ ئەوە، هیچ خواوەندێکی تر نیە جگە لـەو، جـا چۆن رو وەردەگێڕن.

*** *** ***

# ناسینی خودا لەڕێی دەقەکانی قورئان و سوننەتدا

"چەند تۆژینەوەیەکە لە بارەی ناو و سیفەتەکانی خودا" :

پێشتریش باسمان کرد ڕێگەی دوەم کە خودامان پێ دەناسێنێ، دەقەکانی قورئانو فەرمودەیە کە ڕاستەوخۆ سیفەتو ناوو کردەوەکانی خودامان بۆ ڕون دەکاتەوە.

ئەم ڕێگەیە ڕێگەیەکی پڕشنگدارو دڵنیاکەرە چونکە هیچ گومانو تێکەڵیو پێکەڵی لەوە پەیدا نابێ لە ڕێی وتەکانی خوداو و پێغەمبەر ﷺ خودا بناسرێ.

لە زۆربەی بابەتەکاندا تەقەلامان داوە تەنها دەقەکان بێنینەوە لەبەر ئەوەی لە دەقو وتەی مرۆڤ گەلێ کاراترو ڕونترە. مکوڕ بومە لەسەر ئەوەی دەقەکان واتاوێر نەکەم و نەیان شێوێنم وەکو زۆر لە نوسەرانی پێشو وایان کردوە تا لەگەڵ بۆچون و پێودانگی مرۆڤ بیسازێنن، کەچی ڕاستو خوازراو ئەوەیە مرۆڤ بۆچونو پێودانگی خۆی لەگەڵ دەقەکاندا بسازێنێ.

## مەودای ئاوەز لە پەی بردن بە سیفەتەکانی خودا

ئەو سیفەتانەی قورئانو فەرمودە باسیان لێوە کردوە دو جۆرن:

یەکەم/ ئەو سیفەتانەی ئاوەزی مرۆڤ ناتوانێ بزانێ چۆنەو پەی پێ ببات و، تەنها بە پێی دەقەکان دەناسرێن. وەکو دەستو روی پەروەردگار.

دوەم/ ئەو سیفەتانەی ئاوەزیش دەتوانێ پەی پێ ببات وەکو سیفەتمەندبونی بە تواناو دانایی.

ئێمەش تەواوی سیفەتەکان یاد ناکەین، بەڵکو سەرپاکێکی لێ باس دەکەین، مەبەست ڕون بکاتەوەو خوازراو بداتە دەستو تێڕوانینێکی پێویستیش ببەخشێ.

### ١- خودا زاتی هەیە :

خودا زاتێکی وای هەیە کە بە هەمو سیفەتێکی تەواو سیفەتمەندەو لە هەمو کەمایەسیەك پاکە.

هەر یەکێك وتەکانی قورئان بخوێنێتەوە بە دڵنیایی دەزانێ خودا زاتی هەیە ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٥، واتە: خودا ئەو خودایەیە هیچ خواوەندێکی تر نیە کە زندو و قەییومەو ناخەوێ و ناوەنەوزێ.

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝ اللَّهُ الصَّمَدُ ۝ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ۝﴾ سورەتی ئیخلاص.

کاتێك بێبڕواکان ویستیان خوبەیب بکوژن ئەم سروتەی دەگوت[51]:

| | |
|---|---|
| ولست أبالي حين أقتل مسلماً | على أي جنب كان في الله مصرعي |
| وذلك في ذات الإله وإن يشأ | يبارك على أوصال شلو ممزع |

بێباکم گەر بە موسوڵمانی بکوژرێم لەکام روبێ گرنگ نیە لە رێی خوایە بکوژرێم، مادەم لە پێناو خودایە گەر خوا حەز کا پێز دەخاتە پارچە پارچەکانی جەستەی براوم.

## زات و سیفەتەکانی خودا بە هی ئافەریدەکانی ناچێت

زات و سیفەتەکانی خودا بە هیچ یەکێك لە ئافەریدەکێی ناچێت، خودا هەمو سیفەتێکی تەواوە، کەسی تر ئەم تەواویەی نیە بەڵکو هەر دەبێ کەمایەسیەکی هەبێ و ئاتاجی کەسانی تر بێ.

خودا لەو بارەوە کە هیچ لێکچونێك لەنێوان خوداو ئافەریدەکانی نیە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ سورەتی شورا/١١، واتە: هیچ شتێك بە خودا ناچێ و خودا ژنەواو بینایە.

٢- نەفسی خودا:

خودا نەفسێکی وای هەیە لە تەواوێتی و شکۆی ئەو بوەشێتەوەو بە نەفسی ئافەریدانی ناچێت. خودا ئەمەی لە ئایەتە موحکەمەکانی قورئاندا پێ راگەیاندوین ﴿وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا فَقُلْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ

[51] صەحیحی بوخاری/ پەرتوکی یەکخواناسی.

الرَّحْمَةَ أَنَّهُ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوءًا بِجَهَالَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ سورەتی ئەنعام/٥٤، واتە: گەر ئەوانەی بروایان هێناوە هاتنە لات پێیان بڵێ سڵاوتان پێشکەش. خودا میهری لەسەر نەفسی خۆی نوسیوە هەر یەکێك بە نەزانی گوناهێك بکاتو پاشان ژیوان بێتەوەو چاکسازی بکات ئەوا خودا لێبوردەو میهرەبانە.

خودا رایگەیاندوە نەفسی هەیەو، بەزەیی لەسەر خۆی نوسیوە، خودا لەم ئایەتەدا فەرمویەتی ﴿قُل لِّمَن مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُل لِّلَّهِ كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ سورەتی ئەنعام/١٢، واتە: بڵێ ئەوەی لە ئەرزو ئاسمانەکاندا هەیە هی کێیە بڵێ هی ئەو خودایەیە کە میهرو بەزەیی لەسەر نەفسی خۆی نوسیوە.

پێغەمبەر لە بارەی ئەم نوسینە شتێکی لێ راڤە کردوە، ئەبو هورەیرە دەگێرێتەوە: ((**لما قضى الله كتب في كتابه على نفسه فهو موضوع عنده: إن رحمتي سبقت غضبي**)) بوخاریو موسلیم گێرایتیانەوە واتە: کە خودا ئافەریدانی ئەفراند کە لە پەڕتوکەکەیدا لە لای خۆی دانراوە لەسەر نەفسی نوسیوە: میهرم پێش خەشمم کەوتوە. لە گێرانەوەیەکی تردا دەڵێ ((**تغلب غضبي**: بەسەر خەشمم دا زاڵ بو)).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾ سورەتی ئالی عیمران/٣٠، واتە: خودا لە نەفسی خۆی دەتانترسێنێ، خودا میهرەبانە بۆ بەندەکانی.

پێغەمبەرانیش (نەفس)یان بۆ خودا سەلماندوە ئەوەتانێ پێغەمبەر عیسا لەگەڵ پەروەردگاری شکۆداردا دەڵێ: ﴿تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ﴾ سورەتی مائیدە/١١٦، واتە: تۆ دەزانی لە نەفسی مندا چ هەیە بەڵام من نازانم لە نەفسی تۆدا چ هەیە، تۆ فرەزانی پەنامەکی.

هەروەها خودا بە موسا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جِئْتَ عَلَى قَدَرٍ يَا مُوسَى ۞ وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي ۞﴾ سورەتی تاها/٤٠-٤١، واتە: ئەی موسا تۆ بە پێی ئەو بڕیارە پێشوەی من هاتی قسەت لەگەڵدا بکەم‌و من تۆم بۆ نەفسی خۆم هەڵبژاردوە بۆ خەڵك ببیە پێغەمبەر.

خودا لە نەفسی خۆی یادی ئەوانە دەکاتەوە کە لە ناخی خۆیان یادی خودا دەکەنەوە، بوخاری‌و موسلیم‌و تیرمذی‌و هی تریش لە ئەبا هورەیرەیان گێڕاوەتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**يقول الله أنا مع عبدي حين يذكرني، فإن ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي، وإن ذكرني في ملأ ذكرته في ملأ خير منهم**))، واتە: لەو کاتەی بەندە یادی من دەکاتەوە من ئاگاداریمە، گەر لە ناخی خۆی یادم بکاتەوە لە نەفسی خۆم یادی دەکەمەوە. گەر لە کۆڕێك یادم بکاتەوە لە کۆڕێکی باشتر یادی دەکەمەوە.

بە یادی خودا نەفسی پەروەردگاری بەرزو پیرۆزمان خۆشنود بێ، لە فەرمودەیەکی موسلیمدا لە ئیبنوعەبباسەوە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ شەو لە لای جوەیریەی خێزانی بو، بۆ نوێژی بەیانی دەرچوو (جوەیریە)ش لەسەر بەرماڵ دانیشتبوو تا چێشتەنگاو هەر یادی خودای دەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((**لم تزالي جالسة بعدي؟ قالت: نعم، قال: قد قلت بعدك أربع كلمات لو وزنت بهن لوزنتهن: سبحان الله وبحمده، عدد خلقه، ومداد كلماته، ورضا نفسه، وزينة عرشه**)) واتە: هێشتا دانیشتوی‌و یادی خودا دەکەی؟ گوتی: بەڵێ، فەرموی: لەدوای تۆدا چوار وشەم گوتوە ئەگەر لەگەڵ هەمو یادەکانی تۆ بکێشرین هەمبەر دەبن، ئەمانەن (واتاکەیان: بەقەد ژمارەی ئافەریدان‌و بە ئەندازەی مەرەکەبی وتەکانی خوداو ئەوەندەی نەفسی خودا پێی خۆشەو بەقەد سەنگی بارەگای؛ پاکی‌و ستایش بۆ خودا) لەم فەرمودەیەدا دەڵێ (**رضا نفسه**).

### ٣- روی پەروەردگار:

خودای پاك‌و بێهاوتا روی هەیە بەڵام بە روی ئافەریدەکانی ناچێ، ئەوە بەڕاست دادەنێین‌و بڕوای پێ دێنین، چونکە خودا ئاوهای پێ راگەیاندوین. پێغەمبەریش ﷺ لە چەندین فەرمودەدا باسی لێوە کردوە.

خودای بەرز دەفەرموێ ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ سورەتی رەحمان/٢٧، واتە: تەنها روی شکۆدارو بەرێزی خودا دەمێنێ. ئیبنوجەریر لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (ذوالجلال والإكرام) سیفەتی روە بۆیە وشەی (ذو) مەرفوعە.

کاتی خۆی هەندێك لە زانایان (رو)یان بۆ خودا نەدەسەلماندو پێیان وابو (ذوالجلال والإكرام) سیفەتی پەوەردگارە نەك روی پەروەردگار.

ئیبنو خوزەیمەی پێشەوا لە وەڵامی ئەم بۆچونەدا دەڵێ: (ئەم جۆرە قسانە یەکێك دەیکات لە زمانی عارەبان ناشارەزا بێ لەبەر ئەوەی خودای بەرزو شکۆمەند دەفەرموێ ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ لێرەدا (وجه) بە (مەرفوع)و (ربّ)یش بە (مەجرور) هاتوە چونکە (وجه)ی بۆ (إضافـة) کراوە. جا ئەگەر (ذوالجلال والإكرام) بۆ (ربّ) بوایە، دەبوایە بفەرموێ (ذي الجلال والإكرام).

هەورەها یەکێکی دی لەو دەقانەی (رو) دەسەلمێنن ئایەتی ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ سورەتی قەصەص/٨٨، واتە: لە رۆژی دواییدا هەمو شتێك تەفرو تونا دەبێ مەگەر روی پەروەردگار.

## کاریگەری بڕوا بون بە (رو)ی پەروەردگار

### ١- کردەوە لە پێناو روی پەروەردگار:

مادەم زانیمان خودای گەورە بڕیاری لەسەر داوە کەواتە لە کردەوەکانماندا دەبێ نیازمان روی پەروەرگار بێ، لەبەر ئەوەی خودا لە ئایەتە موحکەمەکانی قورئاندا رێبەریمان دەکات بۆ ئەوەی لە کردەوەکانمان روی خودامان مەبەست بێ ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ سورەتی قەصەص/٨٨، یەکێکی تر ئایەتی مالبەخشینە لە پێناو روی پەوەردگار ﴿وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ﴾ سورەتی روم/٣٩، واتە: ئەو زەکاتەی لە پێناو روی پەروەردگار بەخشیوتانە پاداشتی چەند چەندانەی لەسەر وەردەگرنەوە.

خودا لـه ستايشـی بـەندە چاكـەكارەكانيدا كـە تەنـها لــە پێنــاو رووی پەروەردگاريان كردەوە ئەنجام دەدەن دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا﴾ سورەتی ئينسان/٩، واتـە: تەنـها لـە پێنـاو رووی پەوروەردگار نانتان دەدەين، پاداشتو سوپاسی ئێوەمان ناوێ.

﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ ۞ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ۞﴾ سورەتی لەيل/١٩-٢٠، واتە: ماڵ بۆ ئەوە نابەخشێ خـەڵكان پاداشـتی بدەنـەوە بـەڵكو لـە پێناو رووی پەروەردگاريدا دەيبەخشێ.

﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ سورەتی كەهف/٢٨، واتە: لەگـەڵ ئەوانـەی بـەيانيانو ئێـواران لـە خـوا دەپاڕێنـەوەو رووی پەوردگاريان مەبەستە، ئارام بگرە.

لە صەحيحی بوخاريشدا هاتوە ((**إن الله قد حرم على النار من قال لا إله إلا الله يبتغي بذلك وجه الله**)) واتە: خـودا ئـاگری دۆزەخـی لـەو كەسـە بێبـەش كردوە لە پێناو رووی پەوەردگاريدا دەڵێ: لا إله إلا الله.

## ٢- پەنا گرتن بە رووی پەروەردگار:

پێغەمبەر ﷺ پـەنای بـە رووی پـەوروەردگار گرتـوە. جابـیری كـوڕی عـەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە ((**لما نزل على رسول الله صلى الله عليه وسلم قوله تعالى:** ﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَىٰ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ﴾ **قال: اعوذ بوجهك،** ﴿أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾ **قـال اعـوذ بوجـهك،** ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ﴾ **قال: هاتـان أهـون و أيسـر**)) رواه البخـاري واتـە: كاتـێ ئەم ئايەتە دابەزی (كە واتاكـەی بـەم جۆرەيـە: ئـەی پێغەمبـەر پێيـان بڵـێ خـودا توانای هەيە سزاتان لە ژوورا بەسەردا بنێرێ).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خودايە! بە رووی پیرۆزت پەنا دەگرم. خودا فــەرمووی (واتاكەی: ياخۆ لە ژێر پێتان) فەرمووی: پەنا دەگرم بە رووی پیرۆزت خودا فەرمووی

(واتاکەی: یان دابڕ دابڕتـان بکـاتو بەدەسـتی یەکدیـەوە بنـاڵێنن) فـەرموی: ئـەم دوانەیان سوكو ئاسانترە.

عەلی ئەبا تالیب خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کـردمو فەرموی: ((**إذا أخذت مضجعك، فقل أعوذ بوجهك الكريم وكلماتك التامّة، من شرّ ما انت آخذ بناصيته..**)) رواه البيهقي في الأسماء والصفات ٣٠٧/١، واتە: گەر چویە سەر جێگای نوستن بڵێ: خودایە بەروی بەڕێزو وتـە تـەواوو بـێ کەمایەسیەکانت لە دەردو بەڵای بەدکاران پەنا دەگرم.

٣- وەڵامدانەوەی داوای ئەوانەی بە روی پەروەردگار تکا دەکەن:

لە فەرمودەدا هاتوە: ((**من استعاذ بالله فأعيذوه، ومن سألكم بوجه الله فاعطوه**)) الأسماء والصفات ٣٠٦/١، واتـە: ئـەوەی گوتـی لـەڕاهی خـودا رێگـەی بدەن، ئەوەی داوایەکی لێکردیو بەڕوی خودا تکێی لێکردی پێی ببەخشە.

٤ – بە حەزرەتبونی دیتنی روی خودا:

ئیبنوجـەریرو ئیبنوخوزەیمـە لـە پـەرتوکی یەکخواناسـیو نەسـائی لــە سـونەنەکەی گێڕایتیانـەوە پێغەمبـەر ﷺ بـەم نزایـە پاڕاواتــەوە: ((**اللـهم بعلمـك الغيـب وقدرتـك علـى الخلـق احيـني مـا كـانت الحيـاة خـيراً لي، وتوفـني إذا كانت الوفاة خيراً لي.**

**اللهم وأسألك خشيتك في الغيب والشهادة.**

**وأسألك كلمة الحق والعدل في الغضب والرضا.**

**وأسألك القصد في الفقر والغنى.**

**وأسألك نعيماً لا يبيد.**

**وأسألك قرة عين لا تنقطع.**

**وأسألك الرضا بعد القضا.**

**وأسألك برد العيش بعد الموت.**

**وأسألك لذة النظر الى وجهك.**

**والشوق الى لقائك في غير ضراء مضرة ولا فتنة مضلة.**

**اللهم زينا بزينة الإيمان واجعلنا هداة مهتدين**)) واتـە: خودایـە! خـۆت زانیاری پەنامەکیو توانات بەسەر ئافەریدان هەیە، خودایــە.. ئەگـەر ژیـانم خـێری منی تێدایە بمژێێنە، ئەگەر مردنم خێری تێدایـە بممرێنـە. خودایـە! لـەتۆ ترسـانی

پەنامەکیو بەرچاوەکیم پێببەخشە. خودایە! لە کاتی تورەییو خۆشنودیدا وتەی هەقم پێببەخشە. لە نەبونیو هەبونیدا دەستبلاو نەبم. خودایە! داوای بەهرەمەندیەکی وات لێ دەکەم تونا نەبێ، داوای چاورونیەکت لێ دەکەم قەت نەبڕێتەوە، داوای خۆشنودی دوای قەدەرت لێ دەکەم. داوای ژینی فێنکی دوای مەرگت لێ دەکەم. داوای چێژی دیداری روت لێ دەکەم. داوای تامەزرۆی دیدارت دەکەم. توشی تەنگانەو بەلای گومراکەر نەبم. خودایە! بە جوانی بڕوا بمرازێنەوەو رێنوێنیمان بکە.

پێغەمبەر ﷺ لەم ئایەتەدا ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ وشەی (زیادة)ی بە بینینی روی پەورەردگار راڤە کردوە. -(بەیهەقی) ئەم وتەیەی لە ئەبا بەکرو حوذەیفە گێڕاوەتەوەو پاشان دەڵێ: (یاوەرو شوێنکەوتوان ﷺ وتەی زۆریان لەم بارەوە فەرموە).

لە صەحیحی بوخاریو موسلیمیشدا هەیە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی **((جنتان من فضة: آنيتهما وما فيهما، وجنتان من ذهب آنيتهما وما فيهما، وما بين القوم وبين أن ينظروا الى وجه ربهم في جنة عدن إلا رداء الكبرياء على وجهه))** واتە: دو بەهەشت هەن قاپ و قاچاغ و هەرچی تێیاندا هەن لە زیوە، دو بەهەشتیش هەن قاپو قاچاغو هەرچی تێیاندا هەیە لە زێڕە. لە بەهەشتی عەدندا هیچ شتێك نیە بەرچاوی بەهەشتیەکان بگرێ تەماشای روی پەروەردگاریان بکەن تەنها پەردەی کبریائی سەر روی نەبێ.

## پەردەی روی پەروەردگاری بەرزو پیرۆز

ئەبا موسا ئەشعەری خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: **((إن الله لا ينام، ولا ينبغي له أن ينام يخفض القسط و يرفعه، يرفع اليه عمل النهار قبل عمل الليل، وعمل الليل قبل النهار حجابه النار،لو كشف طبقها لأحرقت سبحات وجهه كل شيء أدركه بصره، واضع يده لمسيء الليل ليتوب بالنهار، ومسيء النهار ليتوب بالليل حتى تطلع الشمس من مغربها))**.

(ئیبنو خوزەیمە/ التوحید) واتە: خودا نانوێو بۆشی نیە بنوێ. داد هەڵدەگرێو دەیداتەوە. بەر لە شەو کردەوەی رۆژێو هی شەویش بەر لە رۆژ بۆی بەرز دەکرێتەوە، پەردەکەی ئاگرە، ئەگەر ئەم پەردەیە هەڵدرێتەوە ئەوا هەرچی

چاوی خودا ببینێ بـە درەوشانەوەی روی پـیرۆزی دەسوتێ. خـودا هـەتا رۆژی دوایی دەستی راهێلاوە تا گوناهکاری شـەو لـە رۆژدا ژیـوان ببێتـەوەو گوناهکـاری رۆژیش لە شەودا پەشێمانی دەربڕێ.

موسلیمیش لە صەحیحەکەیدا ئەو دو واژەیەی بێژەرەوەکە کە (نور: روناکی و، نار: ئاگرە)، لەبەر ئەوەیە چونکە ئەو جۆرە ئـاگرە پاکـەی خـودا بـە هۆیـەوە لەگەڵ موسا دوا، روناکیو ئاگریشی پـێ دەڵێـن. هـەوروەها خـوای گـەورە ئـاگری چرای بە روناکی ناوبردوە، بەلاّم ئاگری تاریکی دۆزەخ پێی ناگوترێ روناکی.

لەبەر ئەم پەردانە بەندەکان خودا نابینن، وەکو هەورو بنمێچ کە رۆژو مـانگ دەشارنەوە. ئـەو پەردانـە ئـەوە ناگەیـەنێ سـۆمای خـودا بەربەست بکـات، هیـچ موسوڵمانێك ئەم جـۆرە قسـەیە ناکـات چونکـە خـودا نـە لـە ئاسمانـەکانو نـە لـە زەویدا شتێك نیە لێی شاراوە بێت. بەڵکو ناهێڵێ روناکیەکانی خودا بگاتە بونەوەر وەکو پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی ((**لو كشفها لأحرقت سبحات وجهه ما أدركه بصره من خلقه**)). واتە: ئەگەر پەردەکانی لادات ئەوا درەوشـانەوەی روی خـودا تـا هەتـەری بینایەکـەی بونـەوەری دەسـوتاند. کەواتـــە ســۆمای خــودا تــەواوی ئافەریدان دەگرێتەوە، بەلاّم درەوشانەوەکەی بە روناکی یان بە ئاگر پەردەپۆشە.

## ٤- خودای بەرزو بێهاوتا دو دەستی هەیە:

خودای بەرزو بێهاوتا دو دەستی وای هەیـە لـە تەواومـەندێتیو شـکۆی ئـەو بوەشێتەوەو بـە هـی ئافـەریدانی نـاچێت خـودا دەفـەرموێ ﴿بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ﴾ سورەتی مائیدە/٦٤، واتە: بەڵکو دەستەکانی خودا بەخشندەیە. وە لـەو کاتـەی ئیبلیس لاملی کردو سوژدەی بۆ ئادەم نەبرد خودا سەرزەنشتی کردو پێـی گـوت: ﴿يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّ﴾ سـورەتی ص/٧٥، واتـە: ئیبلیس! بۆچی سوژدەت بۆ ئادەم نەبرد کە بە هەردو دەستانی خۆم ئافەریدەم کردوە.

## شکۆمەند کردنی خودا بە باسکردنی هەردو دەستی:

موسلیمی پێشەوا لە صەحیحەکەیدا لە عەلی ئەبا تـالیب خـوا لێـی رازی بێـت دەگێڕێتـەوە پێغەمبـەر ﷺ کە بـۆ نوێـژ هەڵدەسـتا لـە خوێندنـی نـزای نوێـژ دەسـتپێکردندا دەیفـەرمو: ((لبیـك وسـعدیك والخـیر کلـه في یدیـك)) واتـە: خودایە! بەرفەرمانتم ئەوەی خێرو بێرە لە دەستەکانی تۆوەیە.

## راکـراوەیی هەردو دەستی پەروەردگار

خودای بەرزو تەنیاو بـەرێز هـەردو دەسـتەکانی بـە بەخشـندەیی دەکاتـەوە ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ﴾ سـورەتی مـائیدە/٦٤، واتـە: بـەڵکو دەستەکانی خودا راکراوەیەو چۆنی بوێ وا دەبەخشێ.

هـەروەها خـودا بـە شـەو و بـەرۆژ دەسـتەکانی رادەکاتـەوە تـا لـە گونـاهی بەندەکانی ببورێ. لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە ئەبا موسای ئەشعەری خـوا لێـی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویـەتی: ((إن الله یبسط یـده باللیل لیتـوب مسـيء النهار، وبالنـهار لیتـوب مسـيء اللیـل، حتـی تطلـع الشـمس مـن مغربها)) واتە: خودا لە شەودا دەستی خۆی رادەهێڵێ تا بەڵکو گوناهکـاری رۆژێ ژیوان ببتەوەو پەشیمانیان قبوڵ بکات. بـە رۆژیـش دەسـتی رادەهێڵـێ تـا بـەڵکو گوناهکاری شەوێ ژیوان ببێتەوەو خودا پەشێمانی قبوڵ بکات. هەتا رۆژی دوایـی وایە. موسلیم گێڕاویەتیەوە.

## ئەو شتانەی خودا بە دەستی خۆی ئەفراندوێتـی

خـودای گـەورە لـە داهێنـانی هیـچ شـتێك دەسەوسـان نیـە هـەر شتێکیشـی مەبەست بێ تەنها بڵێ (ببە) دەبێت، بەڵام بۆ رێز لێنـانێکی تایبـەتیو پایەبـەرزی هەندێ ئافەریدەکانی بەدەستی خۆی ئەفراندوە کە لە قورئاندا یان لـە فـەرمودەدا یاد کراون:

١- ئادەم:

لەم بارەوە خودا بە ئیبلیسی گوتوە: ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ سورەتی ص/٧٥ لە صەحیحی بوخاری لە فەرمودە درێژەکەی تکاخوازیدا هـاتوە:

((**فيأتون آدم فيقولون: يا آدم أنت أبو البشر، خلقك الله تعالى بيده، ونفخ فيك من روحه...** )) واته: دەچنە لای ئادەم و پێی دەڵێن: ئادەم! تۆ باوکی مرۆڤانی. خودا بە دەستی خۆی دروستی کردوی، لە روحی خۆی فوی پێدا کردی:.

لە فەرمودەکەی مشتومڕی نێوان ئادەم و موسادا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**إحتج آدم وموسى فقال موسى: أنت الذي خلقك الله بيده، ونفخ فيك من روحه وأمر الملائكة فسجدوا لك وأسكنك الجنة، ثم أخرجتنا منها؟ فقال آدم: أنت موسى الذي اصطفاك الله برسالاته، وقربك نجياً، وكلمك تكليماً، وأنزل عليك التوراة، فبكم تجد في التوراة أنه كتب علي العمل الذي عملته قبل أن أخلق؟ قال موسى: بأربعين سنة، قال آدم: كيف تلومني على عمل كتبه الله علي قبل أن يخلقني بأربعين سنة؟ قال رسول الله ﷺ: فحج آدم موسى**)) واتە: ئادەم و موسا لەگەڵ یەکتردا کردیانە مشتومڕ. موسا گوتی: خودا بە هەردو دەستەکانی خۆی ئافەریدەی کردوی. لە روحی خۆی فوی پێدا کردی، فەرمانی بە فریشتان کرد سوژدەیان بۆ بردی و لە بەهەشتی نیشتەجێ کردی، پاشان تۆ ئێمەت دەرهێنا، ئادەم گوتی: ئەتۆ ئەو موسایەی کە خودا هەڵیبژاردوی تا پەیامەکانی راگەیەنی. نزیکی کردیەوە و قسەی لەگەڵدا کردوی. تەوراتی بۆ دابەزاندوی. باشە لە تەوراتدا چەند ساڵ نوسراوە بەر لەوەی ئافەریدە بم دەبوایە بیکەم؟ موسا گوتی: چل ساڵ. ئادەم گوتی: ئێ باشە چۆن سەرکۆنەی کارێکم لێ دەکەی کە خودا بەر لە ئافەریدە بونم بە چل ساڵان بۆی نوسیوم؟. پێغەمبەر ﷺ فەرموی، ئادەم بیانوی موسای بڕی.

هەواڵپێدانی خودا ئادەمی بە دەستی خۆی دروست کردوە و خەڵك و پێغەمبەر موساش پێیان گوتوە خودا بە دەستی خۆی تۆی دروست کردوە. بەڵگەیە بۆ ئەو تایبەتمەندیەی خودا بە ئادەمی بەخشیوە کە بە دەستی خۆی ئافەریدەی کردوە، جا ئەگەر مەبەست لە (دەست) توانا بێت پایەی ئادەم بەسەر کەسانی دیکەوە چیە تا هەڵبگوترێ.

### ٢- نوسینی تەورات:

لە هەندێ لە(بێژین)ەکانی فەرمودەی مشتومڕی ئادەم‌و موسادا هاتوە ئادەم بە موسای گوتوە: (وخط لك في الألواح كل شيء) واتە: خودا لە لوحەکاندا هەمو شتێکی بۆ نوسیوی.

(وكتب لك التوراة بيده) واتە: تەوراتی بە دەستی خۆی بۆ نوسیوی. هەڵبەت فەرمودەی مشتومڕی ئادەم‌و موساش لەهەردو صەحیحاندا هاتوە.

### ٣- پەڕتوکێك لە لای خۆی دایناوە:

ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی ((كتب ربكم تبارك وتعالى على نفسه بيده قبل أن يخلق الخلق: إن رحمتي تسبق -أو قال سبقت غضبي)) رواه البخاري ومسلم واتە: خودای بەرزو پیرۆز بەر لەوەی ئافەریدان پەیدا بکات بە دەستی خۆی لەسەر خۆی نوسیوە: بەزەییم پێش توڕەییم کەوتوە.

### ٤- چاندنی بەهەشت و باخاتی عەدن:

ئەو فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە هەواڵی پێداوێن خودا بە دەستی خۆی بەهەشت‌و باخاتی عەدنی چاندوە. ((سأل موسى ربه ﷻ ما ادنى أهل الجنة منزلة؟ قال هو رجل يجيء بعدما دخل أهل الجنة الجنة، فيقال له: أدخل الجنة، فيقول: أي رب وكيف أدخل وقد نزل الناس منازلهم، وقد أخذوا أخذاتهم فيقال له: أترضى أن يكون لك مثل ما كان يكون لملك من ملوك الدنيا؟ فيقول: رضيت رب، فيقال: لك مثل هذا ومثله ومثله، حتى عقد خمساً، فيقول: رضيت فيقول: لك هذا وعشرة أمثاله، فيقول: رب رضيت، فيقال لك هذا وما اشتهت نفسك ولذت عينك، قال يا رب، أخبرني بأعلاهم منزلة: قال: أولئك الذين أردت، وسوف أخبرك، غرست كرامتهم بيدي وحتمت عليها، فلم تر عين ولم تسمع أذن، ولم يخطر على قلب بشر، ومصداقه في كتاب الله ﷻ ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سورەتی سوجدە/١٧)).

واتە: موسا لە خودای پرسی: خودایە نزمترین پایەی بەهەشتیەکان چیە؟ خودا فەرموی: پیاوێکە دوای ئەوەی سەرجەم بەهەشتیەکان دەچنەناو بەهەشت

ئەنجا پێی دەگوترێ: تۆش برۆ. دەڵێ: خودایە! من بچمە کوێ؟ وا خەڵك هەر یەکەو جێگای خۆی گرتوەو بەشی خۆی گل داوە. پێی دەڵێن: پێت خۆشە هەندەی پادشایەکی دنیات هەبێت؟ دەڵێ: پێم خۆشە. پێی دەڵێن: نەك هێندە، برۆ ئەوە دوهێندەو سێو چوارو پێنج هێندەی تر. دەڵێ: خوایە پێ شادم. دەفەرموێ: ئەوەندەو دە ئەوەندەی تر. دەفەرموێ: پێ شادم. خوایە!. پێی دەڵێن: ئەوە بۆ تۆیە هەرچی ئارەزوتەو چاوت پێی جوانە پێشکەشت بێ.

پاشان موسا دەڵێ: خودایە ئەدی ئەوانەی بەرزترین پایەو پلەیان هەیە؟ دەفەرموێ: ئەوانە رێزیان زۆرەو بە هەردو دەستی خۆم شتی وام بۆ چاندونو مۆرم لێداوە کە نە چاو دیتویێتی‌و نە گوێ بیستویێتی، نە بەدڵی هیچ کەسێکیشدا هاتوە. خوداش فەرمویەتی (واتاکە: هیچ کەسێك نازانێ خودا چتۆ چاوەروانی بۆ سازداون، ئەمەش پاداشتی کردەوەکانیانە). ئەم فەرمودەیە پێمان دەڵێ خودا بە هەردو دەستی خۆی بەهەشتەکەی بۆ چاندون.

هەورەها لەم فەرمودەیەش کە بەیهەقی لە سونەنەکەیدا گێراویەتیەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ((**خلق الله جنة عدن وغرس أشجارها بيده، فقال لها تكلمي، قالت: قد أفلح المؤمنون**)) واتە: خودا بەهەشتی عەدنی ئەفراندوە بە دەستی خۆی درەختەکانی چاند، پێی فەرمو: قسە بکە. گوتی: بڕواداران رزگاریان بو.

## مەزنایی دەستەکانی خوای بەرزو بێهاوتا

خودا دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾ سورەتی زومەر/٦٧، واتە: ئەندازەی توانا و دەسەڵاتی خودایان نەزانیوە،زەوی هەموی لە رۆژی پەسەڵاندا لە نێو مشتی ئەوە، ئاسمانەکانیش لە دەستی راستی کۆ کراونەوە.

لە هەردو صەحیحاندا هاتوە ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: ((**يقبض الله -تبارك وتعالى- الأرض يوم القيامة، ويطوي السماء بيمينه ثم يقول أنا الملك أين ملوك الأرض**)) واتە: لە رۆژی دواییدا خودا زەوی لە چنگ دەگرێ‌و بە دەستی راستی ئاسمان دەپێچێتەوە پاشان دەفەرموێ: من پادشام کوا پاشایانی سەر زەوی لە کوێن.

هەر دیسان لە هەردو صەحیحاندا -بە بێژەی موسلیم- هاتوە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێی رازی بێت دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**يطوي الله السموات يوم القيامة ثم يأخذهن بيده اليمنى، ثم يقول: انا الملك، اين الجبارون؟ أين المتكبرون؟ وفي لفظ قال: رايت رسول الله ﷺ على المنبر ويقول: "يأخذ الجبار سمواته وأرضه وقبض بيده، وجعل يقبضها ويبسطها، ويقول أنا الرحمن، أنا الملك، أنا السلام، أنا المؤمن، أنا المهيمن، أنا العزيز، أنا الجبار، أنا المتكبر أنا الذي بدأت الدنيا ولم تك شيئاً، أنا الذي أعيدها، أين الملوك؟ اين الجبابرة؟ وفي لفظ اين الجبارون؟ اين المتكبرون؟ -ويتميل رسول الله ﷺ- على يمينه وعلى شماله حتى نظرت والى المنبر يتحرك من أسفل شيء منه إني لأقول: أساقط هو برسول الله ﷺ**)) واتە: لە رۆژی دواییدا خودا ئاسمانەکان دەپێچێتەوەو پاشان دەیانخاتە دەستی راستیەوە پاشان دەفەرموێ: ئەمن پادشام کوا باڵا دەستەکان؟ کوا خۆ بە گەورە زانەکان؟ پاشان زەمینەکان بە دەستەکەی تر دەگرێو دەڵێ: ئەمن پادشام، کوا باڵا دەستو کوا فیز بەرزەکان؟.

لە بێژەیەکی تردا دەڵێ: پێغەمبەرم دیت ﷺ لەسەر دوانگەدا وتاری دەداو دەیفەرمو: ( خودای باڵا دەست ئەرزو ئاسمانەکان لە چنگ دەگرێ، دەیگوشێو گوشادی دەکات، دەفەرموێ: من میهرەبانم، من بێخەوشم، من زاڵم، من دەسەڵاتدارم، من باڵا دەستم، من ئەو خۆبەگەورەزانەم کە دنیام لەهیچەوە ئافەریدە کردوەو بەخۆشم دروستی دەکەمەوە. کوا پادشایان کوا باڵادەستان؟ کوا خۆ بەگەورەزانان؟ لەگەڵ ئەم وتانەدا پێغەمبەر ﷺ بەلا دادەهات تەماشام کرد دوانگەکە دەهەژێتەوەو دەمگوت ئێستا نا ئێستا دادەڕوخێ.

سەفارینی دوای ئەوەی ئەم فەرمودەیەی هێناوەتەوە دەڵێ: (ئەم فەرمودەیە لە صەحیحو موسنەدەکانی تر بە چەند واژەیەك هاتوە کە یەکتر بەراست دەخەنەوە) "عقيدة السفاريني/١-٢٣٠" پاشان فەرمودەیەکی مەوقوفی ئیبنوعەبباسی هێناوەتەوە ((**ما السموات السبع والأرضون السبع وما فيهن وما بينهن في يد الرحمن إلا كخردلة في يد أحدكم**))٫واتە: هەر حەفت ئاسمانەکانو ئەو شتانەی لەنێوانیاندا هەیە هەرهەموی لەنێو دەستی پەروەردگاردا وکو دەنکە خەردەلێك وایە کە لە ناو دەستی یەکێکتان دابێ (مەبەست لە گچکەیی دێت).

## هەردو دەستی خودا راستە

لە بێژینێکی موسلیمدا هاتوە ((**ثم يطوي الأرضين بشماله**)) واتە: پاشان بە دەستی چەپی زەمینەکان دەپێچێتەوە، (بەیهەقی) ئەم فەرمودەیەی لە روی ئیسنادەوە بە زەعیف داناوەو دەڵێ تەنها عومەری کوڕی حەمزەو ئەویش لە سالم گێڕایەتەوە کە بە دەستی چەپەیە بەڵام نافیعو عەبدوڵڵای کوڕی موقسیم لە ئبنوعومەر هەمان فەرمودەیان گێڕایەتەوەو دەستی چەپەشیان یاد نەکردوە (الأسماء والصفات ١/٣٢٤) لە روی ناوەڕۆکیشەوە دەڵێ: (ئەم فەرمودەیە چۆن صەحیح دەبێ لە کاتێکدا بە صەحیحی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدرایەتەوە کە هەردو دەستی پەروەردگاری بە راستە ناو بردوە)... ((**المقسطون عند الله يوم القيامة على منابر من نور على يمين الرحمن وكلتا يديه يمين الذين يعدلون في حكمهم وأهليهم وما ولوا**)) رواه مسلم واتە: دادیاران لە رۆژی ژیانەوەدا لە لای راستی خودا لەسەر سەکۆی روناکین، خودا هەردو دەستی راستەیە. دادیاران ئەوانەن کە لەحوکمو لە خێزانو فەرمانەکانیان دادپەروەرانە رەفتار دەکەن.

(شێخ ئەلبانی)ش لەو فەرمودەیەی کۆڵیوەتەوە کە باسی چەپەی کردوەو رونی کردۆتەوە فەرمودەیەکی ریزپەڕەو جێباوەڕێك لەگەڵ یەکێکی جێباوەڕتر تەکولۆیە.

## ٥- پەنجەکانی پەروەردگاری میهرەبان:

خودای تاكو تەنیا پەنجەی هەیە بەڵام بە هیچ ئافەریدەیەك ناچێ بەڵکو شایەنی شکۆو بێکەمایەسی ئەوە. لە صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتوە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پیاوێکی جولەکە هاتە لای پێغەمبەر ﷺو گوتی: موحەممەد! خودا لە رۆژی دواییدا ئاسمانەکان دەخاتە سەر پەنجەیەکی خۆیو زەمینەکان لەسەر پەنجەیەكو شاخو درەخت لەسەر پەنجەیەكو ئاوو خۆڵو لیتەش لەسەر پەنجەیەکیتری دادەنێو دەیانهەژێنێ. دەڵێ: من پادشام، من پادشام،. دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بۆ راستی قسەکەی پێکەنیو تا ددانە خڕەکانی بە دیار کەوت. پاشان ئەم ئایەتەی فەرمو: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾سورەتی زومەر/٦٧.

له صه‌حیحی موسلیمدا هاتوه عه‌مری کوڕی عاص خوا لێی رازی بێت ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموی: **((إن قلوب بني آدم كلها بين أصبعين من أصابع الرحمن كقلب واحد يصرفه كيف يشاء))** واته: سه‌رجه‌م دڵانی ئاده‌میزاد له‌ نێو دو په‌نجه‌ له‌ په‌نجه‌كانی خوای میهره‌بان دایه‌، وه‌كو یه‌ك دڵ وان چۆنی بوێ گه‌ردانی ده‌كات. پاشان فه‌رموی: **((اللهم مصرّف القلوب صرف قلوبنا الى طاعتك))** واته: خودایه‌! دڵمان بۆ دینت گه‌ردان بكه‌.

## ٦- بابه‌ت له‌ باره‌ی لاق و پێ:

(به‌یهه‌قی) له‌ په‌ڕتوكی (الأسماء والصفات:٣٤٨)دا له‌ ژێر ئه‌م سه‌ربابه‌ته‌ی سه‌ره‌وه‌دا چه‌ند فه‌رموده‌یه‌كی هێناوه‌:

١- **((لا تزال جهنم تقول: هل من مزيد، ختى يضع رب العزة فيها قدمه، فتقول قط قط وعزتك ويزوى بعضها الى بعض، ولا يزال في الجنة فضل حتى ينشيء الله خلقاً فيسكنه فضول الجنة))** رواه البخاري ومسلم واته: خه‌ڵك ده‌خرێنه‌ ناو دۆزه‌خ، دۆزه‌خ هه‌ر ده‌ڵێ: هێشتا با بێت. تا په‌روه‌ردگار به‌ زه‌بر پێی خۆی ده‌خاته‌ سه‌ر، ئه‌نجا ده‌ڵێ: به‌سه‌، به‌سه‌، سوێند به‌ عیززه‌تت. ئیتر بۆ یه‌ك دێته‌وه‌، به‌هه‌شتیش هه‌رچه‌ند خه‌ڵكی ده‌چێته‌ ناو هه‌ر جێی ماوه‌ تا خوا به‌ ئافه‌ریده‌ی تر پڕی ده‌كاته‌وه‌.

٢- **((تحاجت الجنة والنار فقالت النار: اوثرت بالمتكبرين والمتجبرين، وقالت الجنة فما لي لا يدخلني إلا ضعفاء الناس وسقطهم وغرهم، قال الله ﷻ للجنة: انت رحمتي أرحم بك من اشاء من عبادي، وقال للنار: أنت عذابي أعذب بك من اشاء من عبادي، ولكل واحدة منكما ملؤها، فأما النار فلا تمتليء حتى يضع الله فيها رجله فتقول قط قط، فهنالك تمتليء ويزوي بعضها الِى بعض ولا يظلم الله من خلقه أحدا، وأما الجنة فإن الله ﷻ ينشيء لها خلقاً))** صحيح البخاري واته: به‌هه‌شت و دۆزه‌خ كردیانه‌ مشتومڕ. دۆزه‌خ گوتی: من جێگه‌ی فیز به‌رزو ملهوڕانم. به‌هه‌شتیش گوتی: منیش جێگه‌ی لازه‌بون و ناگزوورانم. خوداش ناوبژی كردن و فه‌رموی: به‌هه‌شت! تۆ میهری منی كێم بوێ به‌ تۆوه‌ ئاسوده‌ی ده‌كه‌م. دۆزه‌خ! تۆش سزای منی كێم بوێ به‌ تۆ ئازاری ده‌ده‌م. هه‌ردوكیشتان به‌ كه‌سانی شایه‌ن پڕ ده‌كه‌م. به‌ڵام ئاگر قه‌ت پڕ نابێ تا خودا پێی خۆی ده‌خاته‌ سه‌ری ئه‌نجا ده‌ڵێ: به‌سه‌، به‌سه‌. ئه‌و كات بۆ

یەکتر دێتەوەو پڕ دەبێتەوە، خوداش ستەم لە هیچ کەسێك ناکات. بە هەشتیش؛ خودا ئافەریدەی تر پەیدا دەکات و دەیانخاتە ناوی.

٣- ئیبنو عەبباسیش لە بارەی کورسیدا ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ دەڵێ شوێنی پێکانیەتی.

## ٧-خودا لاقی هەیە:

لەسەرمان واجبە بڕوای پێ بێنین‌و بەدرۆی نەزانین، چونکە خودا پێی راگەیاندوین ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلا يَسْتَطِيعُونَ﴾ سورەتی قەلەم/٤٢. ئیبنو کەسیر لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: ئەبا سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت دەڵێ گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بو دەیفەرمو: ((**یکشف ربنا عن ساقه فیسجد له کل مؤمن ومؤمنة، ویبقي من کان یسجد في الدنیا ریاء وسمعة، فیذهب لیسجد، فیعود ظهره طبقا واحداً**)) واتە: لە رۆژی ژیانەوەدا خودا لاقی خۆی وەدەر دەخات، بڕواداران هەر هەمویان سوژدە دەبەن. تەنها ئەوانە ناتوانن کە لە دنیادا بۆ ناو و دەنگو ڕیابازی سوژدەیان بردوە. ئەم جۆرە کەسانە دەیانەوێ سوژدە ببەن بەڵام یەکڕاست پشتیان راست دەبێتەوەو ناتوانن.

پاشان دەڵێ: ئەم فەرمودەیە لە هەردو صەحیح‌و هی تریش بە چەند رێگایەکەوەو بە چەندین واژە بێژراوەتەوە. ئەمە فەرمودەیەکی درێژو مەشهورە.

منیش دەڵێم: لە بێژانەوەی موسلیمدا دەڵێ: ((**یکشف ربنا عن ساقه**)) خودا لاقی خۆی وەدەردەخات.

## ٨- بەرز بونەوەی خودا بۆ سەر بارەگا:

بارەگای پەروەردگار لە هەمو ئافەریدەیەك گەورەترو مەزنترە، خودا لە قورئاندا لە حەفت جێدا یادی کردۆتەوە کە ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ سورەتی طاها/٥، واتە: خودای میهرەبان بۆ سەر بارەگا بەرز بۆتەوە.

## مەبەست لە بارەگا:

بۆ بەلگەی ئافەریدێتی بارەگا، خودا دەفەرموێ: ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾ سورەتی حاقە/١٧، واتە: لە ڕۆژی ژیانەوەدا هەشت فریشتە بارەگای پەوەردگارت هەلدەگرن.

هەروەها خودای گەورە پێی ڕاگەیاندوین بارەگا چەند هەلگرێکی هەیە داوای لێبوردن بۆ بڕواداران دەکەن. هەلبەت ئەم وتەیەش تەکولۆیە لەگەل ئەوەی دەلێ بارەگا دەسەلاتە. ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ سورەتی غافر/٧، واتە: فریشتەکانی بارەگا هەلگرو ئەو فریشتانەش لە دەوری بارەگان بە ستایش پاکیگاری خودا دەکەن، بڕوای پێ دێنن و داوای لێبوردن بۆ بڕواداران دەکەن.

لەصەحیحی بوخاریشدا هاتوە ((**إذا سألتم الله ﷻ فاسألوه الفردوس، فإنه في وسط الجنة وأعلى الجنة، وفوقه عرش الرحمن، ومنه تفجر انهار الجنة**)) واتە: ئەگەر لە خودا پاڕانەوە، داوای فیردەوسی لێبکەن کە لە ناوەڕاستی بەهەشتێ دایە، سەرەوەشی بارەگای خودای میهرەبانە، ڕوبارەکانی بەهەشت لەوێوە هەلدەقولێن.

دیسان لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە: (کە لە ڕۆژی پەسەلاندا خەلك هەر هەموی دەبورێتەوە) پێغەمبەر ﷺ یەکەم کەسە بەخۆ دێتەوەو دەبینێ موسا خۆی بە پێچکەی بارەگا گرتوە.

## گەورەیی بارەگا:

خودا بارەگای بە گەورەو مەزن ناساندوە ﴿رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ سورەتی موئمینون/٨٦ هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە دو ڕوان گەورەییەکەی ڕون کردۆتەوە:

یەکەم/ گەورەیی ئەو فریشتە بارەگا هەلگرانەی پێ ڕاگەیاندوین، لە سونەنەی ئەباداوددا بە سەنەدێکی صەحیح پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**أذن لي ان أحدث عن أحد حملة العرش ما بين شحمة أذنه وعاتقه مسيرة سبعمائة**

**عام تخفق الطير))** واته: ڕێم درا باسی یەك لە هەڵگرانی بارەگاتان بۆ بكەم؛ ماوەی نێوان نەرمۆڵەی گوێ‌و سەرشانی حەفتا ساڵ پەروازی باڵندەیەكی خێرایە.

دوەم/ بچوكی ئەرزو ئاسمانەكان لە چاو گەورەیی بارەگا: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **((ما السماوات السبع في الكرسيّ إلا كحلقة ملقاة في فلاة من الأرض، وفضل العرش على الكرسيّ كفضل تلك الفلاة على تلك الحلقة))** **أخرجه البيهقي في الأسماء والصفات وابن أبي شيبة**، ئەم فەرمودەیە بە زۆری ڕێگەكانیەوە صەحیحەو ئەلبانیش لە (الأحاديث الصحيحة ١/١٥١)دا نوسدێری كردوە، واتاكەی: هەر حەفت ئاسمان لە چاو كورسیدا وەكو ئەلقەیەك وایە لە بیابانێكدا كەوتبێ، بارەگاش لە چاو كورسیدا وەكو بیابانەكە وایە لە چاو ئاڵقەكەدا.

## خودا شكۆگاریتی خۆی بەوە دەردەبڕێ كە بۆ سەر بارەگا بەرز بۆتەوە و پەروەردگاری بارەگایە:

خودای پەروەردگار بەوە ستایشی خۆی كردوە كە بەرزبۆتەوە سەر بارەگا وەك دەفەرموێ: ﴿ طه ۝ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى ۝ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَى ۝ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ الْأَرْضَ وَالسَّمَاوَاتِ الْعُلَا ۝ الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ ۝﴾ سورەتی طاها/١-٥، واتە: طه، كە قورئانمان بۆ تۆ ناردوە بۆ ئەوە نیە خۆت خەفەتخان بكەی لەبەر بڕوانەهێنانی بێبڕوایان، بۆ ئەوەمان ناردوە ببێتە یادەوەری ئەوانی لە خوا دەترسن‌و دەیانەوێ ڕێنوێن بن، لە لای ئەو خودایە دابەزیوە كە ئەرزو ئاسمانە بڵندەكانی ئافەریدە كردوە. خودای میهرەبان بۆ سەر بارەگا بەرز بۆتەوە.

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ سورەتی حەدید/٤، واتە: خودا ئاسمانەكان‌و زەوی لەشەش ڕۆژدا ئەفراندوە، پاشان بەرز بۆتەوە بۆ سەر بارەگا. هەر شتێك بچێتە ناو زەوی یان لێی دەرچێ، ئەوەی لە ئاسمان دادەبەزێ‌و ئەوەی بۆی بەرز

دەبێتەوە هەر هەموویان دەزانێ، لەهەر کوێ بن خودا بە زانستو ئاگاداری لەگەڵتانەو ئەو ئیشی دەیکەن دەیبینێ.

هەروەها پتر لە ئایەتێك ستایشی خۆی بەوە کردوە کە خاوەنی بارەگایە:

﴿ ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ ۞ فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ ۞﴾ سورەتی بوروج/١٥-١٦، واتە:خودا خاوەنی بارەگای شکۆدارە، هەرچییێکی بوێ دەیکات.

﴿إِذًا لَابْتَغَوْا إِلَى ذِي الْعَرْشِ سَبِيلًا﴾ سورەتی ئیسراء/٤٢، واتە: ئەگەر خواوەندی تر هەبوایە ئەوا ڕێگەی ڕکەبەریان دەگرتە بەر لە دژی خودای خاوەن بارەگا.

هەروەها پەروەردگاری بارەگایە ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ سورەتی تەوبە/١٢٩، واتە: پشتیوانیم بە خواوەیە کە پەوەردگاری بارەگای مەزنە.

﴿ فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ سورەتی ئەنبیاء/٢٢، واتە: پاكو تەنیایی بۆ پەروەردگاری بارەگا کەبەو جۆرە وەسفی دەکەن.

﴿ قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ سورەتی موئمینون/٨٦، واتە: پێیان بڵێ: کێ پەروەردگاری حەفت ئاسمانو پەروەردگاری بارەگای مەزنە؟.

عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە خوا لێی ڕازی بێت لە شیعرێکدا شکۆمەندی پەورەردگار دەکاتو دەڵێ:

شهدت بأن وعد الله حق وأن النار مثوى الكافرينا

وأن العرش فوق الماء طاف وفوق العرش رب العالمينا

وتحمله ملائكة كرام ملائكة الإله مسوّمينا

بڕوا دێنم بەڵێنی خوا هەقو ڕاستە، ئاگری دۆزەخیش نیشینگەی بێبڕوایانی سەرسەختە. بارەگای خودا لەسەر ئاوداو سەریارەگاش پەروەردگاری جیهانیانە.

بارەگاش كۆمەڵێ فریشتەی بەڕێز هەڵیانگرتوە، فریشتەی خودا بۆ هاریكاریمان دادەبەزن.

ئیبنوعبدالبرّ لە (الإستعاب)دا ئەم شیعرەی گێڕاوەتەوەو، دەڵێ لە چەند رێگەیەكی صەحیحەوە گێڕاومانەتەوە.

## واتای بەرز بونی بۆ سەر بارەگای:

ئێمە نازانین (استواء)ەكە چۆنە، لەبەر ئەوەی نازانین زاتی خودا چۆنە. بەڵام دەزانین لە زمانی عارەبیدا چی پێ مەبەستە. عارەب -وەكو ئیبنولقەییم ساغی كردۆتەوە- چوار واتایان پێ مەبەستە: سەقام گرتن، بەرز بون، بڵند بون، هەوراز بون. (بگەڕێوە بۆ راڤەی الواسطیة ی"الهراس"/ل٨٠).

زانینی واتای (استواء)و نەزانینی چۆنیەتیو لێ نەكۆڵینەوەی: رێوشوێنێكە پێشینانی چاك پەیڕەویان لێ كردوە، جا كاتێ لە مالیكی پێشەوایان پرسی: خودا چۆن ئیستیوای كردوە گوتی: ئیستیوا دیارە، مەبەستی واتاكەیەتی كە لە زمانی عارەباندا رۆشنە، چۆنیەتیەكەی نازانرێ، بڕوا پێبونی واجبە، پرسیار لێكردنیشی بیدعەیە، مەبەستی پرسیار كردنی چۆنیەتیەكەیە.

### ٩- خودا لە كوێیە؟

خودا خۆی پێی راگەیاندوین لە ئاسمانێ دایەو لەسەر بارەگاكەی سەقامی گرتوە ﴿أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ۞ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ ۞﴾ سورەتی مولك/١٦-١٧، واتە: ئایە لەو خودایەی لە ئاسماندایە دڵنیان كە لە زەویتان رۆنەچوێنێو زەویتان لە بن هەژاوو هەرەس بكات؟ یاخۆ لەو خودایەی لە ئاسمانێ دایە دڵنیان بەردتان بەسەر دانەبارێنێ؟ لەمەودوا دەزانن سزا چۆنە.

پێغەمبەریش ﷺ پێی راگەیاندوین خودا لە ئاسمانێ دایە. لە هەردو صەحیحاندا هاتوە ئەبا سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمویەتی: ((**الا تأمنوني وانا امين من في السماء يأتيني خبر السماء صباح مساء**)) واتە: ئێوە لە من دڵنیا نین؟ كەچی ئەوەی لە ئاسمانێدایە -مەبەستی خودایە- لە من دڵنیایەو بەیانیانو ئێواران هەواڵی ئاسمانم بۆ دێنێ.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ گەواهی بڕواداریتی بۆ ئەو کەنیزەیە داوە کە گوتی خودا لە ئاسمانە. لە صەحیحی موسلیمو سونەنی ئەباداود هاتوە موعاویەی کوڕی حەکەمی سەلەمی لە کەنیزەکەی دابو لەبەر ئەوەی کەمتەرخەمی لە پاراستنی وڵساتەکەی کردبو.

پاشان پەشیمان دەبێتەوەو دێتە لای پێغەمبەر ﷺ کە ئەگەر ودمی بدا ئازادی بکات. پێغەمبەر ﷺ داوای کرد ئامادە بێ، هات لێی پرسی خودا لە کوێیە؟ گوتی لە ئاسمانە. پرسی من کێم؟ گوتی: ئەتۆ پێغەمبەری خودای. فەرموی: ئازادی بکە، بڕوادارە.

پێغەمبەر ﷺ ڕێبەری نەخۆشی کردوە بەم نزایە بۆ خۆی یان برایەکانی بۆی بپاڕێنەوە نزاکە ئەوەی تێدایە کە خودا لە ئاسمانێ دایە: ((**ربنا الله الذي في السماء، تقدس اسمك، أمرك في السماء والأرض كما رحمتك في السماء اجعل رحمتك في الأرض، اغفر لنا ذنوبنا وخطايانا أنت رب الطيبين، أنزل رحمة من رحمتك وشفاء من شفائك على هذا الوجع فيبرا**)) رواه أبو داود واتە: ئەی خودای لە ئاسمانێ، پیرۆزە ناوت، فەرمانت لە ئەرزو ئاسمانە، بەزەییت چۆن لە ئاسمانە ئاواش بیخە سەر زەوی، لە تاوانو گوناهانمان خۆش ببە تۆ پەروەردگاری پاکانی، خودایە! میهرێك لە میهرەکانی خۆتو چارەیەك لە چارەسەریەکانی خۆت بۆ ئەم نەخۆشە دابەزێنەو لەو ئازارە رزگاری بکە.

لەو فەرمودەیەش عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لێی رازی بێت (مەرفوعی) دەکات دەفەرموێ: ((**الراحمون يرحمهم الرحمن، ارحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء**)) رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح واتە: میهرەوەران خودای میهرەبان میهرەبانیان لە گەڵدا دەکات، میهر ببەخشن بەوانەی لەسەر روی زەوین خودای لە ئاسمانێ دایە میهرەبانیتان لەگەڵدا دەکات.

## واتای لە ئاسمانێدا بونی

مەبەست ئەوە نیە کەشکەشانەکانی ئاسمان خودایان گرتۆتە خۆ -پاكو بێ هامتایی‌و بەرزی بۆ خودا- بەڵکو مەبەست لە ئاسمانێدا بون بەرزیو ژورێتیە. چونکە خودا بە خۆی وەسفی خۆی بە هەرە بەرز کردوە ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ سورەتی ئەعلا/١، واتە: پاکی بۆ ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بکە.

خـودا بـەرزی مەزنـە ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ سـورەتی بەقـەرە/٢٥٥، واتـە: خـودا رایگـەیاندوە لـە ژوروی بـەندەکانێتی ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ﴾ سـورەتی نـەحل/٥٠، واتـە: لـە پـەروەردگاریان دەترسـن لـە کـە ژورویانـە، ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ﴾ سـورەتی ئـەنعام/١٨، واتـە: خـودا زاڵەو لـە ژوروی بەندەکانیـەتی. پێغەمبەر ﷺیـش بـۆ شکۆمەندی خودا لە نزایەکیدا دەفەرموێ: ((وأنت الظاهر فليس فوقك شيء)) واتە: خودایە تۆ دیاری و هیچ شتێك لە ژوروی تووە نیە.

خاتو زەینەب -خوا لێی رازی بێت - شانازی بە خۆی دەکردو بەخێزانەکانی دیکەی پێغەمبەر ﷺی دەگوت: (ئێوە خزمو کەستان مارەی کردون بـەڵام مـن لـە بەرزی هەفت ئاسماناندا مارە کراوم) بوخاری لە صەحیحەکەیدا گێڕاویتیەوە.

موسـوڵمان نابـێ وا تـێ بگـات ئاسمـان خـودای گرتۆتـە خـۆ یـان لـە نێـو کەشکەشـەکانی ئاسمانـێ دایـە. خـودا لـەوە زۆر بـەرزترە. چـۆن وا دەبـێ کـە ئاسمانەکان لە ئاست خوادا هەر بونی نیە ﴿وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾ سـورەتی زومەر/٦٧، واتە: ئاسمانەکان لەنێو دەستی راستەیدا پێچراوەتەوە.

﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾ سورەتی ئەنبیاء/١٠٤، واتە: لە رۆژی دواییدا ئاسمان وەکو دادانەوەی پەرتوك دەپێچینەوە.

## زۆرو زەبەندی بەڵگەکان:

لەبابەت ژورویێتی خوای هەرە بەرزدا، لە قورئانو سـوننەتدا بەڵگـەمان هێنـد زۆرە، ئەگەر هەموان بێنینـەوە چـەندین روپـەڕی گەرەکـە، تـەواوی بەڵگـەکان لـە گردی ئەم تەوەرانەدا خول دەخۆنەوە:

١- ئەو بەڵگانـەی دەسـەلمێنن: خـودا لـە ئاسمانـێ دایـە، هـەروەکو پێشـتر هێنامانەوە.

٢- ئەوبەڵگانەی دەسەلمێنن: خودا بـەرز بۆتـەوە سـەر بارەگاکـەی، پێشـتر یادمان کردونە.

٣- ئەو بەڵگانەی بەرزێتی خودا دەسەلمێنن.

٤- ئەو دەقانەی دەسەلمێنن هەندێ لە ئافەریدەکراوەکان لە لای ئەوون ﴿إِنَّ الَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ﴾ سورەتی ئەعراف/٢٠٦، واتە:ئەوانەی لە لای پەروەردگارتن (مەبەستی فریشتەیە) لە پەرستنی خودا سەهندەیی ناکەن.

لە بارەی شەهیدانەوەش دەفەرموێ ﴿بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ سورەتی ئالی عیمران/١٦٩، واتە: شەهیدان لە لای پەروەردگاریان بژێویان پێ دەبخشرێ.

لەم بارەوە بەڵگەی دیکە زۆرن.

٥- ئەو دەقانەی پێمان دەڵێن هەندێ شت بۆ لای خودا بەرز دەکرێنەوە.

وەکو بەرز کردنەوەی عیسای کوڕی مەریەم ﷺ ﴿بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ﴾ سورەتی نیساء/١٥٨ واتە: بەڵکو خودا بەرزی کردۆتەوە.

وەکو بەرز کردنەوەی پێغەمبەر ﷺ لە شەوڕەویەکەیدا.

وەکو بەرز بونەوەی کردەوەکان بۆ لای خودا ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ سورەتی فاطر/١٠، وەکو بەرز بونەوەی گیانی بڕواداران: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ﴾ سورەتی ئەعراف/٤٠، واتە ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە نەهێناو فیز بەرز بون ئەوانە قەت دەروازەکانی ئاسمانیان لێ ناکرێتەوە.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ بڕواداران دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ دەکرێتەوە، فەرمودەش زۆرن ئەم مەبەستە رون بکەنەوە.

هەروەها بەرز بونەوەی فریشتان ﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ﴾ سورەتی مەعارج/٤، واتە فریشتەو جبریل بۆ لای پەروەردگار بەرز دەبنەوە.

٦- دابەزینی فریشتان ﴿يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ﴾ سورەتی نەحل/٢.

هەروەها دابەزینی پەڕتوکەکان ﴿وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ﴾ سورەتی ئەنعام/٩٢، واتە: ئەم پەڕتوکە پیرۆزە دامان دابەزاندوە.

٧- بەرزکردنەوەی دەستو، چاو هەڵبڕین بەرەو ئاسمان، فەرمودە گەلێ هەن پێغەمبەر ﷺ لە نزا کردندا دەستەکانی بەرز کردۆتەوە، هەر کاتێ گرفتێکی هاتبایە پێش دەستی بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوەو لە خودا دەپاڕایەوە.

هەروەها لە نزای پاش دەستنوێژدا چاو هەڵبڕینیش سەلمێنراوە.

٨- پەنجە راهێلانی پێغەمبەر ﷺ بەرەو ئاسمانێ: لە فەرمودەکەی حەجی ماڵ ئاواییدا خەڵك گوتیان گەواهی دەدەین ئەتۆ ئیسلامت پێ راگەیادوین‌و ئەرکەکانت بە جێ گەیاندو ئامۆژت داین، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ پەنجەی شادەی بۆ ئاسمان رادەهێلاو ئاراستەی سەر خەڵکی دەکردەوەو دەیفەرمو ((**اللهم اشهد اللهم اشهد**)) واتە: خوایە شایێد بە خوایە شایێد بە.

ئەگەر حەز لە بەڵگەی دیکەو وتەی پێشینە چاکەکان دەکەی بگەڕێوە بۆ (معارج القبول ١/١٠٩-١٦٧) هێندەی کۆ کردۆتەوە دڵ پێی تێر ببێ.

## بەرزێتی خودا لەگەڵ نزیکیدا نەساز نیە

خودا بە ئاگاداریەوە نزیکەو پاڕانەوەی نزا کاران وەردەگرێ، بەڕازو چرپەی بەندە زانیارە، لە ملی چارەوێکەی لێی نزیکترە.

بە ورتە ورتەکانی نەفس زانیارە، تەنانەت بە زانست لە شاڕەگی ملیش نزیکترە، بە نهێنی‌و شاراوەکان ئاگادارەو زانیارە بەو شتانەی دەچێتە نێو زەمین‌و ئەوانەش لێی دەردەچێ، بەوانەش کە لە ئاسماندا دادەبەزێ‌و بۆی بەرز دەبێتەوە، خودا بە زانستو توانا لەگەڵ بەندەکانێتی، هیچ نهێنیەکی لێ بزر نابێ، هیچ گەردێك نە لە ئاسمان‌و نە لە زەویدا یێی بزر نابێ خودا وەکو بەرزە نزیکە، وەکو نزیکە بەرزە، خودا خۆی یەکەم‌و کۆتاو دیارو دەرونە.

## ١٠- پێکەنینی پەروەردگاری پاکمان:

خوای تاك‌و بێهاوتا کەنگێ بیەوێ‌و چۆنی مەبەست بێ پێدەکەنێ. ئێمەش بڕوا بەوە دێنین بێئەوەی چۆنیەتیەکەی بزانین، داواشمان لێ نەکرۆە چۆنیەتیەکەی بزانین. لەم بارەوە چەندین فەرمودەی تەواو هاتوە:

١- ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**یضحك الله الی رجلین یقتل احدهما الآخر. کلاهما یدخل الجنة، یقاتل هذا في سبیل الله فیقتل، ثم یتوب الله علی القاتل، فیقاتل في سبیل الله**

فیستشهد)) رواه البخاري ومسلم واتـه: خـودا بۆ ئـەم دو کەسە پێدەکەنێ کە یەکێکیان ئەوی تریـان دەکـوژێو هەردوکیشیان بەهەشتین! کـوژراو لـه پێنـاوی خودا کوژراوه بکوژیش ژیوان دەبێتەوەو ئەویش له پێناو خودا شەهید دەبێ.

٢- ئەبا هورەیره خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پیاوێك هاتـه خزمـەت پێغەمبـەر ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا له برسان لاکەی سەرم دێ، ئەویش هـەواڵی بۆ لای هەندێ له خێزانەکانی نارد گەر خواردن هەبێ، ئەوانیش گوتیان جگـه لـه ئـاو هیچی ترمـان لـه لا دەست ناکـەوێ. ئینجا روی کـرده یـاوەرانیو فـەرموی کـێ ئەمشەو میوانداری ئـەو پیاوه دەکات. پیـاوێکی یـاریدەدەر گوتـی: ئـەمن، ئیـتر کابرای برده ماڵەوەو به ژنەکەی گوت ئـەوه میوانـی پێغەمبـەره ﷺ رێـزی بگـره. گوتـی بڕوا بکـه تەنـها بـای منداڵەکانمان خـواردن هەیـه. گوتـی: بـه شـتێکەوه خەریکیان بکەو داوای خواردنیـان کـرد بیانخەوێنـه، پاشـان کـه خواردنەکەت بـۆ دانایـن خۆشت وەره، به بیانوی چاککردنەوه چراکه بکوژێنەوه. وا نیشان دەدەین نانی لەگەڵدا دەخۆین، ئەم شەو خۆمان به زگی بـەتاڵ شـەو دەکەینـەوه.. ئـەبادا میوانەکه هەست به شتێك بکاتو تێر نان نەخوات ژنەکـەش وای کـرد.و خۆیـان وا نیشان دا ئـەوانیش نـان دەخـۆن، بۆ بـەیانی کـه چوونه لای پێغەمبـەر ﷺو پێـی فەرمو: ((**لقد ضحك الله -أو عجب من فعالكما**)) واتـه: خـودا پێکـەنینی بـەو کارەی ئێوه هات -یان سەیری پێ هات، ئەم ئایەتەشـی دابـەزاند ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ سورەتی حەشر/٩، واته: ئەگـەرچی خۆشـیان پێویستو ناچار بـن بـەڵام هـەر یـاریدەو هاریکـاری براکانیـان دەکـەن. بوخـاریو موسلیم گێڕاویتیانەوه.

٣- له هەردو صەحیحەکـەی بوخـاریو موسـلیمدا لـه فەرمودەیـەکی درێـژدا ئەبا هورەیره خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوه خۆشەویست فـەرموی: (( **ثم يفرغ الله تعالى من القضاء بين العباد ويبقى رجل مقبل بوجهه على النار، وهو آخر أهل الجنة دخولا فيقول: أي رب أصرف وجهي عن النار فإنه قد قشبني ريحها وأحرقني ذكائها، فيدعوا الله ما شاء أن يدعوه، ثم يقول الله تبارك وتعالى: هل عسيت إن فعلت ذلك أن تسأل غيره؟ فيقول لا أسألك غيره، فيعطي ربه من عهود ومواثيق ما شاء الله، فيصرف وجهه عن النار، فإذا أقبل على الجنة ورآها سكت ما شاء الله أن يسكت، ثم يقول: أي رب**

قدمني الى باب الجنة، فيقول الله تعالى: اليس قد أعطيت عهودك ومواثيقك لا تسألني غير الذي أعطيتك، ويلك يا ابن آدم ما أغدرك. فيقول: أي رب فيدعوا الله حتى يقول له: فهل عسيت إن أعطيتك ذلك أن تسألني غيره؟ فيقول: لا وعزتك، فيعطي ربه ما شاء من عهود ومواثيق، فيقدمه الى باب الجنة، فإذا قام على باب الجنة، اتفقهت له الجنة فيرى ما فيها من خير والسرور فسكت ما شاء الله أن يسكت، ثم يقول: أي رب أدخلني الجنة، فيقول الله تبارك وتعالى: اليس قد أعطيت عهودك ومواثيقك أن تسألني غير ما أعطيت. ويلك يا ابن آدم ما أغدرك فيقول: أي رب لا أكون أشقى خلقك. فلا يزال يدعوا حتى يضحك الله منه، فإذا ضحك الله منه، قال ادخل الجنة)).

وفي رواية عند مسلم في حديث عبدالله بن مسعود أن الله يقول لهذا الرجل:

((يا ابن آدم اترضى إن اعطيتك الدنياء مثلها معها؟ فيقول أي رب: اتستهزيء بي وانت رب العالمين؟ وضحك رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال: الا تسألوني مم ضحكت؟ فقالوا: مم ضحكت يا رسول الله؟ قال: من ضحك رب العالمين حين قال أتستهزيء بي وانت رب العالمين؟ فيقول لا أستهزيء بك ولكني على ما أشاء قادر))[٥٢] واته: پاشان خودا له قەزای نێوان بەندەکانی دەبێتەوە، تەنها پیاوێك دەمێنێتەوە روی لە ئاگری دۆزەخە، ئەو کەسە دوامینی هەمو بەهەشتیەکانە، دەچێتە بەهەشت، دەڵێ: خودایە روم لە ئاگری دۆزەخ وەربگێڕە بۆنەکەی جاڕسو هەراسانی کردوم، کڵپەو تینەکەی سوتاندمی. تا خوا حەز دەکا لێی دەپاڕێتەوە. پاشان خودا دەفەرموێ: تەمات وایە کە ئەوەم بۆ کردی داوای شتی تریش بکەی؟ دەڵێ: داوای هیچی ترت لێ ناکەم. ئەوەندەی خوا حەز بکا پەیمانو بەڵێن بە خودا دەدات داوای هیچی تر نەکات.

خودا روی لە ئاگر وەردەگێڕێ. روی کردە بەهەشتو چاوی پێ کەوت تا خوا حەز دەکا بێدەنگ دەبێ، پاشان دەڵێ: خودایە بمبە لای دەرگای بەهەشت. خودا دەفەرموێ ئەدی پەیمانو بەڵێنت نەدابو جگە لەمە داوای هیچی ترم لێ نەکەیت، کۆست کەوێ ئادەمیزاد! چەندە بەڵێن شکێنی. دەڵێ پەروەردگارا! زۆر

[٥٢] ئیبنو خوزەیمە لە پەڕتوکی یەکخواناسیدا زۆر فەرمودەی دیکەی هێناوەتەوە کە پێکەنین بۆ خودا دەسەلمێنێ. لە لاپەڕە ٢٣٠ و بەرەو سەرەوە.

دەپاڕێتەوە. تا خودا پێی دەفەرموێ: ئەمات وایە شتی تریش داوا بکەی؟ دەڵێ: نا بە عیززەتت داوای چیتر ناکەم، ئەوەندەی خودا حەز دەکات پەیمانو بەڵێن دەدات، خوداش دەیباتە بەر دەرگای بەهەشت.

کە لەبەر دەرگا راوەستا بەهەشتی بۆ دەکرێتەوەو بۆی فرەوان دەبێو چاوی بەو هەمو خێرو بێرە زۆرو زەبەندە دەکەوێت، تا خوا حەز بکا بێدەنگ دەبێ. پاشان دەڵێ: خودایە! بیمبە ناو ئەو بەهەشتە خۆشە. خودا دەفەرموێ: ئەدی پەیمانو بەڵێنت نەدابو چی ترم لێ داوا نەکەی؟ ئادەمیزاد کۆستت کەوێ چەندە پەیمان شکێنی. دەڵێ: خودایە! با نەبم بە بەد بەختترینی ئافەریدان.. هەر نزا دەکاو دەپاڕێتەوە تا خودا پێدەکەنێو پێی دەڵێ فەرمو برۆ ژورەوە.

لە گێڕانەوەیەکی لای موسلیمدا لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی گێڕاوەتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (خودا بەو پیاوە دەڵێ: ئادەمیزاد! ئەگەر هەندی دنیاو ئەوەندەی تریشت بدەمێ خۆشنود دەبی؟ دەڵێ: خودایە تۆ پەروەردگاری جیهانیانی ناگونجێ گاڵتەم پێ بکەی؟!.

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ پێدەکەنێو دەفەرموێ: " لێم ناپرسن بۆ پێدەکەنم؟ کوتیان: بۆ پێدەکەنی ئەی پێغەمبەر؟ دەفەرموێ: لەبەر ئەوە پێدەکەنم بە خودای گوت: خودایە! تۆ پەروەردگاری جیهانیانی ناگونجێ گاڵتەم پێ بکەی؟!. خودا پێکەنیو فەرموی گاڵتەت پێ ناکەم، بەڵام من هەرچی بمەوێ تەوانام).

٦

### ١١،١٢- دابەزین و هاتنی خودای تاك و بێهاوتا:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **((ینزل ربنا كل ليلة الى سماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الآخر، فيقول من يدعونني فأستجيب له، من يسألني فأعطيه، من يستغفرني فأغفر له))** بوخاریو موسلیم گێڕایتیانەوە واتە: هەمو شەوێك تا ئەو کاتەی سێیەکی شەو دەمێنێ خودا دادەبەزێتە ئاسمانی دنیاو دەفەرموێ کێ لێم دەپاڕێتەوە تا بیبورم، کێ داوام لێ دەکات تا پێی ببەخشم، کێ داوای لێبوردنم لێ دەکات تا لێی خۆش بم.

قورئانیش دەفەرموێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ ۚ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾ سورەتی بەقەرە/٢١٠، واتە:

چاوەڕێی چ دەکەن مەگەر چاوەڕێی ئەوە بکەن خودایان لە ناو چەند پارچە هەورێکی سپی بۆ بێتو هەروەها فریشتەش بێن، ئەو دەمیش کار لە کار ترازاوە.

﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ۝ وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ۝﴾ سورەتی فەجر/٢١-٢٢، واتە: نەخێر، زەوی بە توندی رادەهەژێ. پەروەردگارتو فریشتەکانیشی ریز ریز هاتن.

لە فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺدا هەندێك لەم دەقە قورئانیانە راڤە کراون. لە فەرمودەی (کەڕەنا)دا هەندێك لە خاوەن موسنەدەکان گێڕاپتیانەوە ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە (("إن الناس إذا اهتموا لموقفهم في العرصات تشفعوا الى ربهم بالأنبياء واحداً واحداً من آدم فما بعده، فكلهم يحيد عنها حتى ينتهوا الى محمد صلى الله عليه وسلم فإذا جاؤوا إليه: أنا لها، أنا لها" فيذهب فيسجد لله تعالى تحت العرش ويشفع عند الله في أن يأتي لفصل القضاء بين العباد فيشفعه الله تعالى في ظلل من الغمام بعدما تشقق السماء الدنيا وينزل من فيها من الملائكة، ثم السماء الثانية ثم الثالثة الى السابعة وينزل حملة العرش والكروبيون -قال: وينزل الجبار ﷻ في ظلل من الغمام- زلهم زجل من تسبيحهم، يقولون: سبحان ذي الملك والملكوت، سبحان ذي العزة والجبروت، سبحان الحي الذي لايموت، سبحان الذي يميت الخلائق ولا يموت، سبوحٌ قدوس رب الملائكة والروح، سبوح قدوس، سبحان ربي الأعلى سبحان ذي السلطان والعظمة، سبحانه سبحانه أبداً أبداً)). واتە: کە سەرجەم خەڵکی لە گۆڕەپانی دواییدا وەڕسو پڕ ناسۆر بون، دەچنە لای یەکە یەکەی پێغەمبەران هەر لە ئادەمەوە تا موحەممەد بۆ ئەوەی تکێیان بۆ بخوازن، بەڵام دەچنە لای هەر یەکێکیان بۆ ئەوی تریان رەوان دەکات. دێنە لای موحەممەد دەڵێ: من، بەڵێ من تکاخوازیتان بۆ دەکەم.

دەچێ لە ژێر بارەگای خودا سوژدە دەبات، تکا لە خوا دەخوازێ تا بێت دادوەری لە نێو بەندەکاندا بکات. خوداش تکاکەی پەسەند دەکاتو دوای ئەوەی ئاسمانی یەکەم شەق دەبێو فریشتە دادەبەزن پاشان ئاسمانی دوەم وسێیەمو تا حەفتەمو فریشتانی بارەگا هەڵگرو گەورەکەیان دادەبەزن، خودا دادەبەزێ، فریشتەکان دەنگی پاکیکردنەکانیان بەرز دەبێتەوەو دەڵێن: پاکی بۆ خودای خاوەن مولكو پادشا. پاکی بۆ خودای خاوەن شکۆو دەسەڵات پاکی بۆ خودای

زندوی قەت نەمر، پاکی بۆ خودای مرێنەری ئافەریدانی بۆ هەمیشە نەمر، پاکیگارو پیرۆزگارە پەروەردگاری فریشتەو جوبریلە. پاکیگارو پیرۆزگارە.

پاکی بۆ پەروەردگاری هەرە بەرزم.. پاکی بۆ خاوەن دەسەلاتو مەزنی، پاکی بۆ خودا، پاکی بۆ خودا تاهەتایە تاهەتایە.

ئیبنو مەسعود خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمویەتی ((**يجمع الله الأولين والآخرين ليمقات يوم معلوم أربعين سنة، شاخصة ابصارهم الى السماء ينتظرون فصل القضاء، وينزل الله في ظلل من الغمام من العرش الى الكرسيّ**)) رواه ابن منده وقال الذهبي إسناده حسن واتە: خودا سەرانسەری مرۆڤایەتی لە رۆژێکی دیاری چل ساڵیدا کۆ دەکاتەوە، چاویان بریوەتە ئاسمانو چاوەڕێی پرسیارو وەلامن، خوداش لە ناو چەند پارچە هەورێکی سپیدا لە عەرشەوە بۆ کورسی دادەبەزێ.

## ١٣- قسەی خودا:

خودا چۆنی بوێ و کەنگی مەبەستی بێ قسان دەکات، بە هی ئافەریدانیش ناچێ. هەڵبەت خودا قسەی لەگەل بەندەکانی کردوەو ئەوانیش لەگەڵ خودا ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾ سورەتی نیساء/١٦٤، واتە: هەڵبەت خودا قسەی لەگەل موسا کردوە، قسە! ﴿وَلَمَّا جَاءَ مُوسَىٰ لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ﴾ سورەتی ئەعراف/١٤٣، واتە: موسا لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا هاتو خودا قسەی لەگەڵدا کرد.

خودا وتووێژی نێوان خۆیو موسای یاد کردوەو دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي وَلَٰكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ ۞ قَالَ يَا مُوسَىٰ إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالَاتِي وَبِكَلَامِي فَخُذْ مَا آتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ ۞﴾ سورەتی ئەعراف/١٤٣-١٤٤، واتە: موسا گوتی خودایە خۆتم پێ نیشان بدە، فەرموی نامبینی بەلام تەماشای ئەم چیایە بکە ئەگەر لە شوێنی خۆی سەقامی گرت ئەوا دەمبینی. خودا بۆ چیا درەوشاوەو

چیا وردوخاش بوو موساش له هۆش خۆی چو و بەربۆوە، کە بە خۆ هاتەوە گوتی: خودایە پاکی بۆ تۆ، ژیوانمو من یەکەم برِوادارم. فەرموی: موسا! من تۆم بە پەیامو وتەی خۆم بۆ خەڵك هەڵبژاردوە، ئەوەی پێم داوی بیگرەو لە سوپاسگوزاران بە.

خودا قسەی لەگەڵ ئادەمو حەوا کردوە ﴿فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُلْ لَكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾ سورەتی ئەعراف/٢٢، واتە: خودا بانگی بۆ ئادەمو حەوا کردو فەرموی ئەدی ئەمن بەرهەڵستیم نەکردبو لە بەری ئەم دارە نەخۆنو پێم نەگوتن شەیتان دوژمنی سەرسەختی ئێوەیە.

هەروەها قسە لەگەڵ جوبریلدا دەکات. لە هەردو صەحیحاندا هاتوە ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەر ﷺ دەگێرِتەوە ((**إن الله تعالى إذا أحب عبداً نادى جبريل: إن الله يحب فلاناً فيحبه جبريل، ثم ينادي جبريل في أهل السماء: إن الله قد أحب فلاناً فأحبوه، فيحبه أهل السماء، ويوضع له القبول في الأرض**)) واتە: ئەگەر خودا بەندەیەکی خۆش بوێ بانگ دەکاتە جبریل: خودا فلانە بەندەی خۆش دەوێ تۆش خۆشت بوێ، ئەویش خۆشی دەوێ، پاشان جبریل بانگ دەکاتە ئاسمانیەکان خودا فلانە کەسی خۆشویستوە ئێوەش خۆشتان بوێ، ئاسمانیەکان خۆشیان دەوێتو پاشان خەڵکی زەویش خۆشیان دەوێت.

کە خودا قسە دەکات فریشتەکان گوێ بیستی دەبن، لە هەردو صەحیحاندا هاتوە ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ((**إذا قضى الله الأمر في السماء ضربت الملائكة بأجنحتها خضعاناً لقوله كأنه سلسلة على صفوان، فإذا فزع عن قلوبهم قالوا ماذا قال ربكم، قالوا الحق وهو العلي الكبير**)) واتە: ئەگەر خودا لە ئاسماندا برِیارێك بدات فریشتەکان بۆ وتەکەی ئەژنەوا دەبنو باڵیان لێك دەدەن دەنگی وەکو دەنگی زنجیرێکە لە تاشە بەردێکی لوس بدرێ. جا کە ترسیان لە دڵ نەما دەڵێن خودا چی فەرمو؟ دەڵێن هەقی فەرمو، خودا بەرزو مەزنە.

خودای تاك و بێهاوتا قسەكردنەكەی بە دەنگە بەڵام بە دەنگی هیچ لە ئافەریدەكانی ناچێت. لەو فەرمودەیەدا كە بوخاری گێڕاویەتیەوە: ئەبا سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**يقول الله تعالى: يا آدم، فيقول: لبيك وسعديك. فينادي بصوته، إن الله يأمرك أن تخرج من امتك بعثا الى النار**)) واتە: خودا دەڵێ: ئادەم! دەڵێ: فەرمو، بەرفەرمانتم. ئەنجا بە دەنگی خۆی بانگی دەكاتێو دەفەرموێ: خودا فەرمانت پێ دەكا لە نەتەوەی خۆت كۆمەڵێك دەرهێنی بۆ ئاگر.

لە رۆژی زیانەوەشدا خودا قسە لەگەڵ فریشتان دەكات: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ أَهَٰؤُلَاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ ۞ قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ۞﴾ سورەتی سەبەء/٤٠-٤١، واتە: خودا لە زیانەوەدا بێبڕواكان كۆ دەكاتەوەو بە فریشتەكان دەڵێ ئایە ئەم بێبڕوایانە ئێوەیان دەپەرست؟ دەڵێن: پاكی بۆ تۆ خودایە تۆ پەرستراوی ئێمەی بەڵكو ئەوانە جنۆكەیان پەرستوەو زۆربەیان بڕوایان پێ هێناوە. جنۆكە شەیتانەكان خۆیان پێ نیشان داون و وایان زانیوە فریشتەن.

بە سەركۆنەو سەرزەنشتەوە لەگەڵ كافران دەدوێ: ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِآيَاتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ۞ حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوا قَالَ أَكَذَّبْتُم بِآيَاتِي وَلَمْ تُحِيطُوا بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۞﴾ سورەتی نەمل/٨٣-٨٤، واتە: لە زیانەوەدا لە هەمو نەتەوەكان چینی بێبڕوایان كۆ دەكەینەوەو دەیانكەینە كۆمەڵ كۆمەڵ. راپێچ دەكرێن تا دەگەنە شوێنی لێپرسینەوەو خودا پێیان دەڵێت: ئایە بڕواتان بە ئایەتەكانی من نەهێنا زانستی تەواویشتان وەرنەدەگرت تا تێی بگەن یاخۆ چیتان نەكردوە؟.

سڵاو لە بەهشتیەكانیش دەكات ﴿سَلَامٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾ سورەتی یاسین/٥٨، واتە: خودا دەفەرموێ سڵاوتان پێشكەش بەهەشتیەكان! سڵاوی خودایەكی میهرەبان.

هەروەها گفتوگۆشیان لەگەل دەكات، لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە ئەبا سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕتەوە: ((**إن الله تعالى**

**يقول لأهل الجنة: يا أهل الجنة، فيقول: لبيك وسعديك والخير في يديك، فيقول: هل رضيتم؟ فيقولون: وما لنا لا نرضى يا رب وقد أعطيتنا ما لم تعط احدا من خلقك. فيقول: الا اعطيكم افضل من ذلك؟ فيقولون: يا رب وايّ شيءٍ افضل من ذلك؟ فيقول: احل عليكم رضواني فلا اسخط عليكم بعده ابداً))** واته: خودا به بەهەشتیەکان دەڵێ: بەهەشتیان! دەڵێن: بەڵێ فەرمو خوای دەست پڕ لە خێر. دەفەرموێ: ئێستا خۆشنود بون؟ دەڵێن: بەڵێ خوایە! چون ناخۆشنود بین کە ئەتۆ شتی وات پێبەخشیوین بە کەسی ترت نەبەخشیوە. دەفەرموێ: شتێکی ترتان پێ ببەخشم لەوە باشتر بێ؟ دەڵێن: خودایە جا شت هەیە لەوە باشتر بێ؟ دەفەرموێ: خۆشنودی منتان بۆ ڕەوا بو، ئیتر قەت لێتان تورە نابم.

## قسەی خودا هەژمار ناکرێ و پایانی نیە

خودا دەفەرموێ ﴿قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا﴾ سورەتی کەهف/١٠٩، واتە: بڵێ ئەگەر هەمو دەریاکان بۆ نوسینەوەی وتەی پەروەردگارم مەرەکەب بن، دەریاکان بنیان دێت و کەچی وتەی خودا هێشتا کۆتایی نەهاتوە. ئەگەر چی دەریای تریش بێنین و بیکەینە مەرەکەب هێشتا تەواو نابێ.

## قورئان قسەی خودایە

هیچ گومان و سۆی تێدا نیە قورئان وتەی خودایە. خودا دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ﴾ سورەتی تەوبە/٦، واتە: ئەگەر هاوبەشپەرستێك داوای داڵدەی کرد، داڵدەی بدە تا وتەی خودا دەبیستێ.

﴿سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ إِذَا انطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِن قَبْلُ﴾ سورەتی فەتح/١٥، واتە: ئەوانەی بۆ جیهاد ڕانەپەڕیون، ئێوە دوای سەرکەوتن کە بۆ وەرگرتنی غەنیمەت دەچن دەڵێن ڕێگەمان بدەن با ئێمەش لە گەڵتان بێین.

دەیانەوێ قسەی خودا بگۆڕن، پێیان بڵێن: لە گەڵمان نایەن. خودا پێشتر ئاوەهای فەرموە.

﴿وَلَوْ أَنَّ مَا فِي الأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللهِ﴾ سورەتی لوقمان/٢٧، واتە: بڵێ: ئەگەر هەرچی دارو درەختی زەویە ببێتە قەڵەم، دەریاش و حەفت دەریای دیکەش وەدوادا بێت گشتیان ببنە مەرەکەب هێشتا قسەکانی خودا تەواو نابێت.

ئیبنو کەثیر لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: خودای بەرزو بڵند باسی مەزنایی و گەورەیی و شکۆو ناوەپیرۆزەکانی و سیفەتە بەرزەکانی و، وتە تەواو بێ کەمایەسیەکانی دەکات کە کەس ناتوانێ پەی پێ ببات، هیچ مرۆڤێک لە چیەتیەکەی ناگات و ناتوانێ هەژماری بکات. هەروەکو سەرداری مرۆڤایەتی دەفەرموێ: ((لا احصي ثناءاً عليك، انت كما اثنيت على نفسك)) واتە: ناتوانم ستایشت بۆ هەژمار بکەم، تۆ ئاوەهای کە ستایشی خۆت کردوە.

هەروەها خودا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ﴾ واتە: ئەگەر تەواوی دارو درەختی سەر روی زەوی بکرێتە خامەو دەریاش و حەفت دەریای تریشی بە دوا دابێ وبکرێنە مەرەکەب ئەوا وتەکانی خودای لەبارەی مەزنایی و سیفەت و شکۆی دەدوێ، پێ بنوسرێتەوە، هێشتا پایانی نایەت و خامەکان دەشکێن و ئاوی دەریاکان ئەگەر ئاوی تریشی بە دوا بێت ئەنجا لەبەری دەبڕێ. هەروەها حەسەنی بەسرایی دەڵێ: (گەر دارو درەخت بکرێنە خامەو دەریاش بکرێتە مەرەکەب، خودای بەرز بفەرموێ: فەرمانم وایەو فەرمانم ئاوهایە، ئاوی دەریا چلک دەکات و خامەکان دەشکێن) خودا راستی فەرموە کە دەڵێ ﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ سورەتی ئیسراء/٨٥ واتە: زانیاریتان پێ نەدراوە مەگەر کەمێك.

### ١٤- خۆشویستنی خودا:

خودا لە قورئان و سوننەتدا یادی ئەوەی کردوە کە چەند جۆرە قسەو کردەوەیەکی دیاری کراوی خۆشدەوێت، هەروەها هەندێ لە ئافەریدەکانیشی خۆشدەوێ چەند سیفەتێکی تایبەتیان هەیە.

## سودی ئەم زانینە

خودا بۆیە ئەوەی پێراگەیاندوین تا ئێمە ملکەچ بین بۆ ئەو رەوشت‌و کردەوانەی خودا خۆشیدەوێن دەستراپێش یان زۆر یادی ئەو وتەو قسانە بکرێتەوە کە خودا خۆشی دەوێت تا لە ئەنجامدا خودای بەرزو بێهاوەڵ خۆشمانی بوێ.

## ئەوانەی خودا خۆشیدەوێن :

* پارێزکاران ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ سورەتی تەوبە/٤.

* چاکەکاران ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ سورەتی ئالی عیمران/١٣٤.

* زیوان‌و پاکان ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٢٢.

* ئارامگران ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ﴾ سورەتی ئالی عیمران/١٤٦.

* داد پەروەران ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ سورەتی مائیدە/٤٢.

* ئەو انەی پشتیان بە خواوە بەستوە ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ سورەتی ئالی عیمران/١٥٩.

* ئەوانەی لە پێناو خودا بە یەکریزی دەجەنگن ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ﴾ سورە صەف/٤.

– لە هەردو صەحیحاندا هاتوە: ((**كلمتان خفيفتان على اللسان، حبيبتان الى الرحمن، ثقيلتان في الميزان سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم**)) واتە: دو وتەی سوک‌و هاسانی سەر زارو خۆشەویست لە لای خوداو قورس لەسەر تەرازو هەن کە ئەمانەن (واتاکەی: پاکی‌و ستایش بۆ خودا، پاکی بۆ خودای مەزن).

– لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە ((**ما من الكلام شيء أحب الى الله ﷻ من: الحمد لله، وسبحان الله، والله أكبر، ولا إله إلا الله، هن أربع فلا تكثر علي، لا يضرك بأيهن بدأت**)) واتە: هیچ وتەیەک هێندەی ئەمانە لە لای خودا

خۆشەویستتر نیە: ستایش بۆ خودا، پاکی بۆ خودا، خودا گەورەترە، جگە لە (الله) خودای تر نیە، ئەمانە چوار وتەن، زێتر مەلێ، بە هەر کامێکیان دەست پێ بکەی زیانی نیە.

- پێغەمبەر ﷺ بە ئەشەجی عەبدلقەیسی فەرمو: ((إن فيك خصلتين يحبهما الله ﷻ ورسوله: الحلم، والأناة)) أخرجه مسلم، واتە:تۆ دو ئاکارت هەیە خودا بە هۆیانە خۆشی دەوێ: نەرمیو لەسەرخۆیی.

- لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە عوبادەی کوڕی صامت خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەر ﷺی گێڕاوەتەوە: ((من احب لقاء الله احب الله لقاءه، ومن كره لقاء الله كره الله لقاءه)) واتە: ئەوەی حەز لە دیداری خودا بکات خودا حەز لە دیداری دەکات، ئەوەی حەز بە دیداری خودا نەکات خوداش حەز بە دیداری ناکات.

## کارو کردەوەی تریش

هەر کارو کردەوەو رەوشتو وتەیەکی دی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی یان کردویەتی خودا خۆشی دەوێ. خودا لەم ئایەتەدا بە کۆگری هەمو رێگایانەی مەبەستە کە شوێنکەوتنی پێغەمبەرﷺ ی پێ وەدی دێ ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ سورەتی ئالی عیمران/٣١ واتە: ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ ئەگەر خوداتان خۆشدەوێ وەدوای رێوشوێنی من بکەون تا خودا خۆشتانی بوێ.

١٥،١٦- رقلێبونەوەو تورەبونی خودا :

هەندێ کردەوە هەیە خودا خۆشی ناوێت بەڵکو رکی لێیان دەبێتەوەو لێیان تورەیە، رکلێبونەوەو تورەیی خوداش شتێکی راستەو بەو جۆرەیە کە لە زاتی پیرۆزو بەرێزی خودا بوەشێتەوە، یەك لەو کردەوانە خراپکاریە ﴿وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٠٥ هەر بۆیەش کە ﴿لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ﴾ سورەتی مائیدە/٦٤.

دەقی قورئانو فەرمودەی دیکە زۆر هەن لە بارەی ئەوانەی خودا خۆشی ناوێن لەوانە: بێبڕواو ستەمکارو دەستبڵاوو فیزبەرزان، دەستدرێژ کارو گزیکارو کەشوفشکاران، لە خۆباییبوان، بێبڕوای تاوانکار و، گزیکاری گوناهبار. لە قورئاندا هاتوە ﴿وَلَكِن كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ﴾ سورەتی تەوبە/٤٦، واتە: بەڵام خودا رکی لە راپەڕینی دوڕوەکان هەبو بۆ جیهاد دەربچن بۆیە دایمرکاندن. لە فەرمودەش هاتوە ((**ومن كره لقاء الله كره الله لقاءه**)) واتە: ئەوەی حەز بەدیداری خودا نەکات خودا حەز بەدیداری ناکات.

لە هەردو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتوە خاتو عائیشە –خوای لێ رازی بێت– لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمویەتی: ((**أبغض الرجال الى الله الألد الخصم**)) واتە: خودا لەهەمو کەس لەوە تورە ترە کە سەرکەشو رکەبەرێکی کەللە رەقە.

دیسان هەر لە صەحیحەکانی بوخاریو موسلیمدا بەرائی کوڕی عازیب خوا لێی رازی بێت دەڵێ لە پێغەمبەر ﷺم بیست لە بارەی یاریدەدەران دەفەرموێ: ((**من احبهم أحبه الله، ومن ابغضهم أبغضه الله**)) واتە: ئەوەی خۆشیان بوێ خودا خۆشی دەوێو، ئەوەی رکیان لێ بێتەوە، خودا رکی لێیان دەبێتەوەو لێیان تورەیە.

١٧– خودا بینین:

لەدنیادا خودا نابینرێ، کاتی خۆی پێغەمبەر موسا حەزی کرد خودا ببینێ بەڵام خودا پێی راگەیاند لە دنیادا نابینرێو ئەویش ناتوانێ، تەنانەت ئەو شاخە بەهێزو نەلەخشاوەش بەرگە ناگرێ ﴿ وَلَمَّا جَاءَ مُوسَىٰ لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي وَلَٰكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾ سورەتی ئەعراف/١٤٣ واتە: موسا گوتی خودایە خۆتم پێ نیشان بدە، فەرموی نامبینی بەڵام تەماشای ئەم چیایە بکە ئەگەر لە شوێنی خۆی سەقامی گرت ئەوا دەمبینی. خودا بۆ چیا درەوشاوەو چیا وردوخاش بوو موساش لە هۆش خۆی چو و بەربۆوە.

زانایان لە بارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەی بۆ ئاسمانێ بەرز کراوە خودای بینیبێ، رایان جیاوازە، بەڵام راستەکەی ئەوەیە نەیبینیوە. بە صەحیحی

هاتوه خاتو عائیشه –خوا لیی رازی بێت– فەرمویەتی: (ئەوەی بلێ موحەممەد خودای دیتوه ئەوا بوختانێکی گەورەی بە خودا کردوه).

ئەمە لە دنیا، بەڵام لە رۆژی ژیانەوەدا جیاوازە، بەندەکان بە نوژەنێکی دی ئافەریدە دەکرێن، ئەوەتانێ لە رۆژی ژیانەوەدا خۆر لەسەر سەری مرۆڤ هێند نزیك دەبێتەوە تەنانەت یەك میلی دەمینێ، کەچی ناتوێنەوە. ئەوەتانێ لە دوای زندو بونەوەدا نامرن، تەنانەت بێبڕواکان دەخرێنە دۆزەخو پێستیان هەڵدەپروکێ، هەر جارەو پێستێکی تازەیان بەبەردا دەکرێتەوە، بەڵام هەرگیز نامرن.

بەڵێ لە رۆژی ژیانەوەدا بڕواداران دەتوانن پەروەردگاریان ببینن، بەڵکو گەورەترین بەخششی خودا بڕوادارانی پێ بەهرەمەند بکات بینینی پەروەردگاری بەرزو بەڕێزیانە.

ئەو بەخششەی بێبڕوایان لێی بێبەشن ﴿كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾ سورەتی موطەففین/١٥، واتە: نەخێر ئەو کافرانە لە دیتنی پەروەردگاریان بێبەشن.

بەڵام ئەوانەی خودا هەڵیبژاردونو رەنگو روی جوان کردون بێبەش نین ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ۝ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ۝﴾ سورەتی قیامە/٢٢–٢٣، واتە: لە رۆژی ژیانەوەدا هەندێ رەنگو رو هەن گەشو روناکن! تەماشای پەروەردگاریان دەکەن.

ئەوانەی چاکەکارن ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ۝ عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ ۝﴾ سورەتی موطەففین/٢٢–٢٣، واتە: چاکە کاران لە بەهرەوەری دان، لەسەر تەختەکانی بەهەشتدا تەماشای پەروەردگاریان دەکەن.

تەماشاکردنی روی پەوەردگاری بەڕێز، ئەو (پتر)ەیە کە خودا بەڵێنی بە بڕواداران داوه ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ سورەتی یونس/٢٦، واتە: چاکان چاکەیان خەڵاتەو زیاتریش.

هەورەها ئەو (زیاتر)ەیە کە لەم ئایەتەدا هاتوه ﴿لَهُم مَّا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾ سورەتی ق/٣٥، واتە: بەهەشتیەکان چیان بوێ بۆیان هەیەو زیاتریشمان لە لا دایە.

چەندین فەرمودەی موتەواتیری ئاشکاریش لەم بارەوە هاتوە:

لە هەردو صەحیحاندا هاتوە جەریری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: لە لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوین، تەماشای مانگی چواردەیان دەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((**إنكم ترون ربكم عياناً كما ترون هذا لا تضارون في رؤيته، فان استطعتم أن لا تغلبوا على صلاة قبل طلوع الشمس وصلاة قبل غروب الشمس فافعلوا**)) واتە: ئێوە لە ڕۆژی ژیانەوەدا وەك چۆن ئەم مانگە بێ ڕەشکەو پێشکەو بێ تەمومژ دەبینن ئاوەهاش خوداتان دەبینن...

لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە صوهەیب خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (("**إذا دخل أهل الجنة الجنة، يقول الله ﷻ: تريدون شيئاً ازيدكم؟ يقولون: الم تبيض وجوهنا، الم تدخلنا الجنة وتنجينا من النار**"؟ **قال: فيكشف الحجاب فما أعطوا أحب إليهم من النظر الى ربهم ثم تلا هذه الآية:** ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾))، واتە: کە بەهەشتیەکان بۆ بەهەشت چون خودا دەفەرموێ: زیاترتان پێ ببەخشم؟ دەڵێن: خودایە! زیاتر چیە، ئەدی ڕەنگو ڕوت سپیو ڕوناك نەکردوین، نەتخستوینە بەهەشتو لە ئاگرت ڕزگار نەکردین؟.. خودا پەردە هەڵدەداتەوەو تەماشای پەروەردگاریان دەکەن. قەت شتی وا بە چێژیان نەدیوە. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (واتاکەی: چاکان چاکەیان خەڵاتەو زیاتریش).

لە هەردو صەحیحاندا هاتوە ئەبا موسا خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**جنتان من فضة: آنيتهما وما فيهما، وجنتان من ذهب آنيتهما وما فيهما، وما بين القوم وبين أن ينظروا الى ربهم إلا رداء الكبرياء على وجهه في جنة عدن**)) واتە: دو بەهەشت هەن قاپ و قاچاغ و هەرچی تێیاندا هەن لە زیوە، دو بەهەشتیش هەن قاپو قاچاغو هەرچی تێیاندا هەیە لە زێڕە. لە بەهەشتی عەدندا هیچ شتێك نیە بەرچاوی بەهەشتیەکان بگرێ تەماشای ڕوی پەروەردگاریان بکەن تەنها پەردەی کبریائی سەر ڕوی نەبێ..

## ١٨- زانستی خودا:

دەزانین خودا بە سیفەتی زانست سیفەتمەندە، خودا بە چەند ناوێك ناوی خۆی ناوە کە ئەم سیفەتە دەگەیەنێ، خودا زانایە ﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ سورەتی شوعەراء/٢٢٠، یەکێکی تر لەو ناوانە (الخبير)ە تایبەتە بەوەی پێش

ئەوەی شتێك پەیدا بێ ئەو دەیزانێ. یەكێكی تر (الحكیم)ە تایبەتە بە زانینی وردوو بچوكی سیفەتان. یەكێكی تر (الشهید)ە تایبەتە بەزانینی دیارو نادیارانو واتای وایە هیچ شتێكی لێ بزر نابێ. یەكێكی تر (الحافظ)ە تایبەتە بەوەی شتی لە بیر ناچێ، یەكێكی تر (المحصی)یە تایبەتە بەوەی زۆری زانینی شتان خەریكی ناكات وەكو زانینی تیشكی روناكی، توندو تیژی با، هەڵوەرینی گەڵا، كەچی بەشە جولانەوەی یەكە یەكەی گەڵاكانیش دەزانێ.

## زانینی خودا هەموكی و هەندەكیەكان دەگرێتەوە

فەلسەفەزانەكان دەیانگوت خودا هەموەكیەكان دەزانێو هەندەكیەكان نازانێ. بەڵام درۆیان كرد چونكە زانستی خودا هەمو شتێك دادەگرێتەوەو هیچ شتێكی نە لە ئاسمانو نە لە زەوی لێ ون نابێ، هەمو جولەیەك چ لە دەریا بێ چ لە وشكانی بێ، هەر گەڵایەك لە درەختان هەڵدەوەرێ، هەر تۆزكاڵێك لەنێو لمدا پەرشو بڵاو بێ، هەردەنكۆڵەیەك لە زەویدا چەكەرە بكات یان وشك بێ.. هەر هەموی خودا پێی زانیارە ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ سورەتی ئەنعام/٥٩، واتە: خودا هەرچی لە بەڕو دەریایە دەیزانێ، هەر گەڵایەك بوەرێ دەیزانێ هەر دەنكۆڵەیەكی نێو تاریكێیی ناخی زەویو هەر وشكو تەڕییەك هەبێ خودا هەر هەموی لە پەڕتوكێكی رونو ئاشكرا نوسیوە.

ئەو هەمو گیانەوەرە بێ هەژمارە نیە لە خودا بزر بێ ﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا كُلٌّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ سورەتی هود/٦، واتە: هەمو جانەوەرێكی زەوی بژێوی لەسەر خودایە، خودا شوێنی سەقام گرتنو جێگەی مەرگی دەزانێ، هەر هەموی لە پەڕتوكێكی رون نوسراوە تەختی پارێزراوە.

هەر شتێك بگاتە زەوی یا لە زەویەوە بەرەو ئاسمان بچێت ئەوا خودا زیانیاری پێی هەیە ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ الرَّحِيمُ الْغَفُورُ﴾ سورەتی سەبەء/٢، واتاكەی پێشتر نوسراوە.

هەرچی مرۆڤیشە نایکرێ هیچ شتێك لەخودا وەشارێ، هەر کردەوەیەکی دیارو هەر رازێکی لە دڵی بگرێ، خودا پێی زانیارە ﴿قُلْ إِنْ تُخْفُوا مَا فِي صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ اللَّهُ﴾ سورەتی ئالی عیمران/٢٩، ﴿وَهُوَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الْأَرْضِ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ﴾ سورەتی ئەنعام/٣.

زانینی خودا هەمو وردەکاریەکی مرۆڤیشی داگرتۆتەوە ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا مِنْهُ مِنْ قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ﴾ سورەتی یونس/٦١، واتە: لەهەر حاڵێکدا بیو هەر بەشە قورئانێك بخوێنیو هەر کردەوەیەك بکەن ئێمە پێی ئاگادارین کە چۆن ئێوە قسەو کردەوەی بۆ دەکەن.

رامێنە زانینی خودا تۆزقاڵێکیش هەڵنابوێرێ ﴿يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِنْ تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ فَتَكُنْ فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ سورەتی لوقمان/١٦، واتە: کوڕی خۆم ئەگەر گوناه سەنگی دەنکە خەرتەلێکیش بێ لە ناو تاشەبەرد بێ یان لە ئاسمانەکان بێ یان لە زەویدا بێ خودا دەیهێنێو لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات خودا ئاگادارو شارەزایە.

نهێنیو ئاشکرا، بچوكو گەورە، پەنامەکیو بەرچاوەکی.. هەمویان لە لای زانینی خودا وەکو یەکن ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنْثَى وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِمِقْدَارٍ ۝ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ ۝ سَوَاءٌ مِنْكُمْ مَنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَنْ جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ ۝﴾ سورەتی رەعد/٨-١٠، واتە: خودا دەزانێ هەمو مێینەیەك چی هەڵگرتوەو منداڵدانەکەی بە هۆی کۆرپەکەی چەندی لێ زیادو کەم دەبێ. هەمو شتێك لە لای خودا بە ئەندازەیە. زانیارە بە جیهانی پەنامەکیو بەرچاوەکی مەزنو بەرزە. ئەگەر یەکێکتان وتە بشارێنەوە یان دەریبڕێ یاخۆ بەشەو خۆی شاردبێتەوە یا بە رۆژ خۆی دەرخستبێ، لە لای خودا وەکو یەکە.

خودا راستی فەرموە دەڵێ: ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ سورەتی یونس/٦١، واتە: سەنگی گەردیلەیەکیش نە لە ئاسمانو نە لە زەوی تەنانەت بچوکترو گەورەتریش بێت لە خودا بزر نابێ، هەر هەموی لە پەڕتوکی رون نوسراوە کە تەختی پارێزراوە.

**١٩،٢٠- ژیان و قەیومیەتی خودا:**

خودا زندوەو ژیانێکی ئەزەلی هەیە ﴿هُوَ الْحَيُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ﴾ ژیانی خودا بە پێچەوانی ژینی ئافەریدانە مردنو تونا بونی نیە، چونکە هەرچی بونەوەرە دەمرێو تونا دەبێ تەنها خودا نەبێ ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ۝ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ۝﴾ سورەتی رەحمان/٢٦-٢٧.

لە هەردو صەحیحاندا هاتوە، ئیبنو عەبباس خوا لێی رازی بێت دەڵێ پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو: ((**اعوذ بعزتك الذي لا إله إلا انت الذي لا يموت والجن والإنس يموتون**)) واتە: خودایە! بە عیززەتی تۆ پەنا دەگرم، جگە لە تۆ هیچ خوداوەندێکی تر نیە تۆ نامری، مرۆڤو جنۆکە دەمرن.

ئەوەی بەم جۆرە بێ شایانە متمانەی پێبکرێو پشتی پێببەسترێ ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ﴾ سورەتی فورقان/٥٨، واتە: پشت بەو خودایە ببەستە کە هەر زندوەو نامرێ. خودا قەیومە، سەرجەم بونەوەری راگرتوەو مشوریان دەگێڕێ هەر هەمو بونەوەر ئاتاجی ئەون، بێ خودا ناتوانن راوەستن ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ تَقُومَ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ﴾ سورەتی روم/٢٥.

## پێکەوە هاتنی ئەم دوناوە

خودا پتر لە ئایەتێکدا ئەم دو ناوەی بە یەکەوە کۆ کردۆتەوە ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ سورەتی ئالی عیمران/٢، واتە: جگە لە (اللَّهُ) هیچ خوداوەندێکی دی نیە، خودا هەر زندوی قەییومە.

## لە تەواوێتی ژیان و قەییومێتیدا

لە تەواوێتی ژیانو قەییومێتیدا خودای تاکو بێ هاوەڵ ئەوەیە کە ناخەوێت ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٥، واتە: خودا ئەو خودایەیە هیچ خواوەندێکی تر نیە کە زندو و قەییومەو ناخەوێو ناوەنەوزێ.

وەنەوز (بۆرژان) پێشینەی نوستنە، بۆرژانو نوستن کەمایەسیەکە خودا لێی پاکە. لە هەردو صەحیحاندا هاتوە ئەبا موسا خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چوار وتەی پێ گوتین: ((**إن الله لا ينام، ولا ينبغي له أن ينام يخفض القسط ويرفعه، يرفع اليه عمل الليل قبل عمل النهار، وعمل النهار قبل عمل الليل**)) (ئیبنو خوزەیمە/ التوحيد) واتە: خودا نانوێو بۆشی نیە بنوێ. داد هەڵدەگرێو دەیداتەوە. بەر لە شەو کردەوەی رۆژێو هی شەویش بەر لە رۆژ بۆی بەرز دەکرێتەوە.

## شکۆمەند کردنی خودا بە هێنانەوەی هەردو سیفەتی ژیان و قەییومێتی

خودا خۆی بە سیفەتی ژیانو قەییومێتی شکۆمەند کردوە، لە دەقەکانی پێشتریش یادی ئەوەمان کرد پێغەمبەر ﷺیش بە یادی ئەم چوار سیفەتە خودای شکۆمەند کردوە ((**اللهم لك الحمد أنت رب السموات والأرض ومن فيهن، ولك الحمد أنت قيم السموات والأرض ومن فيهن، ولك الحمد أنت نور السموات والأرض ومن فيهن**)) واتە: خودایە ستایش تەنها بۆ تۆیە. تۆ پەروەردگاری ئەرزو ئاسمانانو نێوانیانی، ستایش بۆ تۆ، تۆ راگری ئەرزو ئاسمانانو نێوانیانی، ستایش بۆ تۆ کە روناکی ئەرزو ئاسمانانو نێوانیانی.

## دیێ و ژنەوتنی خودای بەرزو تاك:

ئەم دو سیفەتەش بە پێی دەقی قورئان سەلماوە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ سورەتی شورا/١١، واتە: هیچ شتێك وەكو خودا نیەو خودا بیسەرو بینایە.

﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ سورەتی حەج/٦١، واتە: خودا شەو لە رۆژو رۆژ لە شەو هەڵدەكێشێ و، خودا ژنەواو بینایە.

بەموساو هارونی فەرموە: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ سورەتی طاها/٤٦، واتە: من لەگەڵتانم دەبیستمو دەبینم.

## مەزنایی بیستن و بینینی خودا

خودا دەفەرموێ ﴿ قُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا لَهُ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ ﴾ سورەتی كەهف/٢٦.

ئیبنو جەریر دەڵێ: لێرەدا تێپەڕیەكی زۆری ستایشی خودای تێدایە. وەك بڵێی فەرمویەتی: چەند مەزنە! خودا هەمو بونێك دەبینێو هەمو بیسراوێك دەژنەوێت، هیچ شتێكی لێ ون نابێ، ژنەوایەو پیاوچاكان دەبینێو سەقامگیریان دەكات ﴿ الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ ۝ وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ ۝ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ۝﴾ سورەتی شوعەراء/٢١٨-٢٢٠، واتە: ئەو خودایەی ئەگەر بە تەنیاو بە كۆمەڵ نوێژ بكەیت دەتبینێ. خودا بیسەرو بینایە.

هەروەها خراپكارانیش دەبینێو سزایان دەدات: ﴿ لَقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا وَقَتْلَهُمُ الْأَنْبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ سورەتی ئالی عیمران/١٨١، واتە: خودا وتەی ئەوانەی بیست كە گوتیان خودا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین ئەو وتەیان لەسەر دەنوسین هەروەها پێغەمبەرانیشیان بە ناهەق كوشتوە پێیان دەڵێن: سزای سوتێنەر بچێژن.

خاتو عائیشە -خـودای لێ رازی بێت- بۆ رونکردنـەوەی فرەوانـی ژنـەوتنی خودا دەڵێ: (سوپاس بۆ ئەو خودایەی بیسـتنەکەی هـەمو دەنگێـك دەژنـەوێت)..
خەولەی کچی ئەعلەبە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەمنیش لە کـەنارێکی خـانو بـوم‌و گوێم لێ نەبو چی گوت، خودا بەم بۆنەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ سورەتی موجادەلە/١، واتە: خودا وتەی ئەو ئافرەتەی بیست کە لـەبارەی (رەفتاری مێردەکەی) گفتوگۆی لەگـەڵدا کـردیو سـکاڵای بـۆ لای خـودا هێنـابو، هەروەها خودا گفتوگۆی ئێوە دەبیستێ خودا بیسەرو بینایە. بوخاری پێشەوا بە هەڵزناوی گێڕاویەتیەوە.

لە صەحیحی بوخاریدا ئەبا موسا ئەشعەری خـوا لێـی رازی بێـت دەڵـێ: لـە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوین ئەگەر بە هـەورازێکدا رۆیشـتباین بە دەنگـی بـەرز ئـەڵڵاهو ئەکبـەرمان دەکـرد فــەرموی: ((**أربعـوا علـى أنفسـكم، فإنكم لا تدعون أصماً ولا غائباً، تدعون سميعاً بصيراً قريباً**)) واتـە: دەنگتـان نـزم کەن، خۆ بانگی کەڕو نادیـارێك ناکـەن، بـانگی خودایـەکی بیسـەرو بینـا و نـێزیك دەکەن.

## نەفامێتی هاوبەشپەرستان لە ئاست بیستنی خودا

بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە عەبدوڵلا خوا لێـی رازی بێـت دەگێڕێتـەوە کـە: لەلای کەعبەدا دو سەقەفیو قورەیشیەك یان قورەیشیەکو دو سەقەفی قەڵەو وزگزلی بێهۆش کۆ ببونەوە: یەکێکیان دەیگوت: ئەرێ خـودا قسـەمان دەبیسـتێ؟ یـەکێك گوتی:

گەر دەنگ هەڵبڕین ئا، بەڵام بە دەنگـی کـز نـە. ئـەوەی تـر گوتـی: گـەر بـە دەنـگ بمانبیسـتێ بـە چرپـەش دەمانبیسێت. خـودا بـەم بۆنـەوە ئـەم ئایەتـــەی دابـــەزاند ﴿وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَكِنْ ظَنَنْتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِمَّا تَعْمَلُونَ﴾ سورەتی فوصیلەت/٢٢.

# ناوه پیرۆزەکـــانی خودا

خودا چەندین ناوی هەیەو هەر هەموشیان پیرۆزو جوانن ﴿وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى﴾ سورەتی ئەعراف/١٨٠، واتە: خودا چەندین ناوی پیرۆزو جوانی هەیە.

هەندێ لەم ناوانە خودا لە سورەتی (حەشر)دا یادی کردوە:

﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَانُ الرَّحِيمُ ۝ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلاَمُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ۝ هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ۝﴾ سورەتی حەشر/٢٢-٢٤، واتە: خودا ئەو خودایەیە جگە لەو هیچ خودایەکی تر نیە، زانای پەنامەکیو بەرچاوەکیە، بەخشندەو میهرەبانە. ئەو خودایەیە جگە لەو خودای تر نیە، پاشاو پیرۆزگارو بێکەمایەسیو دڵنیاکەرو چاودێرو زاڵو باڵادەستو مەزنو گەورەیە. پاکی بۆ خودا لەو هاوبەشیانەی بۆی پەیدا دەکەن. خودا ئافەریدگارو پەیداکەرو وێنەبەخشە، چەندین ناوی پیرۆزی هەیە.

## ژمارەی ناوەکـانی :

لە هەردو صەحیحاندا هاتوە، ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**إن لله تسعة وتسعين إسماً من أحصاها دخل الجنة، وهو وتر يحب الوتر**)) واتە: خودا نەوەتو نۆ ناوی هەیە هەر کەس بیانژمێرێ بەهەشتیە. خودا تاقەو تاقیشی خۆش دەوێ.

ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە بۆ ئەوەی خودای بەرز تاك چەند ناوێکی دیاری کراوی هەیەو ژمارەیان نەوەتو نۆیە.

بەڵام ئەم فەرمودەیە لەگەڵ ئەو فەرمودەیەدا پێکەڵیەك پەیدا دەکات کە ئیبنو مەسعود خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمویەتی: ((**ما أصاب أحداً قط ولا حزن فقال: اللهم إني عبدك، ابن عبدك ابن أمتك، ناصيتي بيدك ماض في حكمك، عدل في قضاؤك، أسألك بكل اسم هو لك،**

**سمّيت به نفسك، أو انزلته في كتابك، أو علمته أحداً من خلقك، أو استأثرت به في علم الغيب عندك، أن تجعل القرآن العظيم ربيع قلبي، ونور صدري، وجلآء حزني، وذهاب همّي، إلا أذهب الله حزنه وهمّه وأبدله مكانه فرحا))**
واته: هەر كەسێك توشی ناخۆشیەك یا خەمێك ببێ‌و بڵێ: خودایە! من بەندەی تۆم، كوڕی بەندەی تۆم، ڕێژینم لە دەست تۆیەو حوكمت پێدا شكاوە، بڕیارو فەرمانڕەواییت دادپەروەریە. بە هەمو ناوێكت لێت دەپاڕێمەوە كە خۆت پێ ناودێر كردوە یا لە قورئاندا داتبەزاندوە، یا بە بەندەیەكی خۆتت گوتوە یا هەر خۆت پێی زانای، داوا دەكەم قورئان بكەی بە بەهاری دڵم، بیكەی بە روناكی سینگم، بیكەی بە خەمڕەوێنم، بیكەی بە دڵخۆشیم. هەر كەسێك گەر وا بڵێ ئەوا هەرچی خەمو پەژارەیە خودا لای دەداو شادی پێ دەبەخشێ. ئەحمەدی پێشەواو هی دیكەش گێڕایتیانەوە.

لە ستایشێكی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە ((**لا احصي ثناء عليك أنت كما أثنيت على نفسك**)) واتە: ناتوانم ستایشت بۆ بژمێرم، تۆ ئاوەهای كە بەخۆت ستایشی خۆت كردوە.

ئەو پێكەڵەی ئەم فەرمودەیە پەیدای دەكات ئەوەیە فەرمودەكە ئاماژە دەكات خودا هەندێ ناوی هەیە لە قورئاندا داینەبەزاندوە بەڵكو تەنها چەند بەندەیەك زانیویانەو بەوان تایبەت بوە، یاخۆ تەنها بەخۆی تایبەت كردوەو هیچ ئافەریدەیەكی خودا نەیزانیوە.

ئەمە لە لایەك لە لایەكی دی فەرمودەكەی ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت ئەوە دەگەیەنێ ناوەكانی خودا نەوەت‌و نۆ ناوەو هەر هەموی دابەزیوەو ناسراوە، بە پێی ئەو بەڵگەیەی كە دەفەرموێ: (**من أحصاها**: ئەوەی هەڵیانژمێرێ))، هەڵژماردنیش دەبێ هەناردراوو ناسراو و زانراو بن.

دەرەنجام ئەو ناوانەی خودا بە زانستی خۆی یان بە چەند بەندەیەكی تایبەت كردوە لەنەوەت‌و نۆ ناوەكەدا نیە.

راستیش ئەوەیە ئەو ناوانەی خودا لە قورئاندا یان پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەكانیدا یادیان كردوە نەوەت‌و نۆیەو لەوەندە زیاتر نیە. لەبەر فەرمودەكەی پێغەمبەر ﷺ كە ئەو ژمارەیەی دیاری كردوەو فەرمویەتی: (**أحصاها**).

ئەو ناوانەی لەنەوەت‌و نۆش زیاترن ئەوا نایانزانین چونکە تەنها لە زانستی خودا دایە یان تەنها چەند بەندەیەك زانیویانە.
دەنا ئەگەر وانەبێ دیار کردنی نەوەت‌و نۆ ناو سودی چیە[٥٣]؟.

## فرەڕابونی زانایان لە دیاریکردنی هەندێ ناودا:

پێغەمبەر ﷺ رایگەیاندوە ئەو ناوانەی خودا دایبەزاندوەو دەتوانین هەڵیانژمێرین‌و بیانناسین، نەوەت‌و نۆ ناون. هیچ فەرمودەیەی (صەحیح)یش نەهاتوە هەمو ناوەکانی خودای یەك یەك هێنابێتەوە، تا بواری فرەڕابونی تێدا نەهێڵێ. بەڵکو ئەم ناوانە بە پەرتەوازەیی لە ئایەت‌و فەرمودانەدا هاتون رەنگە ئایەتێك ناوێك یا دوناوو زیاتری یاد کردبێ یا خۆ لە پایانی ئایەتێکدا ناوێك یا دو ناوی هێنابێتەوە. رەنگە ئایەت هەبێ کۆمەڵە ناوێکی یاد کردبێ.
زانایان بایەخێکی زۆریان بە کۆکردنەوەو راڤەکردنی ناوەکانی خودا داوە.
قورتوبی پەرتوکێکی بە ناوی (واتای ناوە پیرۆزەکانی خودا)٥٤ داناوە. هەروەها ئیبنوجەریرو ئەبابەکری کوڕی ئەلعەرەبی‌و ئیبنو حەجەری عەسقەلانی‌و هی دیکەش ناوەکانیان هێناوەتەوەو نوسیویانە.
زانایان لە زۆربەی ناوەکاندا یەکدەنگن، تەنها لە چەند ناوێك نەبێ کە فرەڕابونیان هەیەو هەندێ زانا پێیان وایە ناوی خودان‌و هەندێکی تریش پێیان وا نیە[٥٥].
هۆی ئەم فرەڕابونەش ئەوەیە هەندێ لە زانایان وای بۆچون هەرچی لە قورئاندا بۆ خودا هاتوە دەکرێ بەناوێکی خودا هەژمار بکرێ‌و بۆ خودا بەکار بێت.
ئەبا بەکر: ئیبنولعەرەبی (رابع ثلاثة: چوارەمی سێیان)و (سادس خمسة: شەشەمی پێنجان)یشی بۆ خودا بە (ناو) داناوە ئەوەش بە پێی ئەم ئایەتە ﴿ أَلَم

---

[٥٣] مەبەستی نوسەر ئەوەیە ئەم نەوت و نۆ ناوەی ئاماژەی بۆ کراوە نابێ هیچکامێکیان لەولا بێ خودا بە خۆی یان بە چەند بەندەیەکی تایبەت کردبێ. وەرگێڕ.
[٥٤] معاني أسماء الله الحسنى.
[٥٥] بگەڕێوە بۆ (تلخيص الخبير) ١٧٢/٤.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَى ثَلاثَةٍ إِلاَّ هُوَ رَابِعُهُمْ وَلاَ خَمْسَةٍ إِلاَّ هُوَ سَادِسُهُمْ﴾ سورەتی موجادەلە/٧.

هەروەها (الفاعل: بكەر)و (الزارع: چێنەر)یشی بە ناوی خودا داناوە، بە پێی ئەم دو ئایەتە ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ سورەتی ئەنبیاء/١٠٤، واتە: چۆن لە سەرەتادا ئافەریدەمان کردون ئاوەهاش دەیانگەڕێنینەوە. بەڵێنێکەو لەسەرمانەو ئێمەش بە توانایین کاری خۆمان بکەین.

﴿أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُونَ ۞ أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ ۞﴾ سورەتی واقیعە/٦٣-٦٤، واتە: نەتاندیوە ئەوەی دەیچێنن ئایە ئێوە شینی دەکەن یان ئێمە.

ئەوەی راستی بێ ئەوانە ناوی خودا نین‌و (چوارەمی سێیان)و (شەشەمی پێنجان)و (بکەر)و (چێنەر) وەکو ناو بۆ خودا بەکار نایێن[56].

لە قورئاندا خودا هەندێ کردەی لەبەر پاداشت‌و داد یان لە ستایش‌و تەواوێتی خۆیدا بەکار هێناوە، بەڵام دروست نیە ناویان لێ داتاشرێ‌و بکرێنە ناوی خودا، لە میانەی ئایەتەکان نەبێ بۆ خودا بەکار نایێن وەکو دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ﴾ سورەتی نیساء/١٤٢، واتە: دوڕوەکان پێیان وایە خودا دەخەڵەتێنن کەچی خودا ئەوان دەخەڵەتێنێ.

﴿وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ﴾ سورەتی ئالی عیمران/٥٤، واتە: پیلانیان کێشا خوداش پیلانی داناوە.

﴿نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ﴾ سورەتی تەوبە/٦٧، واتە: خودایان لە بیر کردو خوداش ئەوانی لە بیر کرد.

﴿..وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ ۞ اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ..﴾ سورەتی بەقەرە/١٤-١٥، واتە: دوڕوەکان دەگەڕێنەوە لای

---

[56] معارج القبول ١/٧٧.

شەیتانەکانیان (دەمڕاستەکانیان!) دەڵێن ئێمە لەگەڵتانین‌و گاڵتە بە بڕوادارەکـان دەکەین، خودا گاڵتەیان پێ دەکات.

(خەڵەتێنەر)و (فێڵزان)و (لـەبیر کـەر)و (گاڵتـەکار)و ئەوانـە، نابـێ بـۆ خـودا بەکار بێت، خودا زۆر لەوانە بەرزترو پاکترە. نابێ بە رەهایی بگوترێ: خودا گاڵتە دەکات یان دەخەڵەتێنێ‌و فێڵ دادەنێتەوە، یان لە یاد دەکات..

ئەو کەسانەی ئەوانەیان بە ناوی خودا هـەژمار کـردوە، هەڵەیـەکی ناقۆڵایـان کردوە. چونکە خەڵەتاندن‌و فێڵ دانانەوە بۆ ستایش‌و بۆ سەرزەنشت بەکار دێـت، بۆیە نابێ بە رەهایی بۆ خـودا بـەکار بێـت بـەڵکو دەبـێ پابەندانـە بـەکار بێـت تـا سەرزەنشـتەکەی لێ هـەڵپوێردرێ هـەروەکو لـە ئایەتـەکاندا بـە پابـەندی بـەکار هاتوە[٥٧].

لەبەر ئەوەیە قسەکەرو خوازیارو بکەرو دروستکەر لە ریـزی ناوەکـانی خـودا نەهاتوە چونکە ئەم سیفەتانە ستایش‌و سەرکۆنە هەڵدەگرن.

ئەگـەر دروسـت بوایـە نـاوی خەڵەتێنـەرو فێڵـزان بـۆ خـودا دابتاشـرێ بـەو بیانوەی (فعل)ەکانیان لە قورئاندا هاتوە ئەوا بەکارهێنانی ئەم ناوانەش دروسـتە: بانگکەر، هاتو[٥٨]، ڕۆیشـتو، ڕێبـەر، لەبیرکـەر، دابەشـکەر، تـوڕە، نەفرەتکـەر،... زۆری تریش کە قورئان فیعلەکانی بە رەهایی هێناوە.

خودای گەورە تەنها لە ڕوی جەزادانەوەو بۆ ئەوانەی بە ناهەق دەجوڵێنـەوە خۆی بە خەڵەتێنەرو فێڵزان سیفەتمەند کردوە، لەم ڕووەوە -لە ڕوی جەزادانەوە- بۆ ئافەریدانیش بە باشە دادەنرێت نەخوازەڵڵا بۆ خودا.

خودا هەندێ نـاوی هەیـە بـە تەنـها بـۆی بـەکار نـایێت بـەڵکو دەبـێ لەگـەل هەمبەرەکە بهێندرێتەوە، چونکە گەر بـە تەنـها بێـت وا دەزانـدرێ کەمایەسـیەکە. وەکـو المانع، القابض، المذل، الخافض ئەوانـە دەبـێ لەگـەڵ هەمبـەرەکانیان بهێندرێنـەوەو بگوتـرێ: (المعطـي المـانع: پێـدەرو پێنـەدەر)، (الضـار والنـافع: زیانبەخش‌و سودبەخش)، (القابض الباسط: نەبەخشەرو بەخشەر)، (المعز المذل: شکۆدەرو زەبونکەر)، (الخافض الرافع: نزمکەرو بەرزکەر).

---

[٥٧] معارج القبول ١/٧٦.

[٥٨] مەبەست لە (الجائي، القادم، الآتي)یە ڕەنگە

(المنتقم: تۆڵەستێن)یش لە قورئاندا قەت بە تەنهایی نەهاتوە بەڵکو یان بە ئیزافە کراوی (ذو) هاتوە وەکو ﴿عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ﴾ سورەتی مائیدە/٩٥، واتە: خودا بە دەسەڵاتی تۆڵەستێنە.

یان لەگەڵ وشەی (المجرمین) بە پابەندیەوە هاتوە ﴿إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾ سورەتی سوجدە/٢٢ واتە: ئێمە تۆڵە لە تاوانکاران دەستێنین.

## ناوی هەرە مەزن

پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکدا پێی راگەیاندوین خودا ناوی هەرە مەزنی هەیەو زیاتری بەسەر ناوەکانی تردا هەیە، لەو فەرمودانە[٥٩]:

١- ترمذیو ئەبا داودو کوڕی حیببانو حاکم بە زنجیرەیەکی تەواو لە بورەیدەی ئەسلەمی خوا لێی رازی بێت دەگێڕنەوە پێغەمبەر گوێی لە پیاوێك بوو دەپاڕایەوەو دەیگوت: ((**اللهم إني أسألك بأني اشهد انك أنت الله لا إله إلا أنت الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفوا أحد: "والذي نفسي بيده، لقد سأل الله بإسمه الأعظم، الذي إذا دعي به أجاب وإذا سئل به أعطي"**)) واتە: خودایە! من بەوە لێت دەپاڕێمەوە جگە لە تۆ هیچ خوایەکی دیکە نیە، تۆ یەکتای بێنیازی لە دایك نەبویو کەست لێنەبوە کەس هاوتات نەبوەو نابێ. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "بەو خودایەی گیانی منی بەدەستە، بە ناوی هەرە مەزنی خودا پاڕاوە ئەگەر داوای پێ بکەی پێت دەبەخشێ، لێی بپاڕێیەوە قبوڵی دەکات".

٢- ترمذیو نەسائیو ئەباداودو کوڕی حیببانو حاکم بە زنجیرەیەکی تەواو لە ئەنەس دەگێڕنەوە کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو پیاوێکیش نوێژی کردو پاشان پاڕاوەو گوتی: ((**اللهم إني أسألك بأن لك الحمد، لا إله إلا أنت، المنان، بديع السموات والأرض، يا ذا الجلال والإكرام، يا حيّ، يا قيّوم، فقال النبيّ صلى الله عليه وسلم "لقد دعا الله بإسمه الأعظم الذي إذا دعي به أجاب، وإذ سئل به أعطي"**)) واتە: خودایە! بەوە داوات لێ دەکەم ستایش

[٥٩] ئەم فەرمودانەمان بە لێکۆڵینەوەکانیانەوە لە(مشكاة المصابيح ١/٧٠٤ و صحيح الجامع ١/٣٢٩ و الوابل الصيّب: ١٦١) وەرگرتوە.

ڕەوای تۆیە، تەنها تۆ خودای، بەخشندەی، داهێنەری ئەرزو ئاسمانانی، خودای خاوەن ڕێزو شکۆ! خودای زندو! خودای ڕاگر!. پێغەمبەر ﷺ فەرموی "بەناوی هەرە مەزنی خودا پاڕاوە گەر پێی بپاڕێنەوە قبوڵی دەکات پێی داوا بکەن پێتان دەبەخشێ".

٣- لە سونەنی ئیبنو ماجەو موستەدرەکی حاکمو موعجەمی کەبیری طەبەرانی بەزنجیرەیەکی تەواو لە ئەبا ئومامە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**اسم الله الأعظم الذي إذا دعي به اجاب: في ثلاث سور من القرآن: في "البقرة"، و"آل عمران"، و"طه"**)) واتە: ناوی هەرە مەزنی خودا لە سێ سوڕەتاندایە: بەقەرە، ئالی عیمران، طه.

٤- ئەو دو ئایەتەی سوڕەتی (البقرة)و (آل عمران) ناوی هەرە مەزنی خودایان تێدا هاتوە دیاری کراون. ترمذیو ئەبا داودو ئیبنوماجەو دارەمی بە زنجیرەیەکی تەواو لە ئەسمائی کچی یەزید -خوا لێی ڕازی بێت- یان گێڕاوەتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**إسم الله الأعظم في هاتين الآيتين** ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ﴾ **سورة البقرة/١٦٣**، **وفاتحة "آل عمران"** ﴿الم ۝ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ۝﴾ **سورة آل عمران/(١-٢)**)) واتە: ناوی هەرە مەزنی خودا لەم دو ئایەتەدایە: یەکەم ﴿والهكم إله واحد لا إله إلا هو الرحمن الرحيم﴾ سوڕەتی بەقەرە/٦٣، دوەم سەرەتای سوڕەتی ئالی عیمران ﴿الم، الله لا إله إلا هو الحي القيوم﴾.

بە بەراوردکردنی هەمو ئەو فەرمودانە وا دەردەکەوێ ناوی هەرە مەزنی خودا (الله) بێ، چونکە لە هەمو فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ کە یادی ناوی هەرە مەزنی خودای کردوە (الله)ی تێدایە.

بە پێی هەڵژماردنی (المعجم المفهرس) لە قورئانی پیرۆزدا (١٦٩٧)جار ناوی (الله) هاتوە، ئەمەش تاسەنگی ئەوە دەکات کە ناوی هەرە مەزن (الله) بێ لەبەر ئەوەی ناوی (الرحمن) کە تایبەتە بە خودا تەنها (٧٥)جار لە قورئاندا هاتوە. هەروەها واتا زۆرو مەزنەکانی ئەم ناوەش هەمدیسان تاسەنگی ئەوە دەکات (الله) بێ.

# واجبیـــتی بڕوابون بە ناوەکانی خودا

پێشینانی چاك لەوە هاودەنگن بڕوا بون بە سەرجەم ناوە پیرۆزو جوانەکانی خوداو هەمو ئەو سـیفەتانەش کـە دیگەیـەنن‌و هـەمو ئـەو کردانـەش کـە لێیانـەوە سەرچاوە دەرگرن، واجبە. بۆ وێنە (توانا) بڕوابون بەوە واجبە کـە خـودای پـاك‌و بەرز هەمو شتێك دەتوانێ، هەروەها بڕوابون بە تەواوێتی تواناکەشـی، هەمدیسـان بڕوابون بەوەی هەرچی بونە بە توانای خودا پەیدا بوە.

## مەبەست لە هەژماردنی ناوەکانی خودا[60]:

پێغەمبەر ﷺ لەفەرمودەیەکدا[61] هانمان دەدات ناوەکانی خودا هەژمێرین‌و لە پای ئەوەدا بەڵێنی بەهەشتی داوە.

زانایان لە واتای وتەی (**من احصاها**)ی پێغەمبەر ﷺدا را جیاوازن.

(ئەلخەتتابی) دەڵێ: رەنگە چەند واتایەك ببەخشێ:

یەکەمیان: هەمویان بژمێرێ تا تەواوی دەکات، واتە بە هەر هەمو ناوەکان لە خودا بپاڕێتەوەو ستایشی بکات نەك بە هەندێکیان، بەم جۆرە بـەڵێنی پاداشـتیان وەردەگرێ.

بوخاریش ئەم لێکدانەوەی هەڵبژاردوەو هەڵژماردنی بە (ئەزبەر کردن) راڤـە کردوە لە بەر ئەوەی لە فەرمودەی تردا بە (من حفظها: ئەوەی ئەزبـەریان بکـات) هاتوە.

دوەمیـان: مەبەسـت لـە (هـەڵژماردن) ئەوەیـە بتوانـێ بـــە هـــەقی ناوەکـــان هەڵسێ‌و کردەوە بە داخوازیەکانیان بکات، واتاکانیان لە بەرچاو بگرێ‌و خۆی پـــێ پابەند بکات. بەجۆرێك بڵێ (بڕێویدەر) متمانەی بە بڕێوی هەبێ. ناوەکانی تریـش بەم جۆرە.

سێیەمیان: مەبەسـت ئەوەیـە پـەی بـە هـەمو واتاکانیـان ببـات. وتوشـــیانە (هەڵژماردن) واتە کاریان پێ بکات. گەر بڵێ (دانا: الحکیم) ئیتر ملکـەچی تـەواوی فـەرمان‌و ئەندازەگیریـەکانی خـودا بـێ‌و بزانـێ هـەموی لـە داناییـەوە سـەرچاوەی گرتوە.

---

[60] بۆ ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ معارج القبول (١/٨٤ و دواتر.

[61] فەرمودەکەی (( إن لله تسعة وتسعين إسما من أحصاها دخل الجنة، وهو وتر يحب الوتر )) لاپەرە. وەرگێڕ.

(ئیبنوبەتتاڵ) دەڵێ ڕێگاکانی کار پێکردن ئەوانەن:

* ئەو ناوانەی دەکرێ پەیڕەویان لێ بکرێ وەکو (الرحیم: میهرەبان)و (الكریم: بەڕێز)، بەندە دەبێ خۆی وا لێڕابێنێ پێیانەوە بناسرێ، واتە بە مافیان هەڵسێ[٦٢].

* ئەو ناوانەش تایبەتن بە خودا وەکو (الجبار: باڵا دەست)و (العظیم: مەزن‌و گەورە) ئەوا بەندە ملی بۆ کەچ بکات‌و بڕوای پێ بێ هەروەها لە خۆی نەهێنێتە دی.

* ئەو ناوانەی واتای بەڵێن‌و پاداشتی تێدایە ئەوا لە ئاستیاندا پەرۆش‌و تامەزرۆ بێ.

* ئەو ناوانەش کە واتای هەڕەشەو تۆڵەو سزای تێدایە ئەوا لە ئاستیاندا بە ترس‌و تاساو بێ.

لەوانەوە دەردەکەوێت مەبەست لە هەژماردن‌و ئەزبەر کردن بریتیە لە ناسین‌و پێ بەندەگی بون چونکە تەنها لەبەر کردنێکی ڕوت بەروبوم‌و تاوو کاریگەری نابێ، هەر وەکو ئەزبەرکردنی قورئانی پیرۆز ئەگەر کاری پێ نەکرێ بەروبوم‌و سودی نابێ، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکدا لە بارەی خەواریجەکاندا دەفەرموێ: قورئان دەخوێنن‌و لە گەرویان تێناپەڕێ.

---

[٦٢] مەبەست ئەوەیە بەندەیەکی بە میهر و ڕێزی لێ دەرچێ.

## نـــاوەكان:

ئیبنوحەجەری عەسقەلانی نەوەت‌و نۆ ناوی هەڵژماردوەو هەر هەموی لە قورئانی پیرۆز هێناوەتەوە، نزیکە تەواوی هێنابێ چونکە لەگەڵ فەرمودەکەی ئەباهورەیرەدا هەمان ژمارەیە کە نەوەت‌و نۆیە. ئێمەش وەکو خۆی دەیخەینە رو:

١- اَللَّهُ
٢- الرّب
٣- الإله
٤- الواحد
٥- الرحمن
٦- الرحيم
٧- الملك
٨- القدوس
٩- السلام
١٠- المؤمن
١١- المهيمن
١٢- العزيز
١٣- الجبار
١٤- المتكبر
١٥- الخالق
١٦- الباريء
١٧- المصور
١٨- الأول
١٩- الآخر
٢٠- الظاهر
٢١- الباطن
٢٢- الحيّ
٢٣- القيوم
٢٤- العليّ
٢٥- العظيم
٢٦- التواب
٢٧- الحليم
٢٨- الواسع
٢٩- الحكيم
٣٠- الشاكر
٣١- العليم
٣٢- الغنيّ
٣٣- الكريم
٣٤- العفوّ
٣٥- القدير
٣٦- اللطيف
٣٧- الخبير
٣٨- السميع
٣٩- البصير
٤٠- المولى
٤١- النصير
٤٢- القريب
٤٣- المجيب
٤٤- الرقيب
٤٥- الحسيب
٤٦- القويّ
٤٧- الشهيد
٤٨- الحميد
٤٩- المجيد
٥٠- المحيط
٥١- الحفيظ
٥٢- الحقّ
٥٣- المبين
٥٤- الغفّار
٥٥- القهّار
٥٦- الخلاّق
٥٧- الفتّاح
٥٨- الودود
٥٩- الغفور
٦٠- الرؤوف

٦١- الشكور
٦٢- الكبير
٦٣- المتعال
٦٤- المقيت
٦٥- المستعان
٦٦- الوهّاب
٦٧- الخفيّ
٦٨- الوارث
٦٩- الوليّ
٧٠- القائم
٧١- القادر
٧٢- الغالب
٧٣- القاهر

٧٤- البرّ
٧٥- الحافظ
٧٦- الأحد
٧٧- الصّمد
٧٨- المليك
٧٩- المقتدر
٨٠- الوكيل
٨١- الهادي
٨٢- الكفيل
٨٣- الكافي
٨٤- الأكرم
٨٥- الأعلى
٨٦- الرزّاق
٨٧- ذو القوة المتين

٨٨- غافر الذنب
٨٩- قابل التّوب
٩٠- شديد العقاب
٩١- ذو الطّول
٩٢- رفيع الدرجات
٩٣- سريع الحساب
٩٤- فاطر السّموات
٩٥- بديع السّموات والأرض
٩٦- نور السّموات والأرض
٩٧- مالك الملك
٩٨،٩٩- ذو الجلال والإكرام

١- اَللّٰهُ
٢- پەروەردگار
٣- خواوەند
٤- تەنیا
٥- میهرەوار
٦- میهرەوەر
٧- پادشا
٨- پیرۆزگار
٩- بێ خەوش‌و پەڵە،خۆشیبەخش
١٠- دڵنیاکەرەوە، هێمنی بەخش
١١- دەست ڕۆیشتو
١٢- زاڵ
١٣- باڵا دەست
١٤- خۆ بەگەورەزان
١٥- ئافەریدگار
١٦- بەدیهێنەر
١٧- شێوەبەخش
١٨- یەکەمین
١٩- دواهەمین
٢٠- دیار
٢١- پەنهان
٢٢- زندو
٢٣- خود ڕاپەرمو، ڕاگر
٢٤- بەرزو بڵند
٢٥- مەزن
٢٦- ژیوانی وەرگر
٢٧- نەرم‌و ئارام
٢٨- فرەوان
٢٩- لێزان
٣٠- سوپاس کراو
٣١- زانا
٣٢- بێ ئاتاج، دەوڵەمەند
٣٣- دەهندە
٣٤- لێبوردە
٣٥- بە توانا
٣٦- چاکەکاری پەنهان
٣٧- شارەزا
٣٨- ژنەوا، بیسەر
٣٩- بینا، دیدەوان
٤٠- سەرپەرشتگار

٤١- سەرخەر
٤٢- نزیك
٤٣- وەلامگۆ
٤٤- چاودێر
٤٥- لێپرس
٤٦- بەهێز
٤٧- ئاگەدار
٤٨- ستایش کراو
٤٩- شکۆمەند، شکۆگار
٥٠- پێزان
٥١- پارێزەر
٥٢- رەوا
٥٣- رون
٥٤- لێبوردگار
٥٥- زەبونکەر
٥٦- ئافەریدەکەر
٥٧- دەروکەرەوە
٥٨- خۆشەویست
٥٩- لێبوردە
٦٠- بەبەزەیی

٦١- سوپاسکراو
٦٢- گەورە
٦٣- هەرەبەرز
٦٤- بژێویگار
٦٥- پشت پێ بەستراو
٦٦- پێبەخشەر
٦٧- بزر
٦٨- میراتگر
٦٩- دۆست، یاریدەدەر
٧٠- راوەستاو
٧١- تەوانا
٧٢- زاڵ
٧٣- زەبونکەر
٧٤- چاکەکار
٧٥- پارێزکار
٧٦- یەکتا
٧٧- بێنیاز
٧٨- خاوەن
٧٩- بتوان
٨٠- بریکار

٨١- رێنوێنکار
٨٢- دەستەبەرکار
٨٣- بەسندە
٨٤- هەرەبەرێز
٨٥- بەرزترین
٨٦- بژێویدەر
٨٧- خاوەن هێزی پتەو
٨٨- لێخوشبوی گوناهان
٨٩- ژیوانی وەرگر
٩٠- تۆڵە توند
٩١- دەوڵەمەند
٩٢- خاوەن پلەی بەرز
٩٣- لێپرسی خێرا
٩٤- وەدیهێنەری ئاسمانان
٩٥- داهێنەری ئەرزو ئاسمانان
٩٦- روناکی ئەرزو ئاسمانان
٩٧- پادشای پادشایان
٩٨،٩٩- خاوەن رێزو شکۆ

# تایبەتیەکانی ناوە پیرۆزو جوانەکانی خودا

شێخ حەسەنی بەننا لە پەڕتوکەکەیدا بەناوی (العقائد: بیروباوەڕان)[٦٣] دەڵێ: هەندێ خەڵك دەڵێن هەر ناوێك لە ناوەکانی خودای بەرز کەسانی تایبەتو نهێنی خۆی هەیە.

رەنگە هەندێ کەس ئەم ئەندازەیەش ببەزێننو بڵێن هەر ناوێك راژەکارێکی روحانی هەیە راژەی ئەو کەسانە دەکات کە بەو ناوە یادی خودا دەکەن. خەڵکانێکی تر هەن دەڵێن ناوی هەرە مەزنی خودا یەکێکە لەنهێنیەکانو بە هەندێ کەس دەبەخشرێ، کارە ئەستەمو بێچارەکانی پێ دەچارێننو رێسا ئاساییەکانی پێ دەبەزێنن، شتی تایبەتی وایان دەبێ خەڵکانی تر نایانبێ.

ئەو خەڵکەی شێخ بەننا ئامـاژەی بۆ کردون بەبێ زانست ئەم قسانەیان کردوەو بەڵگەی هیچ ئایەتو فەرمودەیەکی تەواوی پێغەمبەر ﷺیان لەسەر نیە، هەر قسەیەکیش وابێ هیچ روەتێکی ئەوتۆی نابێو بە بەڵگە ناشێ چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**كل عمل ليس عليه أمرنا فهو ردّ**)).

ئەم جۆرە قسەو دەلەسانە دەرگای پڕوپوچاتیو ئەفسانەی خستە سەر پشتو بوە مایەی بە فیڕۆدانی چەندین کردوکۆشو کاتی بەنرخ لە پێناو رێبازێکی هەڵە، هەروەها گومراییەکی ناقۆڵای لێکەوتۆتەوە.

پایەو پاداشتی ئەو فەرمودەیەش کە پێغەمبەر ﷺ لە بارەی ناوی هەرەمەزنی خودا رایگەیاندوە هەر ئەوەیە ئەگەر بەوییەوە لە خودا بپاڕێتەوە پێی دەبەخشێو ئەگەر هاواری بکات بە دەنگیەوە دێ.

لەو چەند پەرەگرافەی دادێ سودو بەهرەی ناوەکانی خودا باس دەکەین کە ئەو کەسانە لێی بەهرەمەند دەبن کە بەناوو سیفەتەکانی خوا زاناو ئاشنان.

# سودەکانی ئاشنا بون بە ناوەکانی خودا

ئەو سودە راستەقینانەی موسوڵمانێك لە ناسینی ناوو سیفەتەکانی خودا وەریدەگرێ، دەکرێ لەم چەند خاڵە پوختیان بکەینەوە:

١- ناسینی خودای بەرزو پاك، ناوو سیفەتەکانی خودا تاکە رێگەیە کە خودامان پێ بناسێنێ، بێ ئەمە بڕوا هێنان بەخودا دەبێتە بیرێکی تەمتوماویو

---

[٦٣] مجموع الرسائل ٤٤٤،٤٤٧، شێخ حەسەنی بەننا ئەم وتەیەی بە ئ...ەزایی هێناوەتەوە.

بەروبومی شیرین نابەخشێ. سوپاس بۆ خوا پێشتر بە درێژی باسی ناوو سیفەتەکانما ـ کرد.

٢- شکۆمەندو ستایشکردنی خودا بەو ناوو سیفەتە پیرۆزانە، کە پێشتریش شتێکمان لەو بارەوە باس کردوە: شکۆمەندو ستایشکردنی خودا بەو ناو و سیفەتە پیرۆزانە مەزن‌و گەورەترین شکۆمەندو ستایشکردنی خودایە، یەکێکە لە گەورەترین ئەو یادکردنانەی کە خودا لەم ئایەتەدا فەرمانمان پێ دەکات ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾ سورەتی ئەحزاب/٤١، واتە: بڕواداران! یادێکی زۆری خودا بکەن.

٣- لە خودا پاڕانەوە بە هۆی ئەم ناو و سیفەتانە: وەکو خودا دەفەرموێ ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا﴾ واتە: خودا چەندین ناوی پیرۆزی هەیە، بەم ناوانە لە خودا بپاڕێنەوە. پێغەمبەر ﷺ پتر لە جارێك پێی ڕاگەیاندوین، جارێکیان یاوەرێك بە ناوی هەرەمەزنی خودا پاڕاوەو پێغەمبەر ﷺ فەرموی، بەم ناوە لە خودا بپاڕێنەوە وەڵامتان دەداتەوەو، ئەگەر بەم ناوە هانای بۆ ببەن بە هاناتان دێت.

## هەندێ لەشکۆگاریەکانی پێغەمبەر ﷺو ستایش و پاڕانەوەکانی لە خودا :

حەزدەکەم چەند وێنەیەك لە فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ بێنمەوە کە بە ناو و سیفەتە پیرۆزەکانی خودا؛ خودای شکۆگارو ستایش کردوەو لێی پاڕاواتەوە:

١- لە سونەنی ترمزیدا ئەبا هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت لە ئەبابەکری پێشەوای گێڕاوەتەوە خوا لێی ڕازی بێت بە پێغەمبەر ﷺی گوتوە: وتەیەکم فێربکە بەیانیان‌و ئێواران بیلێم. گوتی بڵێ: ((**اللهم عالم الغيب والشهادة فاطر السموات والأرض، رب كل شيء ومليكه، اشهد أن لا إله إلا انت، اعوذ بك من شرّ نفسي، وشرّ الشيطان وشركه، وان نقترف سوءاً على انفسنا أو نجرّه الى مسلم**)) واتە: خودایە! زانای دیارو نادیاران، پەیداکەری ئەرزو ئاسمانان، پەروەردگارو خاوەنی هەمو شتان، گەواهی دەدەدم جگە لە تۆ هیچ خودای تر نیە. خۆم بە تۆ دەپارێزم لە شەڕی نەفسی خۆم، لە شەڕی شەیتان‌و شەریکەکانی، لەوەش کە خراپەیەك بۆ خۆم یا بۆ موسوڵمانێك بکەم. ترمزی دەڵێ فەرمودەیەکی حەسەنە.

٢- له صه‌حیحی موسلیمدا ئه‌با سه‌عیدی خودری خوا لێی رازی بێت ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌گه‌ر سه‌ری له كڕنوش به‌رز كردباوه ده‌یفه‌رمو: ((**اللهم ربنا لك الحمد ملء السموات وملء الأرض وملء ما بينهما وملء ما شئت من شيء بعده، أهل الثناء والمجد، أحق ما قال العبد، وكلنا لك عبد، اللهم لا مانع لما أعطيت، ولا معطي لما منعت، ولا ينفع ذا الجد منك الجد**)) واته: خودایه ! ستایش هه‌ر بۆتۆیه، به پڕایی ئه‌رزو ئاسمانان به پڕایی هه‌ر شتێك كه خۆت مه‌به‌ستته ستایشت پێشكه‌ش، ئه‌ی شایه‌نی ستایش‌و شكۆ، راسترین وته كه به‌نده‌ت بیڵێ كه هه‌مومان به‌نده‌ی تۆین ئه‌وه‌یه:

خودایه ! رێگر له پێش به‌خشینی تۆدا نیه، به‌خشه‌ر له پێش نه‌به‌خشینی تۆدا نیه، هیچ خاوه‌ن پله‌یه‌ك له ئاست به‌رزی تۆدا هوده‌ی نیه.

٣- هه‌ر له صه‌حیحی موسلیمدا ثه‌وبان خوا لێی رازی بێت ده‌ڵێ پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌گه‌ر نوێژه‌كه‌ی ته‌واو بكردبایه سێ جاران (**أستغفرالله**)ی ده‌كردو پاشان ده‌یفه‌رمو ((**اللهم أنت السلام، ومنك السلام، تباركت وتعاليت يا ذا الجلال والإكرام**)) واته: خوایه تۆ بێخه‌وشی، بێكه‌موكوڕیی هه‌ر له تۆوه‌یه، پیرۆزو به‌رزی خودای خاوه‌ن شكۆو رێز.

٤- له هه‌ردو صه‌حیحاندا ئیبنو عه‌باس ده‌ڵێ پێغه‌مبه‌ر ﷺ له ته‌نگاناندا ده‌یفه‌رمو: ((**لا إله إلا الله العظيم الحليم، لا إله إلا الله رب العرش العظيم، لا إله إلا الله رب السموات ورب الأرض، رب العرش الكريم**)) واته: جگه له خودای مه‌زن‌و نه‌رمنده خوداوه‌ندی تر نیه، جگه له خودای خاوه‌ن باره‌گای مه‌زن خوداوه‌ندی تر نیه، جگه له خودای په‌روه‌ردگاری ئاسمانان‌و زه‌وی خوداوه‌ندی تر نیه، خودا په‌وره‌ردگاری باره‌گای مه‌زنه.

٥- له صه‌حیحی موسلیمدا سه‌موره‌ی كوڕی جوندوب خوا لێی رازی بێت ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمویه‌تی: ((**أحب الكلام الى الله تعالى اربع لا يضرك بأيهن بدات: سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله اكبر**)) له‌گێڕانه‌وه‌یه‌كی دی دا هاتوه ((**افضل الكلام بعد القرآن اربع وهن: سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله اكبر**)) واته: باشترین وته له دوای قورئاندا

ئەم چوارەو زیانی نیە کامیان پێش بخەی: پاکی بۆ خودا، ستایش بۆ خودا، (لا إله إلا الله) خودا گەورەترە.

٦- لە هەردو صەحیحاندا ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەر ﷺی گێراوەتەوە ((**کلمتان خفیفتان علی اللسان، ثقیلتان في المیزان، حبیبتان الی الرحمن، سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظیم**)) واتە: دو وتە هەن لەسەر زاردا سوکن لە تەرازودا گرانن، لە لای میهرەبانیشدا خۆشەویستن: پاکیو ستایش بۆ خودا، پاکی بۆ خودای مەزن.

٧- لە صەحیحی موسلیمدا ئیبنو عومەر خوا لێی رازی بێت پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرمو ئەگەر چویە سەر جێگا بڵێ: ((**اللهم أنت خلقت نفسي، وأنت تتوفاها، لك مماتها ومحياها، إن أحييتها فاحفظها، وإن أمتها فاغفر لها، اللهم إني أسألك العافية**)) واتە: خودایە تۆ نەفسی منت دروست کردوەو خۆشت دەیمرێنی مانو مەرگی هەر بۆ تۆیە، گەر ژیاندت بیپارێزە گەر مراندت لێی خۆش ببە. خودایە داوای سەلامەتیو لەشساغی تەنها لە تۆ دەکەم.

٨- لە صەحیحی موسلیمدا ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێ پێغەمبەر ﷺ کە دەچوە سەر جێگای نوستن دەیفەرمو: ((**اللهم رب السموات، ورب الأرض، ورب العرش العظيم، ربنا ورب كل شيء، فالق الحب والنوى، ومنزل التوراة والإنجيل والفرقان، أعوذ بك من شرّ كل ذي شرّ أنت آخذ بناصيته، أنت الأول فليس قبلك شيءٌ، وأنت الآخر فليس بعدك شيء، وأنت الظاهر فليس فوقك شيء وأنت الباطن فليس دونك شيء، اقضي عنا الدين، واغننا من الفقر**)) واتە: خودایە! پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەویو بارەگای مەزن، پەروەردگاری ئێمەو هەمو شتان والآ کەری دەنکە تۆو ناوکان دابەزێنەری تەوراتو ئینجیلو قورئان، خۆم بە تۆ دەپارێزم لە شەڕی هەمو شەڕانیەک.

تۆ یەکەمینیو هیچت لە پێشدا نەبوە، تۆ دواهەمینیو هیچت لە پاشدا نیە، تۆ دیاریو هیچت لە ژوردا نیە. تۆ پەنهانیو هیچت لە خوارتردا نیە. قەرزمان بۆ بدەوە، هەژاریمان لە کۆڵ بکەوە.

٩- لەهەردو صەحیحاندا ئیبنو عەبباس خوا لێی رازی بێت دەڵێ پێغەمبەر ﷺ کە لە هەناوی شەودا بۆ نوێژ رادەبو، دەیفەرمو: ((**اللهم لك الحمد، أنت نور**

**السموات والأرض ومن فيهن، ولك الحمد، أنت رب السموات والأرض ومن فيهنَ، ولك الحمد، أنت الحق، ووعدك الحق، وقولك الحق، ولقاءك حق، والجنة حق، والنار حق، والنبيّون حق، ومحمد صلى الله عليه وسلم حق، والساعة حق، اللهم لك أسلمت، وبك آمنت، وعليك توكلت، وإليك أنبت، وبك خاصمت، وإليك حاكمت، فاغفر لي ما قدمت وما أخرت، وما أسررت وما أعلنت، أنت الهي لا إله إلا أنت))** واته: خودایه ! ستایش بۆ تۆ، تۆ روناکی ئەرزو ئاسمانەکانیو ئەوانەش کە لە نێوانیاندا هەیە. ستایش بۆ تۆ، تۆ پەروەردگاری ئەرزو ئاسمانەکانیو ئەوانەش لەنێوانیاندا هەیە. ستایش بۆ تۆ، تۆ هەقی بەڵێنو وتەو دیدارو بەهەشتو دۆزەخو پێغەمبەرانو موحەممەدو رۆژی دوایی سەرجەمیان راست وهەقن. خودایە خۆم دا دەستت. بڕوام پێتە پشتت پێ دەبەستم. بۆ تۆ ژیوان بومەوە، سکاڵام بۆ لای تۆ هێناوە. خودایە لە گوناهی پێشو پاشم خۆش ببە، لەو گوناهانەش کە بە ئاشکراو بە نادیاری کردومن، تۆ خودامی جگە لە تۆ خواوەندی تر نین.

*** * * * ***

## ئەو ڕێوشـوێنەی لەبەر ڕۆشناییەکـــەیدا بە هاسانی لە ناو و سیفەتەکـــانی خودا دەگەین[٦٤]:

شێخ موحەممەد ئەمینی شەنقیطی –بەهەشتی بێ– دەڵێ: قورئـان ڕێبـەری ئەوەی کردوە کە توێژینەوە لە سیفەتەکانی خودا سێ بنەڕەت هــەڵدەنێ، ئـەوەی هەموویان جێبەجێ بکات، کاری ڕاست هاتوەو پەیڕەوی لەو بیروباوەڕە کـردوە کە پێغەمبەرﷺو یارو پێشینانی چاك هەیانبوە. هەر کەسێکیش ئەگەر یەك بنچینەش بەجێ نەگەیەنێ ئەوا گومڕایەو ڕاستەڕێی بزر کردوە.

شەنقیطی ئەوەشی هێناوەتەوە کە ئـەم سێ بنچینەیـە بەڵگـەی قورئانیـان هەیە.

**بنچینەی یەکەم:** پاکانەکردنی خـودای بـەرزو بێـهاوتا لـەوەی سـیفەتی ئافەریدان بە هی ئەو بچـێ. ئـەم بنەڕەتـە ئـەم ئایەتـەی بەڵگەیـە ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾ سوڕەتی شورا/١١، واتــە: هیــچ شـتێك بـە خـودا ناچـێ، ﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ﴾ سوڕەتی ئیخلاص/٣، واتە: قـەت هامتـای نـەبوە، ﴿فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَ﴾ سوڕەتی نەحل/٧٤، واتــە: وێنـەو نمونـە بـۆ خـودا مەهێننـەوە (چونکـە یەکتایە).

**بنچینـەی دوەم:** بـڕوا هێنـان بـەو سیفەتانەی خـودا خـۆی پـێ وەسـف کردوە. چونکە کەس لە خـودا زانـاتر نیـە وەسـفی خـودا بکـات ﴿ءَأَنتُمۡ أَعۡلَمُ أَمِ ٱللَّهُ﴾ سوڕەتی بەقەڕە/١٤٠، واتە: ئەرێ ئێوە زاناترن یان خودا؟.

هەروەها بڕوا هێنان بەو سیفەتانەی کە پێغەمبەر ﷺ خودای پێ یاد کـردوە، چونکە پاش خودا کەسێك نیە لە پێغەمبـەری خـودا ئاشـناتر بـێ. خـودا لـەبارەی پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝﴾ سوڕەتی نەجم/٣–٤، واتە: لە خۆڕا قورئان نـابێژێ، بـەڵکو سروشـی خودایـەو بـە سروش لەبۆی دێ.

---

[٦٤] منهج و دراسات لآيات الأسماء والصفات.

## گومڕایی ئەو کەسانەی تەنها یەك لەم دو بنەڕەتەیان وەرگرتوە

شێخ شەنقیطی بۆ ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە دەڵێ: (گەر ئەرکبارێك یەك لەم دو بنەڕەتەی وەرگرتو ئەوی تری واز لێهێنا ئەوا بۆ نێو دوڵی بێ بنی گومڕایی گلێربۆتەوە.

مەگەر گومڕاوێك هێندە بەجەرگ بێ لە بەرامبەر خودای ئەرزو ئاسمانان ئاوەها دەمەوەری بکاتو سیفەتێك خودا بە خۆی بۆ خۆی سەلماندبێ، ڕەتی بکاتەوە!

خودای بەرزو بەڕێز خۆی سیفەتەکانی خۆی بسەلمێنێو بفەرموێ ئەوانە لە سیفەتی تەواوەکانی منن، کەچی نەزانێکی زەبون بێباکانە بەر لە وتەکانی خودای ئەرزو ئاسمانان بگرێتەوەو بڵێ: ئەوەی تۆ بۆ خۆت وەسفت کردوە شایەنی تۆ نیەو لەتۆ ناوەشێتەوە، بۆ تۆ کەمایەسیە. بۆیە من لە خۆڕا واتاوێری دەکەم و، لە خۆمەوە بێنەوەی بەڵگەی قورئانو فەرمودەم هەبێ واتای تری بۆ دەدۆزمەوە.

-پاکی بۆ تۆ خوایە لەو جۆرە کردە نابەجێیانە- ئەو کەسەش وا تێ بگات سیفەتێك لە سیفەتەکانی خودا بە هی ئافەریدان دەچێت ئەوا گومڕاو نەزانە).

## ڕاستەڕێبوان

ئەو کەسەی بڕوا بە سەرجەم سیفەتەکانی خودا بێنێو خودای لە هەمو وێچواندنێك پاکەوەر کردبێ، ئەوا بڕوادارێکی بێخەوشو ساغەو گیرۆدەی دەردی وێچواندنو لەکارخستن نەبوە.

## تەنها یەك تاکە ئایەت بەڵگەیە بۆ ئەم ڕێوشوێنە

هەمو ئەم قسانە فامرانەوەی ئەم ئایەتەن ﴿فَاطِرُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَمِنَ الأَنْعَامِ أَزْوَاجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ سورەتی شورا/١١، واتە: هیچ شتێك مانەندی خودا نیە، خودا ژنەواو بینایە.

ئەم تاکە ئایەتە گشت گرفتو پێکەڵیەکان چارە دەکاتو وەرامی سەرجەم پرسیارەکان دەداتەوە.

چونکە خـودا لـە دوای ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾ فەرمويـەتی ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ ئاشکرایە هەمو روحلەبەرێك سیفەتی بیستن‌و بینینـی هەیە. لێرەدا وەك بلێی خـودا ئامـاژە بۆ ئافـەریدان بکـات؛ نـەرێ لـەم دو سـیفەتەی نەکـەن، بـەلام لەسـەریان پێویستـە سـیفەتی بیستن‌و بینـین بـە پێـی ئـەو بنەڕەتـە بـۆ خـودا بسەلمێنن کە شت نیە مانەندی خودا بێت.

شتێکی تەواوو ئاشکرایە ئەو سیفەتانەی خودا هەیەتی هەر هـەموی شـایەن‌و لێوەشـاوەی شـکۆو بێکەمایەسیەکەیەتی. ئافـەریدەکراوانیش سـیفەتیان هەیـەو شیاوی خۆیانە. سیفەتەکانی پەروەردگاری ئـەرزو ئاسمانـان لـەوە گـەلێ بـەرزترو تەواوترە بە سیفەتی ئافەریدان بچێ.

**بنچینەی سێیەم:** لێ نەپێچانەوەی هەرگیز لە هەقیقـەتی چۆنیەتیەکـەی. چونکە مەحالە پەی بە هەقیقـەتی چۆنیـەتی خـودا بـبردرێ. ئەمـەش فەرمایشـتی خودا خۆیەتی کـە لـە سـورەتی (طاهـا)دا دەفـەرموێ ﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا﴾ سورەتی طاها/١١٠، واتە: هەرچی کاروبـاری دوارۆژو دنیایە دەیزانێ، زانیاری ئەوانیش بە زات‌و سیفەت‌و زانیاری خودا ناشکێ.

وتـەی (یحیطـون) فـەرمانی رابـردوە، لــە لای رێزماننـاسـان فعلـی رابـردوو رانەبردو فەرمان لە (چاوگ‌و کات)دا دەردەهێنرێ.

بـەلام رەوانبێژیناسـان لـە ئیسـتیعارەی تەبـەعیدا دەلێـن لـە(چـاوگ‌و کـات‌و نیسبەت) دادەڕێژرێ. زانایان لەوە یـەکدەنگن کـە چـاوگ لـە چەمکەکەیدایـە. جـا (یحیطون) چاوگی (الإحاطة)ی لە چەمك دایە. کەواتە لـە ئایەتەکـەدا نەرێیەکـە بـۆ چاوگی (الإحاطـة) دەگەڕێتـەوە. بـەم جۆرە ئایەتەکـە واتاکـەی وا دێـت: زانسـتی مرۆڤ ناتوانێ (إحاطة) بە پـەورەردگاری ئـەرزو ئاسمـان بکـات. نـەرێی لـە هـەمو (إحاطة)یەك کردوە چۆنیەتی نازانێ. چونکە زانستی بەشەر ئەوەی لەباردا نیە.

بۆیەکا شێخی فرەزان دەلێ: شتێکی ژێر بێژیە کە مەحالـە چۆنیـەتی خـوداو سیفەتەکانی بزاندرێ. چونکە مێشـکی مـرۆڤ هەرچـەندی ژیـرو پـەی بـەهێز بـێ، هێشتا گۆت‌و دەسەوسانەو ناتوانێ راستەقینەی شتان بناسێ.

مرۆڤ لە ناسینی راستەقینەی روحی خۆی دەسەوسانە، لە ناسینی هەقیقەتی روناکی دەسەوسانە لەهەمو شتێك بەرچاوترە، لە پەیبردن بە هەقیقەتی ئەنبوژەن دەسەوسانە، لە هەقیقەتی گەردیلەکان دەسەوسانە... جا چۆن هەڵپە دەکاتو دەیەوێ هەقیقەتو زاتو سیفەتەکانی خودا بناسێ!.

## هۆیەکانی لارێبون لە رێوشوێنی راست و دروست

لارێبون لە رێوشوێنی راستو دروستی ناوو سیفەتەکانی خودا لە ئەنجامی ئەوە بوە کە یەکێك لەم سێ بنچینەیە فەرامۆش کراوە.

ئەوانەی لە راستەرێی ناوو سیفەتەکانی خودا لارێ بون دەتوانین بۆ سێ چین دابەشیان بکەین:

### **یەکەم**/ لارێبونی هاوبەشپەرستان:

هاوبەشپەرستانیش لارێ بون، هەروەکو ئیبنوعەبباسو ئیبنو جورەیجو موجاهید دەڵێن: هاوبەشپەرستەکان ناوەکانی خودایان گۆڕیوەو لێیان کەمو زیاد کردوەو بتەکانیان پێ ناودێر کردوە. بۆ وێنە (لات)یان لە (اللّٰه) داتاشیوە. (عوززا)ش لە (العزیز)و (مەنات)یش لە (المنّان: بەخشندە).

هەروەها بڕوایان بە چەندین ناوی خودا نەبوەو بە درۆیان زانیوە. بۆ وێنە بڕوایان بە ناوی (الرحمن) نەدەهێنا ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَنِ﴾ سورەتی رەعد/٣٠، ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اسْجُدُوا لِلرَّحْمَنِ، قَالُوا: وَمَا الرَّحْمَنُ؟﴾ سورەتی فورقان/٦٠ واتە: گەر پێیان بڵێی: سوژدە بۆ (بەخشندە) ببەن دەڵێن بەخشندە کێیە؟!.

### **دوەم**/ لارێبونی وێچوێنەران:

ئەم جۆرە کەسانە ئەو سیفەتانەیان بۆ خودا سەلماندوە کە خودا بۆ خۆی سەلماندونی، بەڵام پاکەوەری خودایان نەکردوە لەوەی بە ئافەریدان نەچێ. کاریان بە ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ کردوە بەڵام کاریان بە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ نەکردوە. قسەی وایان کردوە پیاو موچڕکی بەلەش دادێ. دەڵێن دەستو دیتنو بیستنی خودا وەکو دەستو دیتنو بیستنی ئێمەیە. -پاکیو بەرزی بۆ خودا لەو وتە نابەجێیانە-.

ئەوانە خودا ناپەرستن بەڵکو بت دەپەرستن، زانایانی پێشین وتویانە (وێچوێنەران بت دەپەرستن). بە هۆی ئەم قسانە بێبڕواییان کردوەو لە نەتەوەی ئیسلام شۆڕاون.

لارووێربونی ئەم دو چینە(هاوبەشپەرستانو وێچوێنەران) هەمبەرە، چینی یەکەم ئافەریدەیان هێناوەتە ریز ئافەریدگار، چینی دوەمیش ئافەریدگاریان هێناوەتە ریزی ئافەریدانو بە جەستەی وانیان چواندوە.

پاكو تەنهایی بۆ خودا لەو گومڕاییو تۆمانجانە.

## سێیەم/ لاڕێبونی نەرێبێژان:

کە ئەوانیش سێ چینن:

١- چینێکیان نەرێیان لە سەرجەم ناوو ئەو واتایانەش کردوە کە دەیگەیەنن. بە جۆرێك خودایان بە نەبوێکی رەها وەسف کردوە. ئەوانە پێیان دەڵێن: جەهمیەکان هەڵبەت ئەوانە وەکو هاوبەشپەرستەکان بەرامبەر بە خودا بێبڕوا بون.

٢- چینێکی تریان تەنها واژەی ناوەکانیان سەلماندوە بێئەوەی ئەو واتایانە بسەلمێنن کە ناوەکان هەڵیدەگرن. دەیانوت: خودا، میهرەبانی بێ میهرە، تەوانای بێ توانایە، ژنەوای بێ ژنەوتنە... تاد. ئەمانە پێیان دەڵێن: موعتەزیلەکان.

٣- چینی سێیەم ئەوانەن کە تەنها ئەم حەفت سیفەتە بۆ خودا دەسەلمێنن: ژیان، زانست، توانا، ویست، بیستن، بینین، قسە. ئەوانی تر هەرچی هەیە نەرێی لێ دەکەن. ئەوانە پێیان دەڵێن ئەشعەریەکان.

## رونکردنەوەی نابەجێیەتی وتەکانیان

ئەو بێبڕوایانەی بڕوا بە ناو و سیفەتەکانی خودا ناهێنن، ئەو وێچوێنەرانەی سیفەتەکانی خودا بەهی ئافەریدان دەچوێنن، هەروەها ئەوانەش نەرێ لە ناوو سیفەتەکانی خودا دەکەن، شێواوی‌و گومڕاییان وەك رۆژی روناك دیارە. ئەوانە نافەرمانی خواو پێغەمبەر دەکەنو بڕوا بە قورئانو سوننەت ناهێنن. نابەجێیان هێندە زەقە تەنانەت رونکردنەوەشی گەرەك نیە.

بەلام ئەوانەی پێویستە روی دزێوو رموزنی وتەکانیان وەدەرخرێ کەلامناسانن، دەڵێن ئێمە خودا لەوە بە پاك دەزانین بە ئافەریدەکانی بچێت. بەم

جۆرە هەرچی سیفەتەکانی خوایەو لە قورئانو فەرمودەدا هاتوە نەرێی لیٚ دەکەن، بە هەنجەتی ئەوەی وێچواندن پەیدا دەبێ. ئینجا پەنا دەبەنە بەر واتاوێرکردنی سیفەتەکانو لە واتای راستەقینەی خۆی هاوێری دەکەن[٦٥].

شێخ.موحەممەد ئەمینی شەنقیطی فەرەزان –بەهەشتی بێ– رێوشوێنی کەلامناسانی چاك رون کردۆتەوە کە چۆن سیفەتەکانی خودایان دابەش کردوە. ئەوەی رونکردۆتەوە کامە سیفەتیان سەلماندوەو کامەیان نەسەلماندوەو نەرێیان لیٚ کردوە. هەروەها ترازانو هەڵەکانیشی رون کردۆتەوە.

پاشان بەڵگەی قورئانی هێناوەتەوە کە نابێو رەوا نیە سیفەتەکانی خودا نەرێیان لیٚ بکرێ بە هەنجەتی ئەوەی ئافەریدانیش ئەم سیفەتانەیان هەیە. چونکە سیفەتەکانی خودا شایەنی شکۆ وپایەی خۆیەتی وئافەریدانیش سیفەتەکانیان لە ئەندازەی خۆیانە.

## جۆری سیفەتەکانی خودا لە لای کەلامناساندا

شێخ شەنقیطی ئەم جۆرانەی رونکردۆتەوەو دەڵێ: هەیاران! ئێوەش بیزانن، ئەو کەلامناسانەی چەپوکوپ سەرگەرمی کەلامناسی بونەو چەند بەڵگەیەکی بەناو ئاوەزیان ئاوێتەی چەند پێودانێکی ژێربیژی کردوە، سیفەتەکانی خودایان بۆ شەش جۆر دابەش کردوە ئەمانەن:

١– سیفەتی نەفسی.
٢– سیفەتی مەعنەوی.
٣– سیفەتی سەلبی.
٤– سیفەتی واتایی (معنى).
٥– سیفەتی کردەیی (فعلى).
٦– سیفەتی کۆگری(جامعة).

---

[٦٥] هەندێ لە هاوچەرخانی وەکو شێخ حەسەنی بەنناو شێخ حەسەن ئەییوب و کەسانی تریش تەقەلایان داوە هەڵەی ئەوانەی بە (خەلەف: پاشینەکان) ناسراون، سوکەڵە و هاسان هەڵسەنگێنن و، دید و بۆچونی پێشینەو پاشینەکان لە یەك نزیك بخەنەوە. بەلام راستی ئەوەیە کە بۆچونی پاشینەکان کە رواڵەتی سیفەتەکان وەرناگرن و واتاوێری دەکەن لە هەقیقەت گەلیٚ دورەو هەتەری کردوە. قەت ئەم دو بۆچونەش ئاشنای یەکتر نابن. هەروەها نیاز پاکی پاشینەکانیش نابێتە مایەی راست و دروستی وتە هەتەر کردوەکانیان.

## سیفەتە سەرباریەکان (ئیزافیەکان)

سیفەتە سەرباریەکانیان وا لێکردوە چەند فەرمانێکی ئیعتیباری بن‌و لە دەرەوە بونیان نەبێ. بە سەبارەتی ئەمەوە چەندین رەشکەو پێشکەو گومڕایی ناقولایان بەرپا کرد.

## ڕێوشوێنی قورئان

پاشان دابەشکاریەکەی کەلامناسەکانتان بۆ رون دەکەینەوە کە ئەو سیفەتانە چۆن لە وەسفی خوداو لە وەسفی ئافەریدان هاتوە.

هەروەها ئەوەشتان بۆ رون دەکەینەوە کە سیفەتەکانی خودا هەق‌و راستن هەروەها سیفەتەکانی ئافەریدانیش راستن، بەڵام پێکچونیان لە نێوان نیە، چونکە سیفەتەکانی خودا لەزاتی خۆی دەوەشێتەوە، هی ئافەریدانیش لەگەڵ ئاتاج‌و دەسەوسانیان گونجاوە. جیاوازی نێوان سیفەتەکانیان وەك جیاوازی نێوان زاتەکانیانە.

## سیفەتە واتاییەکان لە لای کەلامناساندا:

### (ژمارەیان، پێناسەیان، هەڵوێستی موعتەزیلە)

ئەو کەلامناسیەی موسڵمانان ئەوڕۆکە لە زۆربەی هەرێمە جیاجیاکانی جیهان دەیخوێنن، تەنها ئەوە دەسەلمێنن کە پێی دەڵێن سیفەتە واتاییەکان کە ژمارەیان حەفت سیفەتە، ئەوانی تر ناسەلمێنن.

سیفەتی واتایی لە زاراوەی ئەواندا بەوانە دەگوترێ بەڵگەیە بۆ واتایەکی هەبونی بەخۆراگیر.

ئەو سیفەتانەی سەلماندویانە حەفتن: توانا، ویست، زانست، ژیان، بیستن، دیتن، قسە. بەڵام سیفەتە واتاییەکانی تریان نەسەلماندوە پاشان بە خۆیان‌و بەڵگەکانیان رون دەکەینەوە.

موعتەزیلەکان واتای ئەم حەفت سیفەتەیان نەسەلماندوە بەڵام حوکمەکانیان سەلماندوە.

دەڵێن: بە زات توانایە، بە زات بیسەرە، بە زات زانایە، بە زات زندوە.

بەڵام تواناو زانست‌و ژیان‌و بیستن‌و دیتنیان لە ترسی فرەبونی دێرین نەسەلماندوە. هەمو هۆشمەندان دەزانن گومڕاییەکی لەگەڵ یەکدا نەسازە، چونکە

ئەگەر زانستەکەی (بەخۆ راگیر – قائم بالذات) نەبێ مەحاڵە بگوترێ: زانای بێ زانستە. نەسازیەکی ئاشکرایەو ژیری سەرەتاییش دەیزانێ.

ئێستاکەش باسی ئەو سیفەتە واتاییانە دەکەین:

١- وەسفی خودایان بە (توانا) کردوەو توانایان بۆ خودا سەلماندوە. خوداش لە قورئاندا دەفەرموێ ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٠، واتە: خودا هەمو شتێك دەتوانی. پێمان وایە خودا بەم شێوەیە بە سیفەتی توانا سیفەتمەندە لە شکۆو تەواوی ئەودا بوەشێتەوە.

خودا ئافەریدانیشی بە توانا وەسف کردوە ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ﴾ سورەتی مائیدە/٣٤، واتە: تەنها ئەو کەسانە نەبن بەر لەوەی تواناتان بەسەریاندا هەبێ، ژیوانی دەردەبڕن. لێرەدا توانا خراوەتە بەر هەندێ ئافەریدانو بۆ کەسانێك ئاماژە کراوە.

ئێمەش دەزانین هەرچی لە قورئاندا هەبێ هەقو راستەو خودا توانایەکی راستەقینەو شانو شکۆو تەواوی هەیە، هەورەها ئافەریدانیش توانایان هەیە بەڵام بەپێی دۆخو دەسەوسانیو تونابونو ئاتاجەکەیانە. جیاوازی لە نێوان توانای ئافەریدگارو توانای ئافەریدە وەك جیاوازی نێوان زاتی خوداو زاتی ئافەریدەیە.

٢،٣- خودا لە چەندین ئایەتدا خۆی بە بیسەرو بینا وەسف کردوە: ﴿إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ سورەتی موجادەلە/١، ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ سورەتی شورا/١١، هەروەها هەندێ ئافەریدەشی بە بیسەرو بینا وەسف کردوە ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ سورەتی ئینسان/٢، واتە: ئێمە مرۆڤمان لە ئاوێکی ئاوێتە ئافەریدە کردوەو کردومانە بە بیسەرو بینا.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا﴾ سورەتی مەریەم/٣٨.

ئێمە گومانمان نیە هەرچی لەقورئاندا هەیە راستە. خودا (بیستنو دیتن)ی هەیەو شایەنی تەواویو شکۆی خۆیەتی. هەروەها ئافەریدانیش بیستنو دیتنی راستەقینەیان هەیە بەڵام گونجاوو هاوسازی هەژاریو تونابونو دەسەوسانیەکانیانە.

جیاوازی نێوان بیستن‌و دیتنی خودا لەگەڵ هی ئافەریدان وەکو جیاوازی نێوان زاتی خوداو زاتی ئافەریدانە.

٤- خودا بە ژیان وەسفی خۆی کردوە: ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٥.

﴿هُوَ الْحَيُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ سورەتی غافر/٦٥، واتە: خودا زندوەو جگە لەو هیچ خودای تر نیە.

﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ﴾ سورەتی فورقان/٥٨، واتە: پشت بەو خودایە ببەستە کە زندوەو نامرێ.

خودای گەورە هەندێ لە ئافەریدانیشی بە (ژیان) وەسف کردوە: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ سورەتی ئەنبیاء/٣٠، واتە: هەمو زندوێکمان لە ئاو فەراهەم هێناوە.

﴿وَسَلَامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا﴾ سورەتی مەریەم/١٥، واتە: هەر لەو رۆژەی کە بوەو دەمرێ‌و زندو دەکرێتەوە سڵاوی پێشکەش.

﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ﴾ سورەتی روم/١٩، واتە: زندو لە مردوو مردو لە زندو دەردەهێنێ.

ئێمە گومانمان نیە هەرچی لە قورئاندا هەیە راستە. خودا ژیانی هەیەو شایەنی تەواوی‌و شکۆی خۆیەتی. هەروەها ئافەریدانیش ژیانیان هەیە بەڵام بە گوێرەی دۆخ‌و دەسەوسانی‌و تونابون‌و ئاتاج بونیانە.

جیاوازی لە نێوان ژیانی خوداو ژیانی ئافەریدان وەك جیاوازی نێوان زاتی خوداو زاتی ئافەریدانە.

٥- خودا خۆی بە (ویست) وەسف کردوە:

﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾ سورەتی بروج/١٦، واتە: چی بوێ دەیکات.

﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ سورەتی یاسین/٨٢، واتە: فەرمانی خودا وایە گەر شتێکی مەبەست بێ پێی بڵێ ببە، دەبێت.

هەروەها هەندێ لە ئافەریدانیشی بە (ویست) وەسف کردوە ﴿تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا﴾ سورەتی ئەنفال/٦٧، واتە: کاڵاو شروشیتاڵی دنیاتـان دەوێ، ﴿إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا﴾ سورەتی ئەحزاب/١٣، ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ﴾ سورەتی صەف/٨.

بێگومان هەرچی لە قورئاندا هاتوە هەموی راستە.

خودا ویستێکی راستەقینەو شایەن تـەواوی‌و شـکۆی خـۆی هەیـە، هـەروەها ئافـەریدانیش ویسـتیان هەیـە بـەڵام بـە گوێـرەی دۆخ‌و دەسەوسـانی‌و تونـابون‌و ئاتاجبونیانە.

جیاوازی لە نێوان ویستی خوداو ویستی ئافەریدانی وەکو جیاوی نێوان زاتـی خوداو زاتی ئافەریدانە.

٦- خوا خۆی بە (زانست) وەسف کردوە:

﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ سورەتی نور/٣٥.

﴿لَّٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ﴾ سورەتی نیساء/١٦٦.

﴿فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَائِبِينَ﴾ سورەتی ئەعراف/٧.

هەروەها هەندێ لە ئافەریدانیشـی بـەزانین وەسـف کـردوە: ﴿وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ﴾ سورەتی ذاریات/٢٨.

﴿وَإِنَّهُ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَاهُ﴾ سورەتی یوسف/٦٨.

هەڵبـەت خـودا زانسـتێکی وای هەیـە شـایانی شـکۆو تـەواوی خۆیـەتی ئافەریدانیش زانستیان هەیە شایەنی دۆخ‌و تونا بون‌و دەسەوسانی‌و ئاتاج بونیانە.

جیاوازی نێوان زانستی خوداو زانستی ئافەریدانی وەکو جیاوازی نێوان زاتـی خوداو زاتی ئافەریدانە.

٧- خودا خۆی بە (قسە) وەسف کردوە.

﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾ سورەتی نیساء/١٦٤.

﴿فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ﴾ سورەتی تەوبە/٦.

هەروەها هەندێ لە ئافەریدانیشی بە (قسە) وەسف کردوە: ﴿فَلَمَّا كَلَّمَهُ قَالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾ سورەتی یوسف/٥٤، ﴿وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ﴾ سورەتی یاسین/٦٥.

بێگومان خودا قسەی راستەقینەی هەیەو لە شکۆو تەواویتی خۆی دەوەشێتەوە، هەروەها ئافەریدانیش قسەیان هەیە لە دۆخ و تونابونو دەسەوسان و ئاتاجیان دەوەشێتەوە.

جیاوازی لە نێوان قسەی ئافەریدگارو قسەی ئافەریدانی وەکو جیاوازی نێوان زاتی ئافەریدگارو زاتی ئافەریدەیە.

ئەوەبو سیفەتە واتاییەکان، بینیتان خودا چۆن خۆی پێ وەسف دەکاتو چۆنیش ئافەریدانی پێ وەسف دەکات.

لە هۆشمەندان شاراوە نیە کە سیفەتەکانی خودا راستو هەقنو شایەنی شکۆو تەواویتی خۆیەتی، هەروەها سیفەتەکانی ئافەریدانیش لەگەڵ دۆخ و باری ئەواندا دەگونجێ. جیاوازی نێوان سیفەتی خوداو سیفەتی ئافەریدانی وەکو جیاوازی نێوان زاتی خوداو زاتی ئافەریدە وایە.

ئێستاش باس لەو سیفەتانە دەکەین پێی دەڵێن سیفەتە سەلبییەکان:

## دەربارەی سیفەتە سەلبییەکان لە لای کەلامناسەکاندا

## پێناسەو ژماریان

رێکخەری سیفەتی سەلبی لەلای کەلامناساندا ئەوەیە سیفەتەکە عەدەمێکی رەها نیشان بدات. مەبەست ئەوەیە ئەو شتانە لە خوا سەلب بکات کە لە خودا ناوەشێنەوە. بێئەوەی واتایەکی هەبونی بەخۆراگیر بنوێنێ.

هەوادارانی ئەم قسەیە، سیفەتە سەلبیەکانیان کردۆتە پێنج سیفەتو شەشەمو هی تری لە پاش نیە. کە ئەوانەن:

دێرینی (القدم)، مانەوە (البقاء)، جیاوازی لەگەڵ ئافەریدان (المخالفة للخلق)، تاکێتی (الوحدانية)، بێنیازی رەها (الغني المطلق) کە پێی دەڵێن (القيام بالنفس) مەبەستیان ئەوەیە لە شوێنو جێگا بێنیازە.

## ٢،١- مەبەستیان لـە دێرینـیو مانـەوەدا یەکـەمینو دواییینـە (الأول والآخـر)

کەلامناسەکان خودایان بە دێرینو مانەوە وەسف کردوەو دەڵێن خودا خۆی بەوانە وەسف کردوە، مەبەستیان لەم ئایەتە دێ ﴿هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ﴾ خـودا یەکـەمینو دواییینە.

## پێناسەی دێرینی

لە زاراوەی کەلامناساندا دێرینی بریتیە لە سەلبی عەدەمی پێشو. پێیان وایە دێرینی لە بنەوانی (ئەزەلی) تایبەت ترە. چونکـە بنـەوانی ئەوەیـە دەسـتپێکردنی نەبێ. جا ئایە هەبونی بێ: وەکو زاتو سیفەتەکانی خودا، یاخود نەبونی (عەدەم) بێ. پێیان وایە دێرینی بریتیە لەوەی کە سەرەتای نەبێ بەو مەرجەی هەبونی بـێ وەکو زاتی پیرۆزی خودا کە خاوەنی سیفەتەکانی تەواویتیو شکۆمەندیە.

ئێمە لێرەدا لە دێریـنو مانـەوە دەدوێـین کـە خودایـان پـێ وەسـف کـردوە، ئەگەر چی هەندێ لە زانایان پێیان مەکروهـ بوە بە دێرین وەسفی خودا بکرێ.

خودا لە قورئاندا بە دێرین وەسفی ئافەریدانی کردوە ﴿تَاللهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَالِكَ الْقَدِيمِ﴾ سـورەتی یوسـف/٩٥، ﴿كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ﴾ سـورەتی یاسـین/٣٩، ﴿أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الأَقْدَمُونَ﴾ سورەتی شوعەراء/٧٦.

هـەروەها بـە مانـەوەش وەسـفی ئافـەریدانی کـردوە: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ﴾ سورەتی صافات/٧٧، ﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللهِ بَاقٍ﴾ سـورەتی نەحل/٩٦.

هەڵبەت ئەو دێرینو مانەوەیـەی خـودای پـێ وەسـف کـراوە تـەواو جیـاوازە لەگەڵ ئەوەی خودا ئافەریدانی پێ وەسف کردوە.

## وەسفکردنی خودا بە دێرین و مانەوە لە قورئان و فەرمودەدا نەهاتوە

خودا لە قورئاندا خۆی بە دێریـن وەسـف نـەکردوە، هـەندێ لـە پێشـینانیش پێیان ناخۆش بوە خودا بە دێرین وەسف بکرێ. چونکە دێرین بـۆ ئـەوەش بـەکار دێت کە نەبونی لە پێشدا هاتبێ. وەکو:

﴿ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ ﴾ سورەتی یاسین/٣٩.

﴿ تَاللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَالِكَ الْقَدِيمِ ﴾ سورەتی یوسف/٩٥.

﴿ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ ﴾ سورەتی شوعەڕاء/٧٦.

هەندێك پێیان وایە فەرمودە لەو بارەوە هاتوە خودای بە دێرین وەسف کردبێ، هەندێ لە زانایان دەڵێن سیفەتی دێرین نیشان دەدات.

هەندێکی تر دەڵێن لە هیچ فەرمودان نەهاتوە.

بەڵام یەکەمین و دوامین لە قورئاندا ئایەتی لەسەرەو خودا خۆی پێ وەسف کردوە ﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ﴾.

هەروەها ئافەریدانیشی بە یەکەمین و دوایین وەسف کردوە ﴿ أَلَمْ نُهْلِكِ الْأَوَّلِينَ ۞ ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ الْآخِرِينَ ۞﴾ سورەتی مورسەلات/١٦-١٧.

هەڵبەت ئەوەی خودا خۆی پێ وەسف کردوە بەو جۆرەیە کە لە شکۆو تەواوێتی خۆیدا دەوەشێتەوە. هەروەها ئافەریدانیش (یەکەمین و دوایین) یان هەیە بەڵام بە گوێرەی حاڵ و توانابون و دەسەوسانی ئاتاجبونیانە.

<u>٣- خودا خۆی بە (تاك) وەسف کردوە:</u> ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ سورەتی بەقەرە/١٦٣، واتە: خواوەندتان یەك خوایە، هەروەها ئافەریدانیشی بە تاك وەسف کردوە ﴿يُسْقَىٰ بِمَاءٍ وَاحِدٍ﴾ سورەتی رەعد/٤.

<u>٤- خودا خۆی بە بێنیاز (الغنی) وەسف کردوە:</u> ﴿إِن تَكْفُرُوا أَنتُمْ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ سورەتی ئیبراهیم/٨، واتە: ئەگەر ئێوەو سەرجەم خەڵکانی سەر زەوی بێبڕوایی بکەن خودا بێنیازو ستایشکراوە.

﴿فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا وَّاسْتَغْنَى اللَّهُ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ سورەتی تەغابون/٦، واتە: بێبڕواییان کردو رویان وەرگێڕا خودا دەستبەرداریان بو، خودا بێنیازو ستایشکارە.

هەروەها هەندێ لە ئافەریدانیشی بە بێنیاز وەسف کردوە ﴿وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ﴾ سـورەتی نیسـاء/٦، ﴿إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾ سورەتی نور/٣٢، گەر هەژار بن خودا لە چاکی خۆی دەوڵەمەندیان دەکات.

ئەوەبو سیفەتە سەلبیەکان کە لە قورئاندا هەم خوداو هەم ئافەریدانیشی پێ وەسف کراوە. هەڵبەت ئەوەی خودای پێ وەسف کراوە شایەنی شـکۆو تـەواوێتی خۆیەتی. ئەوەی ئافەریدانی پێ وەسف کـراوە بـە گوێـرەی حـاڵو دەسەوسانیو تونابونو ئاتاجبونیانە.

## ساغکـردنەوەی ئەو وتانەی دەربارەی سیفەتە واتاییەکان دەکرێت

ئەو حەفت سیفەتەی ناویان ناوە سیفەتە واتاییەکان. لە راسـتیدا بریتـین لـە چۆنیـەتی سـیفەتمەندبون بـەو حـەفت واتایـە. کەلامناسـەکان کـە ئـەم حەفتـەیان ژماردوە بە پێی سەلماندنی ئـەوە بـوە پێـی دەڵێـن (الحال المعنويـة) پێیـان وایـە پێنـاوێکی سـەلماندنی نـە نـەبونیو نـە هـەبو نیـە. هەڵبـەت ئەمـە ئەفسـانەو پڕوپوچاتیە.

ژیریی ساغ پێناو بۆ شتو هاودژەکەی دانانێت. چونکە ئەو شتەی هەیە قەت نەبون نیە، ئەو شتەش نەبونە هەبون نیە، پێناویان نیە.

جا مادەم لە قورئاندا وەسفی خودا بە توانـاو زنـدوو ویسـتەرو ژنـەواو بینـاو قسەکەر کراوە، هەر لە قورئاندا ئافەریدانیش بەوانە وەسـف کـراون؛ کەواتـە نابـێ نەرێ لەو سیفەتانە بکەینو بڵێین خودا نیەتی.

یاخود بە هی ئافەریدانی بچوێنین، چونکـە ئـەم سـیفەتانەی هەیـەو شـایەنی شکۆو گەورەییو تەواوێتی خۆیەتیو هـی ئافـەریدانیش شـایەنی حـاڵو تونـابونو دەسەوسانیو ئاتاجبونی خۆیانە.

دەبێ بڕوامان پێ هەبێو لە وێچواندنیش خوا بە پاك راگرین.

# سیفەتە کردەییەکان

زۆر سیفەتی کردەیی لە قورئاندا هاتوە کە هەم خودای پێ وەسف کراوە هەم ئافەریدەش. بەڵام بێگومان ئەوەی خودای پێ وەسف کراوە زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەوەی ئافەریدەی پێ وەسف کراوە، جیاوازیان وەکو جیاوازی زاتی خوداو زاتی ئافەریدانە.

یەك لەو سیفەتانە: خودا خۆی بژێوییەخش و خاوەن هێزی پتەوە.

﴿مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ۞ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ۞﴾ سورەتی ذاریات/٣٩، واتە: ئەوەی ئێوە لە ڕێی خودا دەیبەخشن خودا بە چەند قات پاداشتی دەداتەوە خودا چاترین بژێوییەخشە.

﴿وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ سورەتی سەبەء/٣٩ واتە: بڵێ ئەوەی لە لای خودا هەیە لە یاری و بازرگانی چاکترە. خودا چاکترین بژێوییەخشە.

هەروەها ئافەریدانیشی بە سیفەتی بژێودەر وەسف کردوە:

﴿وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُولُوا الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُم مِّنْهُ﴾ سورەتی نیساء/٨، واتە: و ئەگەر خزم هێتیم و نەدارانیش ئامادەی دابەشبونەکە بون بە گوێرەی دڵ ئارامی میراتگرەکان میراتیان پێ بدەن.

﴿وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا﴾ سورەتی نیساء/٥.

﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٣٣.

بێگومان ئەو کردەیەی خودا خۆی پێ وەسف کردوە تەواو جیاوازە لەوەی ئافەریدانی پێ وەسف کردوە. جیاوازیان وەکو جیاوازی نێوان زاتی خوداو زاتی ئافەریدانە.

هەروەها خودا خۆی بە سیفەتی کردە کە مەبەستی ئیشە، وەسف کردوە:

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ﴾ سورەتی

یاسین/٧١، واته: مەگەر نەیاندیوە بە دەستەکانی خۆمان ولّساتمان بۆ ئەفراندون، ئەوان بونەتە خێوی.

ئافەریدانیشی بە سیفەتی کردە وەسف کردوە کە مەبەست لـە ئیشـە: ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ سورەتی طـور/١٦ واتـە: بـە گوێـرەی کردەوەکانتـان پاداشتو سزا وەردەگرن.

بێگومان ئەوەی ئافەریدەی پێ وەسف کراوە زۆر جیاوازە وەکو جیاوازی نێوان زاتی ئافەریدە لەگەلّ زاتی خوادا.

خودا خۆی بەوە وەسف کردوە کە ئافەریدەکانی فێر دەکات:

﴿الرَّحْمَٰنُ ۝ عَلَّمَ الْقُرْآنَ ۝ خَلَقَ الْإِنسَانَ ۝ عَلَّمَهُ الْبَيَانَ ۝﴾ سـورەتی رەحمـان/١-٤، واتـە: خـودای میـهرەبان بـەندەکانی فـێری قورئـان کـرد، مرۆڤـی ئەفراند، زمانی فێر کرد.

﴿اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ۝ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ۝ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝﴾ سورەتی عەلەق/٣-٥، واتە: بخوێنـەوە ئـەو خودایـەی فـێری خوێندنـەوەی کردی بەڕێزە، مرۆڤی فێر کردوە بە خامە بنوسێت کە پێشتر نەیدەزانی.

﴿وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا﴾ سـورەتی نیساء/١١٣، واتە: شتی وای فێر کردی نەتدەزانی، چاکەی خـودا بـۆ تـۆ گـەلێ زۆر بوە.

هەروەها هەندێ ئافەریدانیشی بە سیفەتی کردەیی فێرکردن وەسف کـردوە: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ سـورەتی جومعـە/٢، واتـە: خـودا لـە نـەخوێندەواران پێغەمبـەری نـاردوە ئایەتـەکانی خودایان بۆ دەخوێنێتـەوە، پاکیـان دەکاتـەوە قورئانو سوننەتیان فێر دەکات.

بۆ هەردوکیشیان دەفـەرموێ ﴿تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ﴾ سـورەتی مائیدە/٤، واتە: لەوەی خودا فێری کردون فێریان بکەن.

خودا خۆی بەوە وەسف کردوە هەوال رادەکەیەنێ، هەروەها ئافەریدانیشی بەوە وەسف کردوە، ئەم ئایەتە هەردو لای تێدایە ﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنْبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ﴾ سورەتی تەحریم/٣.

هەڵبەت ئەوەی خودا خۆی پێ وەسف کردوە تەواو جیاوازە لەوەی بەندەی پێ وەسف کراوە، وەکو جیاوازی نێوان زاتی ئافەریدگارو زاتی ئافەریدە.

خودا خۆی بە سیفەتی کردەی پێبەخشین وەسف کردوە. خودا دەفەرموێ: ﴿يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٦٩، واتە: حیکمەت بەو کەسە دەبەخشێ کە خۆی مەبەستیەتی.

﴿وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ﴾ سورەتی هود/٣، واتە: پایەی پایەداران دەبەخشێ.

هەروەها ئافەریدانیشی بەو کردەیە وەسف کردوە ﴿وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَارًا﴾ سورەتی نیساء/٢٠.

﴿وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً﴾ سورەتی نیساء/٤، واتە: مارەیی بدەنە ئافرەتان بە شادی دڵ.

بێگومان ئەوەی خودا خۆی بەم سیفەتە وەسف کردوە زۆر جیاوازی هەیە لەو وەسفەی ئافەریدەی پێ وەسف کراوە، وەکو جیاوازی نێوان زاتی خوداو زاتی ئافەریدەکەیە.

## سیفەتە کۆگرەکان

جا با بێینە سەر باسی سیفەتە کۆگرەکان، وەکو بەرزیو بڵندی، مەزنی، گەورەیی، مشورگێڕی، پاشایی، زاڵی، بەهێزی، هەر سیفەتێکی دی کە لە ریزی سیفەتە کۆگرەکان بێ.

خودا خۆی بە بەرزیو فیزمەندیو مـەزنێتی وەسف کردوە. لـە بـارەی خۆ وەسفکردنی بە بەرزیو مەزنی فەرمویەتی ﴿وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٥.

لە بارەی خۆ وەسفکردنی بە بەرزیو گەورەیی فەرمویـەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ سورەتی نیساء/٣٤، واتە: خـودا بـەرزی گەورەیـە. ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ﴾ سـورەتی رەعـد/٩، واتـە: خـودا زانیـاری جیـهانی بەرچاوەکیو پەنامەکیە، گەورەو بەرزە.

هەروەها هەندێ ئەفراویشی بەمەزن وەسـف کـردوە ﴿فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ﴾ سورەتی شوعەراء/٦٣، واتە: دەریا بو بە دو شەق هـەر شەقێکی وەك شاخێکی گەورەو مەزن بو.

﴿إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا﴾ سـورەتی ئیـسراء/٤٠، واتـە: ئێـوە وتەیـەکی مەزن دەبێژن.

﴿وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ﴾ سورەتی نەمل/٢٣، واتە: بارەگایەکی مەزنی هەیە.

هـەندێ ئـەفراوی بـە بـەرزو بڵنـد وەسـف کـردوە ﴿وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾ سورەتی مەریەم/٥٧، واتە: پایەیەکی بڵندمان پێبەخشی.

هـەندێ ئـەفراوی بـە گـەورە وەسـف کـردوە ﴿لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ سورەتی هود/١١، واتە لێبوردنو پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە.

﴿بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا﴾ سورەتی ئەنبیاء/٦٣، واتـە: بـەڵکو گەورەکـەیان وای کردوە.

هەڵبـەت ئـەو وەسـفەی خـودا بـۆ خـۆی فـەرموە وەکـو بـەرزیو گـەورەییو مەزنێتی تەواو جیاوازە لەو وەسفەی بـۆ ئـەفراوانی فـەرموە، جیاوازیەکـەێ وەکـو جیاوازی نێوان زاتی خوداو ئەفراوانە، چۆن زاتی خودا هیچ وێچوانێکی لەگەڵ زاتی ئەفراوان نیە، سیفەتەکانیشی هەروا.

خودا خۆی بە پادشا وەسف کردوە، دەفەرموێ: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ﴾ سورەتی جومعە/١، واتە: هەرچی لە ئاسمانان‌و زەوی دایە پاکی خودای پادشاو پیرۆزگار دەکات.

﴿فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ﴾ سورەتی قەمەر/٥٥.

هەروەها ئەفراوانیشی بە پاشا وەسف کردوە ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ إِنِّي أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ﴾ سورەتی یوسف/٤٣، واتە: پادشاکە گوتی لە خەودا حەفت چێڵی قەڵەوو قەبەم بینی.

﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ﴾ سورەتی یوسف/٥٠، واتە: پادشا گوتی یوسفم بۆ بێنن.

﴿وَكَانَ وَرَاءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾ سورەتی کەهف/٧٩.

﴿تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ﴾ سورەتی ئالی عیمران/٢٦.

بێگومان خودا خاوەنی مولکێکی راستەقینەی ئەوتۆیە لە شکۆو بێکەمایەسی خۆی بوەشێتەوە. هەروەها ئافەریدانیش خاوەنی مولکن بەڵام بە گوێرەی حاڵ‌و تونا بون‌و دەسەوسان‌و ئاتاجبونیان.

خودا خۆی بە باڵا دەستی فیزمەند وەسف کردوە ﴿الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ﴾ سورەتی حەشر/٢٣.

هەروەها هەندێ ئەفراویشی بە باڵادەستی فیزمەند وەسف کردوە:

﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾ سورەتی غافر/٣٥.

﴿وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ﴾ سورەتی شوعەراء/١٣٠.

﴿أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ سورەتی زومەر/٦٠.

﴿وَاسْتَفْتَحُوا وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾ سورەتی ئیراهیم/١٥.

بێگومان ئەوەی خودا خۆی بەم سیفەتانە وەسف کردوە تەواو جیاوازە لەگەڵ وەسفەکەی ئافەریدان، وەك جیاوازی نێوان زاتی خوداو زاتی ئافەریدانە.

خـودا خـۆی بـە عـيززەت وەسـف كـردوە، دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٢٠.

﴿أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ الْعَزِيزِ الْوَهَّابِ﴾سورەتی ص/٩..

هەروەها هەندێ لە ئافەریدانیشی بـە عـيززەت وەسف كـردوە ﴿قَالَتِ امْرَأَةُ الْعَزِيزِ﴾ سورەتی يوسف/٥١.

﴿وَعَزَّنِي فِي الْخِطَابِ﴾ سورەتی ص/٢٣.

بۆ هەردوكيشـيان لـەم ئايەتـەدا هـاتوە ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ سورەتی مونافيقون/٨، واتە: عيززەت بۆ خوداو پێغەمبەرو بڕوادارانە.

بێگومان ئەوەی خودا خۆی بەم سيفەتە وەسف كردوە تەواو جياوازە لەگەل وەسفەكەی ئافەريدان، وەك جياوازی نێوان زاتی خوداو زاتی ئافەريدان.

خودا خۆی بە بەهێز وەسف كردوە، دەفەرموێ: ﴿مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ۞ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ۞﴾ سورەتی ذاريات/٥٧-٥٨.

﴿وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ سورەتی حەج/٤٠.

هـەروەها هـەندێ لـە ئەفراوانيشـی بـە بـەهێز وەسـف كـردوە، دەفـەرموێ ﴿وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ﴾ سورەتی هود/٥٢.

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً﴾ سـورەتی روم/٥٤.

هەردو باريش لەم ئايەتەدا هاتوە: ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ سورەتی فوصيلەت/١٥.

## ئەو سیفەتانەی کەلامناسەکان لێی راجیاوازن

ئێستا لەبارەی ئەو سیفەتانە دەدوێین کە ئاخۆ سیفەتی کردەیین یا سیفەتی واتایین. لێکۆڵینەوەی تەواو ئەوەیە سیفەتی واتایی *(قائم بذات الله)*ن وەکو نەرمیو میهرو بەزەیی.

خودا خۆی بە نەرمندەو میهرەبان وەسف کردوە ﴿إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ سورەتی نەحل/٧.

هەروەها هەندێ لە ئافەریدانیشی بەو جۆرە وەسف کردوە، لە بارەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ سورەتی تەوبە/١٢٨.

خودا خۆی بەهێدیو لەسەرخۆ وەسف کردوە:

﴿لَيُدْخِلَنَّهُمْ مُدْخَلًا يَرْضَوْنَهُ وَإِنَّ اللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ﴾ سورەتی حەج/٥٩.

﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٣٥.

﴿قَوْلٌ مَعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِنْ صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَا أَذًى وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٦٣.

هەروەها هەندێ لە ئافەریدانیشی بە هێدیو لەسەرخۆ وەسف کردوە

﴿فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾ سورەتی صافات/١٠١.

﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾ سورەتی تەوبە/١١٤.

خودا خۆی بە لێبوردن وەسف کردوە: ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ سورەتی بەقەرە/١٧٣.

﴿فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٨٤.

هەروەها هەندێ لە ئافەریدانیشی بە لێبوردن وەسف کردوە ﴿وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ سورەتی شورا/٤٣.

﴿قَوْلٌ مَعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ﴾ سورەتی بەقەرە/٢٦٣.

﴿قُلْ لِلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ اللَّهِ﴾ سورەتی جاثیە/١٤.

هەڵبەت ئەو سیفەتانەی خودای پێ وەسف کراوە شایەنی تەواوێتیو شکۆی خودایە، نابێ لە ترسی وێچواندن نەرێی لیٚ بکرێ. هەروەها ئەوەی ئافەریدانی پێ وەسف کراوە لە حاڵو تونابونو دەسەوسانیو ئاتاجبونی ئافەریدان دەوەشێتەوە.

بە هەر حاڵ مرۆڤ نابێ سەرکێشی بکات لەو وەسفانەی خودا بۆ خۆی سەلماندوە، نابێ نەرێ لەو وەسفانە بکات کە خودا بۆ خۆی سەلماندوێتی، نابێ لە روی خوا وەرگەڕێتەوەو بڵێ ئەم وەسفانە لە خودا ناوەشێتەوەو نەرێیان لیٚ بکات ئینجا بە ئارەزوی خۆیو لە هەگبەی خۆی سیفەتان هەڵێنجێ.

ئەمە شێتیو سەرەڕۆ بونە. مەگەر ئەوانە وا بکەن کە ژیرییان سوا بێ.

ئێستاکە نمونەیەك دێنینەوە هەمو سیفەتەکانی دیش رون بکاتەوە، چونکە ئەوەی بۆ سیفەتێك دەوترێ بۆ ئەوانی دیش دەوترێ. دوپاتیشی دەکەینەوە سیفەتی هیچ ئافەریدەیەك بە هی خودا ناچێ.

## (ئیستیواء) ی خیدا بلا سەر بارەگاکەی

سیفەتی ئیستیواء دەمەوەریەکی زۆری تێدا کراوەو خەڵکانێکی زۆر بە فەلسەفەی ژیربێژیو بەڵگەی جەدەلی نەرێیان لیٚ کردوە و، هەقیان بە ناهەق دەرێناوەو ناهەقیش بە هەق. هەزاران کەس هەنو بانگەشەی ئیسلامیش دەکەن کەچی ئەم سیفەتەیان بە بەڵگەی بەناو ژیربێژی لە خوا بە مەحاڵ زانیوە.

بۆ وێنە دەڵێن: ئەگەر لەسەر عەرش ئیستیوای کردبێ ئەوا بە ئافەریدان دەچێ. لەبەر ئەوەی بە ئافەریدانیش ناچێ کەواتە لەسەر عەرش ئیستیوای نەکردوە.

هەڵبەت ئەم دەرەنجامە ناڕاستەو پێچەوانەی قورئانە. ئەم سیفەتە سیفەتێکی تەواوو شکۆمەندە، خودای ئەرزو ئاسمانان خۆی پێ ستایش کردوە،

الرَّحِيمُ ۞ الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الإِنسَانِ مِنْ طِينٍ ۞ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلالَةٍ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ ۞ ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِنْ رُوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ ۞﴾ سورەتی سوجده/٣-٩.

٧- شوێنی حەفتەم لە سورەتی (الحديد)ە: ﴿هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ۞ هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ۞﴾ سورەتی حەدید/٣-٤.

نەفامو نەزانان پێیان وایە ئەم سیفەتانە سیفەتی کەمایەسین کەچی بەم کارەیان لە روی وتەکانی خودای زەوی‌و حەفت ئاسمانان وەردەگەڕێنەوە، بۆیە سیفەتەکان ناسەلمێنن یان واتاوێری دەکەن.

کەچی خودای گەورە ئەم سیفەتانەی لە شوێنی وادا هێناوەتەوەو خۆی پێهەڵداوە مرۆڤ لە ئاستیدا دۆش دامێنێ بۆیە واتاوێر کردنی ئەم سیفەتانە، نەزانی و شێواویە.

***          * * *          ***

# چەند بنچینەیەکی گرنگ لە بارەی ناو و سیفەتەکانی خودا

چەند بنچینەیەکی گرنگو چەند خاڵێکی سەرەکی هەن، زانایان ئاماژەیان بۆ کردوەو باسیان کردوە، ئێمەش بە کورتیو پوختی لێرەدا دەیانهێنینەوە.

## بنچینەی یەکەم : ئەوەی بۆ هەندێ سیفەت دەگوترێ بۆ ئەوانی تریش دەگوترێ[٦٦]

ئەم بنچینەیە قسەو بۆ چونی چەندین چین ڕەت دەکاتەوە:

أ- ئەو کەسانەی هەندێك لە سیفەتەکانی وەکو ژیان وزانستو تواناو بیستنو دیتنو قسەو ویست بۆ خودا دەسەلمێننو بە سیفەتی ڕاستەقینەی دادەنێن، کەچی کێشمەکێشم لەسەر خۆشویستنو خۆشنودیو تورەبونو ڕك لێبونەوە دەکەنو دەڵێن ئەمانە بە مەجاز بەکار هاتون یاخۆ بە (ویست) یان بە (بەخشش)و (تۆڵە) لێکی دەدەنەوە.

بەو جۆرە کەسانە دەگوترێ ئەوەی سەلماندوتانەو ئەوەی نەرێتان لیٚ کردوە جیاوازیان نیە، ئەوەی لە بارەی یەکێکیان دەیڵێن بۆ ئەوانی تریش هەمان شتە.

ئەگەر بڵێن ژیانو زانستی خودا وەکو هی ئافەریدانێتی ئەوا دەبێ بۆ خۆشنودو خۆشویستنەکەشی هەروا بڵێن. وە ئەگەر بڵێن خودا ژیانو زانستو ویستی هەیەو شایەنی خۆیەتیو بە هی ئافەریدانی ناچێت ئەوا دەبێ بۆ خۆشنودو خۆشویستنو تورەییش هەمان شت بڵێن. ئەگەر بڵێن تورەیی بریتیە لە خرۆشانو وروژانی دڵ بۆ سەندنەوەی تۆڵە، بۆ ویستیش هەمان شت دەگوترێ بریتیە لە ئارەزو کردنی نەفس بۆ وەدەست هێنانی بەرژەوەندیەك یا لە خۆ لادانی زیانێك. ئەگەر بڵێن ویستی ئافەریدە وایە. دەڵێین: ئەوەی ئێوەیش دەیڵێن تورەبونی ئافەریدانە.

ب- ئەوانەی ناوەکان دەسەلمێننو نەرێ لە سیفەتەکان دەکەنو دەڵێن زندوی بێ ژیانە، زانای بێزانستە... تاد.

---

[٦٦] مجموع الفتاوى ١٧/٣.

بەوانە دەڵێین: جیاوازی لەنێوان سەلماندنی ناو و سەلماندنی سیفەتدا نیە. ئەگەر بە هەنجەتی ئەوەبێ سەلماندنی ژیانو زانستو تواناو ێچواندنو تەنداری لێ دەفامرێتەوە، چونکە تەنها (تەن) بە سیفەتان سیفەتمەند دەکرێن.

ئێمەش دەڵێین گەر وابێ، بۆ ناوەکانیش هەمان قسبە دەگوترێ، چونکە ناودارێك نیە زندوو زاناو توانا بێو (تەن) نەبێ.

جا ئەگەر بڵێین ئەم ناوانە شایەنی شکۆو تەواوێتی خودایە دەڵێین سیفەتەکانیش هەروایە.

ج- ئەوانەی نەرێیان لە ناوو سیفەتەکانی خودا کردوە، ئەوانە پێیان وایە ئەگەر نەرێ لە سیفەتەکان بکەن خودایان لەوە بەدور گرتوە کە بە بونەوەر بچوێندرێ.

پێیان دەڵێین، ئێوە نەرێتان لە سیفەتی ژیانو زانستی خودا کردوە، هەروەها نەرێتان لەوە کردوە زانا بێ یا زندو بێ... بە بیانوی وێنەچواندنی بە بونەوەران؛ کەچی ئەم قسەیە خودا بە (نەبونان) دەچوێنێ.

## بنچینەی دوەم[67]: ئەوەی بۆ زاتی خودا دەگوترێ بۆ سیفەتەکانیشی دەگوترێ.

زاتی پیرۆزی خودا بە زاتی هیچ ئافەریدەیەك ناچێ، هەروەها سیفەتو کردەکانیشی بە هی ئافەریدان ناچێت.

ئەوەی بروای هەبێ کە خودا هەقیقەتی هەیە، دەبێ بڕواشی بەوە هەبێ کە دەبێ خاوەنی سیفەتی تەواو بێو هیچ شتێك مانەندی نەبێت. دەبێ بڵێ: خودا بیستنو بینینو قسەی هەیەو هەقیقەتە بەڵام بە هی ئافەریدانیش ناچێ.

یەکێك گەر بڵێ من بۆیە بەرزەوەبونی خودا ناسەلمێنم نەخۆ بە ئافەریدانی بچوێنم، پێی دەڵێین: کەواتە بونو زاتی خوداش مەسەلمێنە، نەبادا بە بونو زاتی ئافەریدانی بچوێنی. گەر گوتی: نا.. خودا بونو زاتی هەیەو بە هی ئافەریدان ناچێ، پێی دەڵێین: کاکی برا! دابەزینو بەرزەوەبونیش هەروایە، تایبەت بە خۆیەتیو بە هی ئافەریدان ناچێ.

---

[67] الفتاوى- ٣/٢٥.

**بنچینەی سێیەم:** وەك یەك بونی ناو، مەرج نیە وابکات ناودارەکان وەکو یەك بن.

ئاشکرایە خوا پێی راگەیاندوین کە لە بەهەشتدا شیرو هەنگوینو ئەرەق هەیەو هەقیقەتن. ئەم هەقیقەتانە ئەگەرچی لەگەڵ ناوەکانی دنیا هەمان ناون. بەڵام جیاوازی خودی شتەکان نێوانی ئەرزو ئاسمانە. ئەوە لە نێوان دو شتی ئافەریدەکراو ئەو جیاوازیە هەیە، ئەدی لەنێوان ئافەریدگارو ئافەریدان؟ ئەوە بێ پایان.

هەر لێرە لەم جیهانەدا چەندین شت هەن هەمان ناویان هەیە کەچی لە چۆنیەتیو چیەتیدا جیاوازن وەکو بۆ نمونە دەڵێین: دەستی وشتر، دەستی مرۆڤ، دەستکی جانتا... هەر یەکەو دەستی تایبەتی خۆی هەیەو جیاوازن.

**بنچینەی چوارەم:** بە نەرێی یەکجارەکی وەسفی خودا ناکرێ:

خودای بەرزو یەکتا چەندین ناوو سیفەتی بۆ خۆی سەلماندوەو چەندیشی نەرێ لێکردوەو بۆ خۆی نەسەلماندوە.

سەلماندنو نەرێ کردنەکانیش موجمەلو موفەصصەلی هەیە.

سەلماندنی موجمەل بە ستایشی رەهاو سوپاسی رەهاو شکۆی رەهاو ئەوانە دەبێت، هەروەکو خودا لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کردوە ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، ﴿وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى﴾ سورەتی نەحل/٦٠.

تەفصیلی سەلماندنیش هەرچی ناوو سیفەتێك هەیەو لە قورئانو فەرمودەدا هاتوە دەیگرێتەوە.

نەرێ کردنی موجمەلیش بەوە دەکرێ هەرچی خەوشو کەمایەسیەو ناسازی تەواوێتیە نەسەلمێندرێ. وەکو دەفەرموێ ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ سورەتی شورا/١١، ﴿هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا﴾ سورەتی مەریەم/٦٥.

تەفصیلی نەسەلماندیش ئەوەیە لە یەکەیەکەی خەوشو کەمایەسیەکان پاکەوەر بکرێ، لە منداڵو باوكو هاوبەشو خێزانو هاوتاو نەزانینو دەسەوسانیو بۆرژانو نوستنو... تاد. پاکەوەر بکرێ.

ڕێوشوێنی قورئانی له نەرێکردندا ئەوەیه نەرێی یەکجارەکی ناکات. قورئان تەنها ئەو سیفەتە کەمایەسیانه نەرێ دەکات کە ستایشو تەواوێتی خودای تێدابێ. هەرگیز نەرێی یەکجارەکی ناکات وەکو هەندێ چینو کۆمەڵی لاڕێ دەیکەن[68].

که خودا دەفەرموێ ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا﴾ سورەتی بەقەرە/٢٥٥.

لێرەدا خودا نەرێی له بۆرژانو خەوتن کردوە، نەرێکردنەکەش تەواوی ژیانو ئاگایی تێدایه.

چونکه نه بۆرژان[69] و نەنوستن له تەواوێتی ژیاندا نیه.

که دەفەرموێ ﴿وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا﴾ واته: ماندو و گرانباری ناکات. هەروەها دەفەرموێ: ﴿لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ﴾ سورەتی سەبەء/٣، واته: گەردێك چیه، نه له ئاسمانو نه له زەویدا لێی بزر نابێ. نەرێکردنی بزرنەبون ئەوە دێنێته دی که به هەمو گەردێکی ئەرزو ئاسمان زانیار بێ.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ﴾ سورەتی ق/٣٨.

لێرەدا نەرێی له (اللغوب: ماندوێتیو شەکەتی) کردوە بەڵگەیه بۆ توانای تەواوو ئەوپەڕی بەهێزی.

---

[68] وەکو جەهمیه تۆخەکان/ تەماشای الفتاوی بکه ٣٩/٣.

[69] بۆرژان سەرەتایه بۆ نوستن.

هەورەها دەفەرموێ ﴿لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ﴾ سورەتی ئـەنعام/١٠٣، واتـە: بینایی نایگرێتە خۆ. ئەگەرچی لە ژیانەوەشدا دەبینرێ بەڵام لەبـەر مـەزنایی چـاو ناتوانێ بیگرێتە خۆ.

ئیـتر بـەم جـۆرە هـەرچی خـۆی بـۆ خـۆی نەسـەلماندوەو نـەرێی لێ کـردوە، سیفەتێکی سەلمێنراو دەچەسپێنێ کە خودای پێ ستایش بکرێ.

خودا هەرگیز نەرێیەکی یەکجاری لە سیفەتێك نەکردوە سیفەتێکی سەلمێنراو نەچەسپێنێ. لەمەوە دەردەکەوێت ئەوانەی پەنای زۆر دەبەنـە بـەر نەسـەلماندن‌و نەرێکردن (یان پێی دەڵێن السـلوب: سـەلبکردن) تـێ کـەوتون‌و هەڵـەی ناقۆڵایـان کردوە. چونکە نەرێکردن ئەگەر سەلماندنی تێدا نەبێ ستایش‌و تەواوێتی تێدا نیە. لەبەر ئەوەی نەرێی یەکجاری نەبونی یەکجاریە. نەبونی یەکجاریش هیچ نیە.

بیدعەکاران زۆر نەرێی یەکجاریان کردوەو دەڵێن: نابینێ‌و قسە ناکات، لە ژور جیهانەوە نیە. هێندێکی تر لەوەش تێپەڕیون‌و دەڵێن: خودا نە لـە نـاو جیهاندایـە نە لـە دەرەوەی دایـە. نـە لەگـەڵیدا تێکەڵـەو نـە لەگەڵیشـیدا جودایـە .... تـازۆر قسەی قرپۆکی تری لەم بابەتە کە هەر هەموی وا دەکات خودا ببێتە نەبون.

## بنچینەی پێنجەم[٧٠]: واژەی ناڕون ڕاست و ناڕاست هەڵـدەگرێ:

ئەو سـیفەتانەی لـە قورئـان‌و سـوننەتدا هـاتون ئەگـەر چـی لەواتاکانیشـیان نەگەین بەڵام دەبێ بڕوامان پێیان هەبێ.

بەڵام هەندێ واژەو دەستەواژە هەن لە قورئان‌و سـوننەتدا دەکـار نـەهاتون‌و خـەڵك کێشمەکێشـمی پـێ پـەیدا دەکـەن، ئێمـە تـا لـە واتاکانیـان ئاشـنا نـەبین‌و مەبەستی بێژەرەکە نەزانین؛ نەرێ‌و ئەرێی لێ ناڵێین.

بۆ نمونە ئەوانەی واژەی (الجهة: لا) بەکار دێنن‌و بۆ خوای ناسەلمێنن. پێیان دەڵێین: مەبەستتان لە (لا) چیە؟ گـەر مەبەسـتتان کەشکەشـەکانی ئاسمـان بـێ‌و ئاسمـان لـە خـۆی گرتبـێ، ئێمـەش دەڵێـین خـودا لـە جیهـەتدا نیـە. ئەگـەر مەبەستیشتان لە (الجهـة) ژورووی ئاسمانـەکان بـێ ئـەوا دەڵێـین ڕاسـتە، خـودا لـە ژورووی ئاسمانەکان‌و ئافەریدانیەتی.

---

[٧٠] الفتاوی- ٣/٤١.

(تحيّن)یش هەروەها، ئەگەر (لە ناو ئافەریدەدا بونیان) پێ مەبەست بێ ئـەوا ناڕاستەو ناهەقە، ئەگەر مەبەستیان لە ئافەریدان جودا بێ ئەوا هەق و راستە.

**بنچینەی شەشەم**: سەبارەتی یەکەمی لە کارخستن، بیروباوەڕی وێچواندنە :

شـێخ شـەنقیطي - بەهەشـتی بـێ - لـە رونکردنـەوەی ئـەم بابەتـەدا دەڵـێ: (ئازیزان! گوێ بدەنە ئامۆژگاری برای دڵسۆزتان، لاتان رون بێ ئەم نەگبەتیـە لـە ئەنجامی پیسی و گەردو گەماری وێچواندن پەیدا بوەو بە دڵ نوساوە. ئەو کەسەی دڵی بە چڵـك وژەنگـی دەردی وێچوانـدن دژون بـوە ئەگـەر سـیفەتێك ببیسـتێ کـە خودا خۆی پـێ سـتایش کردبـێ وەکـو: دابـەزینی بـۆ ئاسمـانی دنیـا لـە سـێیەکی پاشینی شەودا، یان بەرزەوەبونی بۆ سەر عەرش، یا هاتنی لە رۆژی ژیانـەوەدا یـا هەر سیفەتێکی دیکەی. ئەوا یەکەم شت بە زەینی ئەم داماوە دابێ وێچواندنی ئەم سیفەتەیە بـە سـیفەتی ئافـەریدان. ئیـتر چڵکـی وێچوانـدن دڵـی پیـس دەکـاتو ئەندازەی گەورەو مەزناتی خودا نازانێ چونکـە ئـەو هـەر زو وێچواندنـی لـە زەیـن هالاوە.

لە ئەنجامدا نەرێ لەم سیفەتە دەکـات بـە هەنجـەتی ئـەوەی بـە ئافـەریدانی دەچێت. کەواتە یەکەمجار خۆی دەباتە ریـزی وێچوێنـەرانو دوەمجـاریش لـە روی خوا هەڵ دەگەڕێتەوەو دەڵێ ئەم سیفەتە شایانی خوا نیە.

برایانم! بزانن لێرەدا بنچینەیەکی ئوصولی هەیەو هەر یەکێك ئەهلی عیلم بـێ جێبەجێی دەکات. ئەوەیەکە (پێغەمبەر ﷺ مافی ئەوەی نیە رونکردنەوە لە کـاتی پێویست دواتر بخات)[71] بە تایبەتی لە بیروباوەڕدا.

ئەگەر بە پێودانی گریمانە ناڕاسـتەکەی ئـەوان رواڵـەتی ئایەتـەکان بێـبڕوایی بێت. خۆ پێغەمبەرﷺ ئیستیوائی بە ئیستیلاء[72] راڤە نەکردوە.

ئەگـەر مەبەسـت راڤەکـە بوایـە ئـەوا پێغەمبـەرﷺ دەستپێشـخەری دەکـرد. چونکە مافی ئەوەی نیە رونکردنەوەی پێویست نەڵێ.

کەواتـە لەسـەر هـەمو موسـڵمانێك واجبـە بیروبـاوەڕێکی وای هـەبێ هـەمو وێچواندنێك هەڵبوێرێو پرسیارەکان بە تەواوی وەرام دەداتەوە. بە جۆرێك ئەگـەر

---

[71] النبي ﷺ لا يجوز في حقه تأخير البيان عن وقت الحاجة.

[72] دەست بەسەردا گرتن.

گوێبیستی وەسفێك بو ئافەریدگاری ئەرزو ئاسمانان بۆ خۆی فەرموبوی یا پێغەمبەرﷺ وەسفی کردبو، با یەکەم جار سینەی خۆی لەمەزنایەتی خودا پڕ بکات. لەوەش یەکلا بێتەوە کە ئەم وەسفانە ئەو پەڕی تەواوێتیو شکۆمەندیو بەرزێتیەو هەرگیز خەیاڵی وێچواندن هەڵناگرێ. ئەو کات دڵ پاكو خاوێن دەبێو خودا بەگەورە دەگرێو بە گەردو چڵکی وێچواندن دژون نابێ، زەمینەی دڵی بۆ بە راست زانینی ئەو سیفەتانەی خودا لە پەسندی خۆی فەرمونی یا پێغەمبەرﷺ لە ستایشی خوادا فەرمویەتی ساز دەبێ هەموش بە پێودانی ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ سورەتی شورا/١١، گەورەترین نەگبەتو کارەساتیش لەوە دایە لە دڵدا خودا بەگەورەو مەزن نەگرێو یەکەمین شت کە هوروژم بکاتە زەینی ئەوە بێ سیفەتی خودا بە هی ئافەریدان بچوێنێ. ئەو کات بابای داماو و کەساس بە ناچاری پەنا دەباتە بەر ئەو بانگەشە ناڕاستو قرپۆکانە.

## بنچینەی حەفتەم: ئەو ئایەتانەی لە بارەی سیفەتەکانی خودا دەدوێن موتەشابیهـ نین :

زۆر کەس پێیان وایە ئەو ئایەتانەی لە بارەی سیفەتەکانی خودا دەدوێن موتەشابیهن. رەنگە لەو روەوە راست بێ کە مالیکی پێشەوا —بەر میهری خودا بێ— دەڵێ: (بەرزەوەبون زانراوە، ئاوەز چۆنیەتیەکەی نازانێ. پرسیار لێکردنی بیدعەیە، بڕواپێبونی واجبە). ئەم وتە جوانە بۆ دابەزینو بۆ هەمو سیفەتەکانی تریش دەگوترێ... (دابەزین) زانراوە چۆنیەتیەکەی نەزانراوە، سۆراغکردنی بیدعەیە، بڕواپێبونی واجبە.

ئەم سیفەتانە لای عەرەبەکان زانراوو رون بوە، بەڵام ئەوەی خودای پێ وەسف کراوە تەواوترو مەزنترە، لەوە بەرزترە بە هی ئافەریدان بچوێندرێ..

بە هەر حاڵ... ئەگەر دڵ بە ژەنگو ژاری وێچواندن گەمار بکرێ کارەساتێکی تا بڵێی گەورەو ناقۆڵایە.

مرۆڤ کە گوێی لە سیفەتێکی پەروەردگار بێت، یەکەمین شت کە دەبێ بیروباوەڕی پێ بێ؛ ئەوە بێ کە ئەم سیفەتانە ئەو پەڕی تەواویو شکۆمەندییە، بەجۆرێك خەیاڵی وێچواندن قەت تەمتومانی لەسەر دروست نەکات. ئەو کات دڵ پاكو خاوێنو سازش دەبێ بۆ ئەوەی لەسەر بنچینەی پاکەوەری بڕوا بە

سیفەتەکانی خودا بێنێ. لەسەر شێوەی ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ سورەتی شورا/١١.

**بنچینەی هەشتەم:** ڕواڵەتی سیفەتەکان وێچواندن نیە تا پێویستی بە واتاوێری هەبێ:

بنچینەی ئوصولی وایە ئەگەر وتەیەك واتایەکی دەبەخشی‌و واتای تری هەڵنەدەگرت پێی دەڵێن (دەق) وەکو ئەم وتەیەی پەروەردگار ﴿تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾.

ئەگەر دو واتا یان زیاتری هەڵدەگرت؛ لە دو حاڵەتان بەدەر نیە، یا ئەوەتە واتایەکیان تاسەنگ دەبێ. یا هەردوکیان هاوسەنگ.

ئەگەر هاوسەنگ بون لە زاراوەدا پێی دەڵێن (موجمەل).

بۆ وێنە دەڵێن (عدا اللصوص البارحة علی عین زید: دوێنێ دزەکان بەسەر "عین"ی زەیدیان دادا) ڕەنگە (عەین) بە هەر یەك لەو سێ واتایە لێك بدرێتەوە: چاوی سەریان کوێر کردبێ. سەرچاوەیەکیان لێ پڕکردبێتەوە، گەنجینەی زێڕو زیویان لێ دزی بێ... ئەوەیە موجمەل.

حوکمی (موجمەل)یش ئەوەیە کە هەڵوەستەی لەبەردا بکەی تا ئەو کاتەی بەڵگەیەکی تەفصیلی بۆ دەبێ.

بەڵام ئەگەر دەقەکە ڕاشکاو بو ئەوا کاری پێ دەکرێ‌و فەرامۆش ناکرێ تا دەسەلمێ نەسخ بۆتەوە.

وە ئەگەر واتایەکیان تاسەنگ بو پێی دەڵێن (الظاهر: دیار) هەمبەرەکەش پێی دەڵێن (شێمانەی تاسوك:المحتمل المرجوح).

(دیار: الظاهر)یش دەبێ کاری پێ بکرێ تا ئەو کاتەی بەڵگەیەك دەبێ واتاکەی ڕابدات. گەر بڵێی (شێرێکم دیت) نمونەیەکی (دیار)ە، ڕەنگە مەبەستت گیانەوەرێکی دڕندە یا پیاوێکی ئازا بێت.

کەواتە لە ئایەتێکی وەکو ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾ یان هەر ئایەتێکی تری لەم جۆرە، ئایە ئەو ڕواڵەتەی یەکەوجار لەم سیفەتەوە دێتە مێشك ئەوەیە بە ئافەریدان دەچێ؟ تا پێویستی ئەوە بێ واتاوێر بکرێ؟.

یاخۆ ئەوەی یەکەوجار لە بیردا ئامادە دەبێ پاکەوەری پەروەردگاری ئـەرزو ئاسمانانە تا سیفەتەکە بە بیروباوەڕێکی پاکەوەر وەرگرین.
وەلآم ئەوەیە: لە هەمو سیفەتێکدا ئەوەی لە هزری هـەر موسـڵمانێك ئامادە دەبێ پاکەوەریەکی تەواوەو قەت بە ئافەریدان ناچێت.
داننـان بـەو رواڵەتـەی -کـە پاکـەوەریکردنی سـیفەتەکانی خودایـە لـە وێچواندن- شتێکی راسـتە. ئایـە هۆشمـەندان لاملـی لـەوە دەکـەن کـە لـە ئاست سیفەتەکانی خـوادا ئـەوەی یەکـەوجار ئامـادەی هـزری سـاغی موسـڵمانێك دەبـێ نەچواندنیەتی بە ئافەریدان؟... نا بەخوا کەس بـەرانگژی ئـەوە نابێتـەوە مەگـەر فیز بەرزێك!.

## بنچینەی نۆیەم: واتای راستەقینەی (تەئویل):

ئەو تەئویلەی ئافەریدانی پێ گرفتارو هەزاران کەسی پێ گومڕا بوە، بەسـێ واتا بەکار دێت:
١- دەرخسـتنی راسـتەقینەی شـتەکە بـە جـۆری دوەم. قورئـان کـە وشـەی تەئویل بەکار دێنێ. مەبەستی لەم جۆرەیە، وەکو دەفەرموێ:
﴿ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ سورەتی نیساء/٥٩.
﴿وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ﴾ سورەتی یونس/٣٩.
﴿يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِنْ قَبْلُ﴾ سورەتی ئەعراف/٥٣.
٢- تەئویل بە واتای تەفسیریش بـەکار دێت، ئیبنـو جـەریر زۆر جـاران ئـەم دەستەواژەی بەکار هێناوە: (القول في تأويل قوله تعالى... واتە تەفسیرەکەی بـەم جۆرەیە).
٣- لە زاراوەی ئوصولیەکاندا تەئویل بریتیە لە گەردانکردنی واتـای رواڵـەتی وشە بۆ واتایەکی دی بە بونی بەڵگەیەك، مەبەست لەوەیە وشەکە بەواتایەکی تری غەیری واتا رواڵەتیەکەی لێکدرێتەوە، ئەم لێکدانەوەیەش بەڵگەی خۆی هەبێ. جـا ئەم جۆرەیان لە لای ئوصولیەکاندا سێ حاڵەتی هەیە:
أ- بـەپێی بەڵگـەی قورئـانو سـوننەتی صـەحیح بـێ، ئـەم جـۆرە تەئویلـە راستو پەسەندەو مشتومڕی تێدا نیـە. بـۆ وێنـە پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ((الجـار أحـقّ بصقبـه)) رواڵـەتی ئـەم فەرمودەیـە (شـوفعە) بـۆ دراوسـێ

دەسەلمێنێ. جا ئەگەر مەبەستەکەی بکرێتە هاوبەشی بەشدار ئەوا بۆ ڕواڵەتێکی ڕێ تێچو حەواڵە نەکراوە، بەڵام ئەم فەرمودە صەحیحەی جابر دەگێڕێتەوە ((فإذا خربت الحدود الطرق فلا شفعة)) بەڵگەیە بۆ ئەوەی مەبەست لە دراوسێدا هاوبەشی بەشدارە ئەم جۆرە واژە گەردانیە کەواتاکەی لە ڕواڵەتی خۆی لەبەر بونی بەڵگەیەکی قورئانی یا سوننەتی صەحیح گەردان دەکات؛ پێی دەڵێن تەئویلی ڕاستو نزیك. ئەم جۆرە تەئویلە ئەگەر دەقێك پاڵپشتی بکات، بەربەستی نیە.

ب- بەپێی ئەو بروایەی کۆشیار پێی وایە بەڵگەیە کەچی لە ڕاستیشدا بەڵگە نیە، بەم جۆرەیان دەگوترێ تەئویلی دور، هەروەها پێشی دەگوترێ: تەئویلی فاسد. لەم بابەتەوە زاناکان تەئویلی ئیمام حەنەفی دێننەوە کە لەم فەرمودەیەدا بۆ وشەی (إمرأة)ی کردوە. فەرمودەکەش ئەمەیە: ((**ایما امرأة نکحت بغیر اذن ولیّها فنکاحها باطل**)). زاناکان دەڵێن: تایبەتکردنی ئەم فەرمودەیە بە بابەتی (المکاتبة)؛ تەئویلێکی دورە، چونکە کە دەفەرموێ (أي أمرأة) مەبەستێکی گشتی دەنوێنێ. هەروەها مەبەستە گشتیەکەشی بە (ما)ی زائیدەش تەئکید کراوەتەوە. کەواتە ئەم جۆرە واتاگەردانیەی کە بۆ بابەتێکی دەگمەنی وەکو (المکاتبة) کراوە بریتیە لە واتاوێرکردنی مانای ڕواڵەتی وشەکە بۆ واتایەکی تر بێئەوەی بەڵگەیەکی متمانە پێکراوی هەبێ.

ج- بەڵام واتا گەردانی بەبێ بەڵگە، ئەوا پێی ناڵێن تەئویل بەڵکو پێی دەڵێن یاری، چونکە یاریکردنە بە پەڕتوکی خوداو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ. بۆ نمونە تەفسیری ڕەوافیزەکان بۆ ئەم ئایەتە ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً﴾[٧٣] دەڵێن مەبەستی خاتو عائیشەیە.

نمونەی تر لەو بارەیەی کە ڕواڵەتی ئایەتیان بۆ واتای بێبەڵگەو لەخۆڕایی گەردان کردوە وشەی (إستوی)یە کە بە (أستولی) لێکیان داوەتەوە، بێگومان ئەوە پێی ناڵێن تەئویل چونکە هەرگیز بەڵگەی نیە. بەڵکو لە زاراوەی ئوصولیەکاندا پێی دەڵێن: یاریکردن. چونکە یاریکردنە بە پەڕتوکی خودا بێئەوەی بەڵگەی بۆ هەبێ.

---

[٧٣] لە میانەی سەرگوزشتەی پێغەمبەر موسایە لەگەڵ نەتەوەکەی، (خودا فەرمانتان پێ دەکات چێڵێك سەر بڕن).

ئەم جۆرە بەناو تەئویلە دروست نیە چونکە لە رو وەرگەڕانەوەیە لە وتەکانی خودا.

بنچینەیەکی ناسراو لە لای زانایانی پێشیندا هەیە دەڵێ: دروست نیە هیچ ئایەتو فەرمودەیەك لە رواڵەتە فامراوەکەی گەردان بکرێ.تەنها بە بەڵگەیەك نەبێ بکرێتە سەرچاوە.

## ڕاڕەوی یارانی ڕێباز و کۆمەڵ

ئیبنو تەیمیە بۆچونی ئەهلی سوننەو جەماعەی لەم بارەوە پوخت کردۆتەوەو دەڵێ: (بنەڕەتی ئەم بابەتە ئەوەیە: هەرچی خودا خۆی پێ وەسف کردوە، یان پێغەمبەرﷺ وەسفی کردوە، جا بە سەلماندن بێ یان نەرێ لێکردن بێ، بەو جۆرە وەسف دەکرێ کە ئەوەی خودا بۆ خۆی سەلماندوە دەسەلمێندرێو ئەوەش نەرێی لێکردوەو نەرێی لێ دەکرێ).

ئاشکرایە ڕێبازی پێشینانی نەتەوە بریتی بوە لە سەلماندنی سیفەتەکانی خودا بێئەوەی چۆنیەتساز یا مانەندساز یا واتاگۆڕ بکرێنو یا لەکار بخرێن[٧٤].

خودای گەورەش هەڕەشەی لێکردوین لەو ڕێبازە لا نەدەین کە لە قورئاندا لە بارەی ناوو سیفەتەکانیدا بڕیاری لەسەر داوە.

خودا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ﴾ واتە: خودا چەندین ناوی جوانو پیرۆزی هەیە، واز بێنە لەوانەی لارو وێری لەناوەکانی خودا دەکەن.

لە تانوپۆی زمانی عەرەبیدا (الإلحاد) بەواتای لادانە لە مەبەستو ئارەزو و ستەمو لاڕێبونە. ئەلحەدی گۆڕیش هەر لەوەوە هاتوە کە کەمێك بۆ لای روگە لاگۆڕ دەکرێ[٧٥].

---

ى العز

[٧٤] الفتاوى ٣/٣. زانایان زۆریان بڕیاریان لەسەر بیروباوەڕی پێشینانیان داوە لەوانە: موحەممەد بن موحەممەد بن أبی العز الحنفي لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (شرح العقيدة الطحاوية) أبو الحسن الأشعري لە پەرتوکەکەیدا بەناوی ( الإبانة في أصول الدين). صابونی لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (عقيدة السلف)زۆران زانای تریش. ئێمەش پەیڕەومان لەوانە کردوە کە لەسەر ڕەوازی ئەوان هەنگاومان هەڵێناوە. لە خوا دەخوازین لە ئاپۆرەی ئەواندا کۆمان بکاتەوە.

[٧٥] معارج القبول ١/٨٨.

خودا لەو وەسفانەی هاوبەشپەرستانی گومڕا بۆی دەکەن خۆی پاکەوەر دەکاتو دەفەرموێ:

﴿سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ سورەتی صافات/١٥٩.

﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ سورەتی صافات/١٨٠.

بەندە چاکەکارەکانی لەم گرفتارەیە ئاوارتە کردوەو دەفەرموێ ﴿إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾. لە ئایەتێکی تردا سڵاوی پێشکەشی پەیامبەران کردوە چونکە بە ساغو دروستی وەسفو وتەکانیان دەربڕیوە دەفەرموێ ﴿وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ﴾.

*** * * * ***

# خودا بەیەك ناسین[٧٦]:

خودا زاتێکی تاکی هەیە، هاوشێوەی نیە، بەرزترە لەوەی ژن و منداڵی هەبێت ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝ اللَّهُ الصَّمَدُ ۝ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ۝﴾ سورەتی ئیخلاص. واتە: بڵێ خودا تاکو تەنیایە، خودایەکی بێنیاز، لەکەس نەبوەو کەسیشی لێ نەبوەو هیچ هاوتاو هاوکوفێکی بۆ نیە.

خودا بە سیفەتە تەواوەکان سیفەتمەندە، هیچ ئەفراوێکی تەنانەت لە یەك سیفەتیشدا بەوی ناچێت ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ سورەتی شورا/١١ واتە: شتێك نیە بە خودا بچێت، خودا ژنەواو بینایە.

خودا خۆی بە تەنیا ئافەریدگارو بژێویدەرو ژیێنەرو مرێنەرو راگری ئەرزو ئاسمانەکانە، هیچ یەکێکیش نابێتە بڕوادار تا بە دڵنیاییەوە زانستێکی وای دەبێ تەنها خودا خاوەنی ئەم هەمو سیفەتانەیە.

## هێندەش بەس نیە

بەڵام تەنها خودا بەیەك ناسینێکی زانستیو دیدەوەری بەس نیە تا بەندەی پێ ببێتە بڕوادار، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ تەنها ئەویش بکاتە تاکە پەرستراوی خۆیو کەسی تری لەگەڵدا نەپەرستێ.

---

[٧٦] خودا بەیەك ناسینی راستەقینە ئەم جۆرەیە کە لە زات و سیفەتەکانیدا باوەڕی بە تاکێتی خودا هەبێ و پاشان تەنها ئەو بپەرستێ و کەسی تری لەگەڵدا نەکاتە هاوبەش.

بەڵام ئەم فامەیان گۆڕی/ کەسانێك هەبون دەیانگوت خودا بەیەك ناسین ئەوەیە نەرێ لە سیفەتەکانی خودا بکرێ. چونکە پێیان وایە دەروەستی فرە ولجبان دەبن.

هەندێ لە سۆفیەکانیش دەیانگوت ئەم جۆرە خودا بەیەك ناسینەی ئێمە باسی لێوە دەکەین، وەك هی خەڵکی رەمەکی نیە، بەڵام خوا بەیەك ناسینی تایبەتەکان بە هەقیقەتەکان دەسەلمێت. هەروەها دەیانگوت خودا بەیەك ناسینی تایبەتی تایبەتانیش هەیە.

بۆچي؟

چونکە خودایەك ئافەریدگارو بژێویدەرو بەخشندەو مرینەرو ژیێنەرو خاوەن هەمو سیفەتێکی تەواو بێتو هیچ کەمایەسیەکی نەبێ، هەر ئەو خودایە شایەنی پەرستنەو بێ لەوی هەرچی هەیە ئاتاجی پەورەردگارو خودایەو زیانو قازانجی لە دەست نیە.

کەواتە چۆن غەیری خودا دەپەرسترێ؟

## نەسازیەکی سەیر

بێبڕواکانی هاوبەش پەرستانی عەرەبو زۆر کەسو نەتەوەی تریش باوەڕیان بە تاکێتی خودا هەبو هەر ئەو ئافەریدگارو پەیداکەرە، تەنیا ئەو بژێویبەخشو مرینەرو ژیێنەرو پاشایە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بێ لەویان دەپەرستو رویان لە شتی تر دەکرد، بێ گومان ئەوەش نەسازیەکی بێ رەزاو رموزنە.

چونکە ئەوەی بە تەنیا ئافەریدە دەکاتو دێنێتە بون، ئەو شایەنی پەرستنو دڵ بۆ کەچ کردنو گەورە کردنە.

قورئانی پیرۆزیش لەو بارەوە زۆری لەگەڵ هاوبەشپەرستەکان فەرموەو ئەو نەسازیەی بۆ رون کردونەتەوە کە تەنها خودا خاوەنی ئافەریدە کردنو بژێویدەرە... تاد. دەبێ ئەویش بە تەنها بپەرستنو دینداری تەنها بۆ ئەو ئەنجام بدەن.

## واژەی خودا بەیەك ناسین

(لا إله إلا الله) واژەی خودا بەیەکناسینە، بڕوا کۆدەکاتەوەو لە خۆی دەگرێ. ئەم واژەیە ناونیشانو بنچینەی ئیسلامە.

### واتاکەی:

واتای ئەوەیە هیچ پەرستراوێك نیە شایەنی پەرستن بێ تەنها خودای بەرزو پاك نەبێ. ئەوەی بەو جۆرەشی راڤە کردوە دەڵێ هیچ بونێك نیە تەنها خودا نەبێ. هەڵەیەکی ناقوڵای کردوە، چونکە (إله) واتای پەرستراوە بەپێی لێکدانەوەی ئەوان واتاکەی وای لێ دێ: هیچ پەرستراوێکی هەبو نیە تەنها خودا نەبێ، ئەوەشیان راست نیە لەبەر ئەوەی وا دەگەیەنێ هەرچی پەرستراوی هەقو ناهەقە خودایەو،

ئەوەی هاوبەشپەرستەکان دەیپەرستن وەکو رۆژو مانگو ئەستێرە.. تا دوایی خودایە. بەم پێیە بۆ هەرچی پەرستراو بۆ خودا بوە، ئەمەش گەندەڵترین پرۆپوچیە.

بەڵام واتای راستو تەواو ئەوەیە یەکەمجار باسمان کرد هیچ پەرستراوێك نیە شایەنی پەرستن بێ تەنها خودا.

## پلەو پاداشتی ئەم واژەیە

پێشو یادی ئەم دەقانەمان کردوە کە ئەوەی لە ناخی دڵەوە بە دڵسۆزیەوە بڵێ (لا إله إلا الله) ئەوا دەچێتە بەهەشت. هەروەها بەم واژەیە ماڵو خوێنی هەر کەسێك دەپارێزێو دەبێتە موسوڵمان.

## مەرجەکانی

مەبەست لەو واژەیە تەنها وتن نیە، چونکە بە حەفت مەرج نەبێ ئەم واژەیە سودی نابێ.

### ١- زانینی واتاکەی :

خودا دەفەرموێ ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ﴾ سورەتی موحەممەد/١٩، واتە: بزانە هیچ پەرستراوێك نیە تەنها خودا نەبێ.

﴿إِلَّا مَنْ شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ سورەتی زوخروف/٨٦، واتە: مەگەر ئەوانەی بە هەق گەواهی دابێ، ئەوان دەیزانن.

لە صەحیحی بوخاریشدا هاتوە عوسمانی کوڕی عەففان خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**من مات وهو يعلم أنه لا إله إلا الله دخل الجنة**)) واتە: ئەوەی بمرێو زانیبێتی هیچ پەرستراوێك نیە تەنها خودا نەبێ، دەچێتە بەهەشت.

### ٢- ئاوەر و دڵنیایی:

ئەو کەسەی ئەم وتەیە دەبێژێ دەبێ ئاوەرو دڵنیاییەکی تێری هەبێو هیچ گومانێکی تێدا نەبێ.

خـوا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا﴾ سورەتی حوجورات/١٥، واتە: بڕواداران ئەوانەن بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەکەی هێناوەو دو دڵییان نیە. لەم ئایەتەدا خودا دو دڵنـەبونو گوماننـەکردنی بـە مـەرج داناوە.

لە صەحیحی بوخاریشدا هاتوە، ئـەبا هورەیـرە خـوا لێـی ڕازی بێـت دەڵـێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی ((**أشهد أن لا إله إلا الله، وأني رسول الله، لا يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما فيحجب عن الجنة**)) واتە: یـەکێك بـە دڵ بڵـێ (لا إله إلا الله محمد رسول الله)و دو دڵی نەبێ، خودا لە بەهەشتی بێبەش ناکات.

دیسان هەر لە صەحیحی بوخاریدا هـاتوە پێغەمبـەر ﷺ هـەردو کەوشـەکەی دایە ئەبا هورەیرەو پێی گوت: ((**من لقيت وراء هذا الحائط يشهد أن لا إله إلا الله مستيقناً بها قلبه فبشره بالجنة**)) واتە: هەرکەسێکت لە پشت ئـەم دیـوارە دیتو بە ئاوەری دڵی خۆی شـایەدی بـە (لا إله إلا الله) دەدا، مـوژدەی بەهەشـتی پێ بدە.

لەم فەرمودانەشدا دو دڵنەبونو دڵنیابونی بە مەرج داناوە. جـا ئەگـەر مـەرج نەیەتەدی مەرجداریش نایەتەدی.

## ٣- بە دڵ و بە زمان داخوازیەکانی ئەم واژەیە وەرگری:

قورئان باسی کردوە خودا ئەو نەتەوە بێبڕوایانەی سزا داوە کە ئەم واژەیـان ڕەت کردۆتەوەو فیزبەرزیان لە ئاستدا نوانـدوە ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ۞ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَجْنُونٍ ۞﴾ سـورەتی صافات/٣٥-٣٦، واتە: ئەگەر پێیان بگوترابا (لا إله إلا الله) فـیز بـەرزیان دەکـرد. هەورەها دەیانگوت: ئێمە خوایەکانی خۆمان لەبەر شاعیرێکی شێت واز بهێنین.

لەم ئایەتەدا هۆی سزادانەکەی دیار کردوە کە فیز بـەرزیان لـە ئاسـت وتـەی (لا إله إلا الله) نواندوەو هەناردراویان بە درۆ زانیوە.

٤- ئەژنەوابون و ملکەچبون:

﴿وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ﴾ سورەتی زومەر/٥٤، واتە: بۆ لای پەروەردگارتان ژیوان ببنەوەو دەستی بۆ لە سنگ بدەن.

﴿وَمَنْ يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى﴾ سورەتی لوقمان/٢٢، واتە: ئەوەی ئەژنەواو ملکەچی خودا بێو خوابەیەکناس بێ ئەوا خۆی بە ڕێسمانی پتەو گرتوە کە (لا إله إلا الله)یە.

لە فەرمودەیەکی صەحیح[٧٧] هاتوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی ((**لا یؤمن احدکم حتی یکون هواه تبعاً لما جئت به**)) واتە: کەستان بڕواتان تەواو نابێ تا ویستو ئارەزوتان شوێنکەوتەی ئیسلام دەبێ.

٥- بەڕاست زانین:

کە واژەکە دەردەبڕێ، دەبێ لە دڵەوە بەڕاستی بزانێو دڵو زاری یەك بێ خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ﴾ سورەتی بەقەرە/٨، واتە: هەندێ کەس هەن دەڵێن بڕوامان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هێناوە کەچی بڕواداریش نین.

ئەو جۆرە کەسانە درۆ دەکەن، ئەوەی دەیڵێن زۆر جودایە لەگەڵ دڵیان.

لە هەردو صەحیحاندا هاتوە موعاذی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێت لە پێغەمبەر ﷺی گێڕاوەتەوە فەرمویەتی: ((**ما من أحد یشهد أن لا إله إلا الله، وأن محمداً عبده ورسوله صدقاً من قلبه إلا حرمه الله علی النار**)).

واتە: هەر یەکێك شایەتی بدا بە (لا إله إلا الله محمد عبده ورسوله)و لە دڵەوە بەڕاستی بزانێ ئەوا خودا دۆزەخی لێ بێبەش دەکات، لێرەدا ئەم واژەیە بەندەی پێ لە دۆزەخ ڕزگار دەکات بە مەرجێك لە دڵەوە بەڕاستی بزانێ.

---

[٧٧] مشتومڕێکی زۆر لە بارەی فەرمودایەتی و پلەی ئەم فەرمودەیە هەیە. بگەڕێوە بۆ (جامع العلوم والحکم)ی ئیبنو ڕەجەبی حەنبەلی. وەرگێڕ

٦- پاك و دڵسۆزی:

ئەوەیە كردەوەكانی لە هەمو خڵتەو خاڵێكی هاوبەشپەرستی پـاك بكاتـەوەو تـەواو تـەواو بـۆ خـودای بـێ. ﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ﴾ سـورەتی زومـەر/٣، واتـە: ئاگادار بن دینداری پاك بـۆ خودایـە ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ سـورەتی بەیینـە/٥، واتـە: فـەرمانیان پـێ نـەكرابو بـەوە نـەبێ خـودا بپەرسـتنو دینداری بۆ ئەو بكەن.

لە صەحیحی بوخاریشدا هاتوە ئەبا هورەیرە خوا لێی رازی بێت لە پێغەمبەر ﷺی گێڕاوەتەوە ((**أسعد الناس بشفاعتي من قال لا إله إلا الله خالصاً من قلبه ونفسه**)) واتە بەختەوەرترین كەس ئەو كەسەیە لە دڵو نەفسەوە بە پـاكی بڵێ (لا إله إلا الله).

هەر لە صەحیحی بوخاریشدا عوسمانی كوڕی مـالیك خـوا لێـی رازی بێـت لـە پێغەمبـەر ﷺی گێڕاوەتـەوە ((**إن الله حـرم علـى النـار مـن قـال لا إلـه إلا الله يبتغي بذلك وجه الله ﷻ**)) واتە: ئەوەی لە پێناو روی پەوەردگاری بڵـێ (لا إله إلا الله) خودا دۆزەخی لێ بێبەش دەكات.

٧- دەبێ واژەی خوابەیەكناسی خۆشبوێ و ئەو كارانەشی خۆشبوێ:

ئەم واژەیە دەیخـوازێ. هـەروەها پـەیڕەوكارانی ئـەم واژەیەشـی خۆشـبوێ. ركی لەوشتانەش ببێتەوە پێچەوانەو ناسازە لەگەڵ ئـەم واژەیـەدا. خـودای بـەرزو شكۆمەند دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ سورەتی بەقەرە/١٦٥، واتە: هەندێ خەڵك هەن جگـە لـە خـودا چـەند هاوتایـەك دادەنێـنو وەكـو خـودا خۆشـیان دەوێـن، بـەڵام بـڕواداران خودایان خۆشتر دەوێت.

ئەم ئایەتە رایگەیاندوە بڕواداران خودایان خۆشتر دەوێ بۆیـە هاوبەشـی بـۆ بڕیار نادەن. نیشانەی خۆشویستنی خودا ئەوەیە ئەو شتانە پێشبخات ئەگەر چـی لەگەڵ ئارەزوشی تەكولۆ بێـت، هـە..ەها ركی لـەو شـتانەش بـێ كـە خـودا ركـی لێدەبێتەوە ئەگەرچی ئارەزوشی هەڵپەی بۆ دەكرد. هـەروەها دژایـەتی دوژمنـانی

خودا بکات و، پەیڕەو لە ڕێوشوێنی پێغەمبەر ﷺ بکـاتو ڕێنوێنیـەکانی لـە ئـامێز بگرێ.

## ئاماژەی پێشینان بۆ هەندێ لەم مەرجانە

کە فورەزدەقی شاعیری ناودار ژنەکەی ئەسپەردەی خـاك دەکـرد، حەسـەنی بەسرایی پێی گوت: چت بۆ ڕۆژێکی ئاوەها ئامادە کردوە؟ گوتـی شـایەدی (لاإله إلا الله محمد رسول الله)ی حەفتا ساڵان. حەسەن گوتی: زۆر چاکە. بەڵام (لا إله إلا الله) زۆر مەرجی هەیە، بۆیە ئاگادار بە قەت بوختان بە ژنی بێتاوان نەکەی.

جارێك بە حەسەنی بەسراییان گوت: هەندێ خەڵك هــەن دەڵێـن ئـەوەی بڵـێ (لا إله إلا الله) دەچێتە بەهەشت. گوتی: بەڵێ ئـەوەی بڵـێ (لا إله إلا الله)و مـافـو فەرزەکانی جێبەجێ بکات دەچێتە بەهەشت.

لە وەهبی کوڕی مونەببیهیان پرسی: ئـەدی کلیلـی بەهەشـت (لا إله إلا الله) نیە؟ گوتی: بەڵێ بەڵام هەمو کلیلێك ددانی هەیە جا ئەگەر کلیلێکی بە ددانت هێنا دەرگاکەی پێ دەکەیەوە، ئەگینا پێت ناکرێ بیکەیەوە.

## پێناسەی پەرستن

خودابەیەکناسین بە دو فرمانان نەبێ نایەتە دی:

یەکەم: شایەدی دان بە تاکێتی خودا لە زاتو سیفەتەکانیدا.

دوەم: پێمەبەستبونی خودا لە هەمو پەرستنەکاندا.

پەرسـتن نـاوێکی سـەرجەمیە، هـەمو ئـەو وتـەو کـردەوە دیــارو دەرونیانــە دەگرێتەوە کە خودا خۆشیدەوێنو پێیان خۆشنودە. دیارەکان وەکو وتنی وشەی شــادەو نوێــژو ڕۆژو، دەرونیــەکانیش وەکــو بــڕوا بــون بــە خــوداو فریشــتەو پێغەمبەرانو ترسو تەما.

# پەرستنی راستەقینە

پەرستنی راستەقینە ئەوەیە پەرستکار لەگەڵ خۆشویستن و ترسان لە خوداو، پاڕانەوەو تەمای بەزەیی خودا تێکەڵ بێ.

پەرستکار ئەگەر ئەنگێزەی پەرستنەکانی ترس و خۆشەویستی و تەما نەبێ، ئەوا تەنها چەند جولەو بزاوتێکی بێ ناوەڕۆك ئەنجام دەدات و هیچ مانای لە لادا ناگەیەنێ.

پەرستکارێکیش خۆشەویستی هەبێ بەڵام خۆ بە کەمگرتن و ترس و تەمای نەبێ ئەوا بە زۆری وای لێ دێ توشی گوناهو تاوان ببێ و دەگاتە رادەیەك بڵێ خودام خۆشدەوێت و گوناهانیش ئەنجام بدات.

پێشان (گەل)ێك هەبو بانگەشەی ئەوەیان دەکرد خودایان خۆشدەوێت و کردەوەشیان ئەنجام نەدەدا. خودا بەم فەرمودەیە تاقیکردنەوە ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ سورەتی آل عمران/٣١، واتە: ئەی پەیامبەر پێیان بڵێ: ئەگەر راست دەکەن خوداتان خۆش دەوێ ئەوا پەیڕەو لە رێبازی من بکەن. کەواتە ئەوەی بانگەشەی خۆشویستنی خودا بکات و شوێن رێبازی پێغەمبەرەکەی نەکەوێت ئەوا درۆ دەکات.

شافیعی پێشەوا -بەرمیهری خودا بێ- دەڵێ: (گەر پیاوێکتان دیت لەسەر ئاو دەڕۆیشت و لە هەوادا دەفڕی، پێی بڕوا مەکەن تا لەوە دڵنیا دەبن پەیڕەو لە رێبازی پێغەمبەر ﷺ دەکات).

(تەما)ش هەروا، بە تەنیاو بەبێئەوەی ترسی خودای لەگەڵدا بێ خاوەنەکەی لە گوناهان ناسەنگرێنێتەوەو لە سزای خودا بێباك دەبێ ﴿فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ﴾ سورەتی ئەعراف/٩٩، واتە: کەس لە پیلانی خودا بێ خەم نیە مەگەر دۆڕاوەکان.

ترسیش ئەگەر هاوبەندی (تەما) نەبێ ئەوا پەرستکار توشی بەدگومانی و بێهومێدی دەبێ. خودا دەفەرموێ ﴿إِنَّهُ لَا يَيْأَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾ سورەتی یوسف/٨٧، واتە: هیچ کەسێك لە میهرەبانی خودا هیوا بڕ نابێت مەگەر بێبڕواکان.

پەرستنی راستەقینە ئەوەیە کە خاوەنەکەی لە نێوان ترس‌و تەمادا بێ ﴿وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ﴾ سورەتی ئیسراء/٥٧، واتە: تەمایان بە میهری خودا هەیەو لە سزاو ئەشکەنجەکەی دەترسن.

﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ﴾ سورەتی زومەر/٩، واتە: ئایە ئەو کەسە باشتر نیە کە لە هەناوی شەودا سوژدە دەباو رادەوەستێ، لە سزای خودا دەترسێ‌و بە هیوای بەزەیی پەروەردگارە؟.

لە نێوان تامەزرۆگاری‌و ترسگاریدا بێ. هەروەك خودا لە بارەی خانەوادەی زەکەریا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾ سورەتی ئەنبیاء/٩٠، واتە: لە چاکەکردندا پەلەپروزێیان دەکرد، بە ترس‌و تەما لێمان دەپارانەوە، هەروەها دەترسان‌و سەرکز بون.

بەندەی چاکەکار دەمێك تەماو پەرۆشەکەی وای کەمەند کێش دەکات ئەوەتە بەرەو خودا پەرواز ناکات. دەمیش هەیە ترسی خودا وا دەیگرێ ئەوەتە ناتوێتەوە. بۆ خۆشنودی خودا ماندوەو کردوکۆش دەکات، لە ترسی سزاکانیش پشت لە گوناهان دەکات. خۆی بە خودا پەنا دەگرێ لە سزاکانی‌و، تەمای هەیە بە بەخششەکانی.

## پایەکانی پەرستن

### پەرستن سێ پایەی هەیە :

### **یەکەم:** پاك و دڵسۆزی:

ئەوەیە بەندە لە پێناو روی پەروەردگارو جیهانی ژیانەوە کردەوەکانی ئەنجام بدات. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امرئ ما نوى، فمن كانت هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى الله ورسوله، ومن كانت هجرته الى دنيا يصيبها، أو امرأة ينكحها فهجرته الى ما هاجر إليه**)) واتە: کردەوە بە پێی نیازە، هەر کەسێك نیازی چ بێ ئەوی بۆ هەیە، جا ئەوەی لە پێناو خوداو پێغەمبەرەکەی کۆچی کردبێ ئەوا کۆچەکەی بۆ خوداو

پێغەمبەرەو، ئەوەی بۆ دنیا یا بۆ مارەکردنی ئافرەتێك کۆچی کردوە، کۆچەکەی بۆ ئەوەیە کە بۆی هاتوە. بوخاریو موسلیم گێڕاویانەوە.
- نەبونی پاکیو دڵسۆزی؛ پەرستن دەپوچێنێتەوە.

## دوەم: راستکردن:

مەبەستمان لەوەیە لەو شتەی بە تەما بێ بیکات راست بکاتو لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوداو خۆپاراستن لە گوناهان ماندو ببێ کەمتەرخەمیو خەمساردی نەنوێنێو دەستسارد نەبێ، ئامادەیی وەرگری بۆ راوەستان لە پێش خودای گەورە.

## سێیەم: شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ:

بە پێی شەریعەتی خوداو راگەیاندنەکانی پێغەمبەر ﷺ خودا بپەرستێ. ئەو خەڵکەش کە بەبێ زانیاری خودا دەپەرستن ئەوا بیدعەیەکەو پێغەمبەر ﷺ چاوترسای کردوین توخنی نەکەوینو بکەرەکەی سەرکۆنە کردوەو بە گومڕایی هەژمێری کردوە **((کل محدثة بدعة، وکل بدعة ضلالة، وکل ضلالة في النار))** واتە: هەمو زیادکراوێك لە دیندا بیدعەیە هەمو بیدعەیەکیش گومڕاییە، هەمو گومڕاییەکیش بۆ ئاگرە.

بیدعەکاریش کردەوەکانی رەت دەکرێتەوەو هیچی لێ وەرناگیرێ، لە هەردو صەحیحاندا هاتوە خاتو عائیشە خودا لێی رازی بێت- دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: **((من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو ردٌّ))** واتە: ئەوەی شتێك لە دین زیاد بکات ئەم شتەش لە دیندا نەبێ رەت دەکرێتەوە. لە گێڕانەوەی موسلیمدا دەڵێ: **((من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو ردٌّ))** واتە: ئەوەی کردەیەك بکاتو لەسەر رێبازی ئێمە نەبێ ئەوا رەت دەکرێتەوە.

## پەرستن بەبێ ئەم پایانە ناکرێ

ئەگەر عەزیمەیەکی راست نەبێ ئەوا پەرستن بونی نابێ، چونکە ئەو کات تەنها دەبێتە خۆزگەو بریاو ئەستەمە بیکات تا ویستەکەی خامۆش دەبێو دەپوکێتەوە. ئەگەر پاکیو دڵسۆزیو شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺیشی لەگەڵدا نەبێ ئەوا خودای بەرزو بێهاوتا وەریناگرێ.

## ئەو پەرستنانەی نابێ بێ لە خوای پێ مەبەست بێ

ئەو پەرستنانەی دروست نیە غەیری خوای پێ مەبەست بێ چەند جۆرێکن.

### **یەکەم:** پەرستنە بیروباوەڕیەکان :

ئەوەیان بنچینەی هەمو پەرستنەکانە، بریتیە لەوەی بەندە بیروباوەڕی وابێ خودا (ﷻ) پەروەردگاری تاکو یەکتایەو ئافەریدەکردنو فەرمان هەر بۆ ئەوە، زیانو قازانجو بە دەست ئەوە، هیچ هاوبەشێکی نیە، بەبێ ودمی خۆی هیچ کەس تکای لە لادا ناکات. بێ لەوی پەرستراوی دیکەی راستو بەهەق نیە.

### **دوەم:** کردەی نێو دڵ :

پەرستنی نێو دڵ نابێ بێ لە خوای پێ مەبەست بێو بۆ غەیری خودا ئەنجام بدرێ چونکە هاوبەشپەرستییێکی گەورەیە، وەکو ترسو تەما، ترسو تامەزرۆگاری، دڵکزیو باکمەندی، خۆشویستن، پشتیوانخوازی، دڵکەچ بون.

### **سێیەم:** قسەیی :

وەکو وتنی واژەی شادە؛ هێندە بەس نیە تەنها باوەڕی بە واتاکەی هەبێ، بەڵکو دەبێ بە زمانیش دەری ببڕێ. هەروەها پەنا گرتن بە خودا، یارمەتخوازیو هانا وەبەر بردن، پاڕانەوە، پاکی کردن، شکۆمەند کردن، خوێندنەوەی قورئان.

### **چوارەم:** جەستەیی:

وەکو: نوێژ، رۆژی، حەج کردن، سەربڕین، نەزرو شتی تر.

### **پێنجەم:** دارایی:

وەکو: زەکات، بەخشین، گوناهپۆشی، قوربانی، مەسروفکێشانی ماڵو منداڵ.

# هاوبەشپەرستیی

هاوبەشپەرستیی پێچەوانەی خوا بەیەکناسین و هاودژیەتی. ئەگەر یەکێك ببێتە هاوبەشی یەکێکی تر عارەب دەڵێن: (*شرکته في الأمر*: لە کارەکەدا کردمە هاوبەش). خودا لەسەر زاری موسا دەفەرموێ: ﴿وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي﴾ سورەتی طاها/٣٢، لەم کارەدا -پێغەمبەرایەتی- هارونیش بکە هاوبەشم.

## هاوبەشپەرستی دو جۆری هەیە:

لە زاراوەی شەریعەتی ئیسلامدا هاوبەشپەرستی دو جۆری هەیە:

### یەکەم: هاوبەشپەرستی گەورە :

ئەو هاوبەشپەرستەی هاوبەشپەرستی گەورە ئەنجام دەدات ئەوەیە لەگەڵ خودا پەروەردگارێکی تر بڕیار دەدات وەکو هاوبەشپەرستی دیانەکان کە خودایان کردۆتە سێیەمی سێهەمان، یان وەکو هاوبەشپەرستی ئاگرپەرستەکان کە روداوی خێروبێریان بۆ روناکی دەگەڕاندەوەو روداوی بەدو بێخێریشیان بۆ تاریکی دەگەڕاندەوە یان وەکو هاوبەشپەرستی سابیئیەکان کە بەڕێوەبردن و تەگبیری جیهانیان بۆ هەسارە بەرزەکان دەگەڕاندەوە. هەروەها زۆر لە گۆڕپەرستانیش پێیان وایە گیانی پیاو چاکان لە دوای مردنیان کاروباری دنیا بەڕێوە دەبەن و ئاتاجی خەڵك جێبەجێ دەکەن و تەنگانەیان لە کۆڵ دەکەنەوەو بە هانای هاناخوازان دەچن و ئەوانەش دەپارێزن کە پەنایان وەبەردێنن و داوای دالّدەیان لێ دەکەن. هەمدیسان ئەوەش هاوبەشپەرستی گەورەیە کە لەگەڵ خودا یەکێك بکاتە هاوبەش جا فریشتە بێ، یا پێغەمبەرێك یا پیاوچاکێك یا رۆژو مانگ یا بەردو یا مرۆڤێك بێت و وەکو خودا بیپەرستێ جا بە پاڕانەوەو یارمەتخوازی بێ یان بەسەربڕین و نەزرو هەرجۆرە پەرستنێکی دی بێ.

### مەرج نیە هاوبەشەکە لە ریز خودا دابنرێ تا ببێتە هاوبەشپەرستی

هاوبەشپەرست مەرج نیە هاوبەشپەرستیەکەی بەوە بێ لە هەمو روێکەوە لەگەڵ خودای یەکسان بکات بەڵکو هەر هاوبەشێکی بۆ خودا بڕیاردا ئەوا دەبێتە هاوبەشپەرست ئەگەرچی لە تواناو زانستیشدا وەکو خوای دانەنێت.

بەلاّم خودای بەرزو بە توانا لە بارەی هاوبەشپەرستان دەفـەرموێ: ﴿تَاللَّهِ إِنْ كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ ۝ إِذْ نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ۝﴾ سورەتی شوعەراء/٩٧-٩٨، واتە: بەو خودایە ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرا دابوین. ئـەو دەمـەی ئێوەمـان لەگەل خودا بەرانبەر دەکرد.

ئەوا مەبەستی لەو یەکسان کردنەدا لە خۆشویسـتن‌و تـرس‌و تـەماو ئەژنـەواو ملکەچبونە، نەك لە ئافەریدەکردن‌و هێنانە بوندا، چونکە لەمەدا بڕوایان بە تاکێتی خودا هەبو.

## مەترسی ئەم جۆرە هاوبەشپەرستیە

هاوبەشپەرستی گـەورە مەترسـیەکی بێئـەندازەی هەیـــە چونکـە کـردەوان مایـەپوت دەکـات خـودا دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سـورەتی ئـەنعام/٨٨، واتـە: ئەگـەر هاوبەشپەرسـتیان بکردایـە هـەرچی کردبویان پوکەڵ دەبۆوە.

هەروەها بە پێغەمبەر ﷺی فەرموە ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ سـورەتی زومـەر/٦٥، واتـە: سروشمان بۆ تۆو بۆ پێغەمبەرانی تر ناردوە ئەگەر هاوبەش بۆ خـودا دابنێـی ئـەوا کردەوەکانت نابوت دەبێ‌و دێیە ریزی دۆڕاوان.

هاوبەشپەرستان بۆ هەمیشەو تا هەتایە لە نـاو ئـاگری دۆزەخـدا دەمێننـەوە ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾ سورەتی نیساء/٤٨.

لەگەڵ ئەوەشدا بەهەشتی لێ بێبەش دەکات، خودا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾ سورەتی مـائیدە/٧٢، واتـە: ئەوانـەی گوتیـان مەسیحی کوڕی مەریـەم خودایە؛ بێبڕواییان کرد. کەچی مەسیح پێی گوتن هۆ بەنو ئیسرائیل ئـەو خودایە

بپەرستن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیە، چونکە هەر کەس هاوبەش بۆ خودا دابنێ ئەوا خودا بەهەشتی لێ بێبەش دەکات و هەوارگەی دبێتە دۆزەخ، ستەمکارانیش پشتیوانیان نیە.

## گەورەترین تاوان و بەدترین ستەم

لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود خوا لێی رازی بێت دەڵێ: لە پێغەمبەر ﷺم پرسی: چ گوناهێك لە لای خودا لە هەمو گوناهێك گەورەترە فەرموی: ((أن تجعل لله ندأ وهو خلقك)) واتە: هاوتایەك بۆ خودا بڕیار بدەی، کە هەر خوداش تۆی ئەفراندوە. خوداش دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ سورەتی لوقمان/١٣، واتە: هاوبەشپەرستی ستەمێکی گەورەیە، هەروەها دەفەرموێ ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا﴾ سورەتی نیساء/٤٨، واتە: ئەوەی هاوبەشپەرستی بۆ خودا پەیدا بکات ئەوا گوناهو تاوانێکی زۆر گەورەی هەڵبەستاوە.

## جۆری دووەم : هاوبەشپەرستی بچوك:

هاوبەشپەرستی بچوك وەکو نیمچەریاکاری و خۆرانواندن بۆ خەڵك. هەروەها نەبونی دڵڕاستیەکی پاك بۆ خودا لە پەرستنەکان، بەڵکو هەندێ جار بۆ ئارەزو و هەندێ جار بۆ دنیاو هەندێ جاریش بۆ پلەو پایەی دنیا کارەکانی دەکات. تێکەڵە، هەندێکی بۆ خودایەو هەندێکیشی بۆ جگە لە خودایە.

هەروەها ئەمانەش دەگرێتەوە: سوێند خواردن بە غەیری خودا، گوتنی ویستی تۆو خودا وابو، لە تۆو لەو خودایە زێتر کەسم نیە.

رەنگە ئەمانە ببێتە هاوبەشپەرستی گەورەش، بە پێی قسەکەرو مەبەستەکەی دەگۆڕێت.

ئەم جۆرە هاوبەشپەرستیە بچوکە ئەگەرچی کابرای پێ لە دین ناشۆرێ و لە نەتەوەی ئیسلامی هاوێر ناکات بەڵام لە ترکزەیەکی ترسناکیش دایە، پاداشتی کەم دەبێتەوە، رەنگە کردەوەکەشی مایەپوت بکات.

لە صەحیحی بوخاری هاتوە ئەبا موسا خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پیاوێك هات لە پێغەمبەر ﷺی پرسی: ئەگەر پیاوێك بۆ غەنیمەت یان بۆ ناوو دەنگ یان

بۆ ئازایەتی شەڕ بکات، کامیان لە پێناو خودایە؟ فەرموی ((**من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله**)) واتە ئەوەی لە پێناو بەرزکردنەوەی وتەی خودا شەڕ بکات لە پێناو خودایە.

لە موسنەدەکەی ئەحمەدی پێشەوا هاتوە پێغەمبەر ﷺ لە پەروەردگاری دەگێڕێتەوە ((**انا خير الشركاء، فمن عمل عملا اشرك فيه غيري فأنا بريء منه، وهو للذي أشرك**)) واتە: من چاترین هاوبەشم. ئەوەی کردارێك بکاتو غەیری من بکاتە هاوبەش، دەستبەرداری دەبمو کردەکەشی بۆ ئەو کەسەیە کردۆتیە هاوبەش.

هەر لە موسنەددا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ((**إن أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر**)) واتە: ئەوەی بە زۆر لێتانی بترسم، هاوبەشپەرستی بچوکە. گوتیان هاوبەشپەرستی بچوك چیە؟ ئەی پێغەمبەر! فەرموی ((**الرياء**: روپامایی)) خودا لە رۆژی ژیانەوەدا خەڵك پاداشتی خۆی وەرگرت، بە ریاکارەکان دەڵێ: برۆنە لای ئەوانەی لە دنیادا لە پێناویاندا کارەکانتان کردوە، داخۆ پاداشتتان دەدەنەوە.

خوداش بەرهەڵستی لەم هاوبەشپەرستیە کردوە، دەفەرموێ: ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ سورەتی کەهف/١١٠، واتە: ئەو کەسەی بە تەمای دیداری خودا بێ با کردەوەی چاك بکاتو لە پەرستندا هاوبەشپەرستی بۆ خودا بڕیار نەدات.

*** * * * ***

# ئایا بــیروبـاوەڕ بە درێژایــی ڕۆژگـــار پەرەی سەندوە؟

تۆژەرەوە ڕۆژ ئاواییەکان زۆریان پێیان وایە ئەو بیروبـاوەڕەی ئێستـا مـرۆڤ دەیزانێ کاتی خۆی بەیەك جار فێری نەبوە بەڵکو لەگەڵ ڕەوتی ڕۆژگارو سەدە لە دوای سەدە پەرەی سەندوە.

جێـی دۆشـدامان نیـە ئەگـەر کەسـانێك ئـەم جـۆرە قسـەیە بکـەن کـە خـودا قورئانی پێ نەبەخشیبن چونکە قورئانی پیرۆز زۆر بە ڕونیو بێ تەمتومان مێـژوی بیروباوەڕی گێڕاوەتەوە.

بەڵام ئەوەی جێی سەیرمان بێنەوەیە کەسـانێکی وا هـەمان بۆچونیـان وابـێ کە خۆیانو کەسانی دیکەش بە تۆژەرەوەی موسڵمانیان هەژمار دەکەن.

ئەوەتانێ (عەبباس مەحمودی عەققاد) لە پەرتوکەکەی بە ناوی (ﷲ) پـەیدا بونی بیروباوەڕی پەرستراوێتی دەتوێژێتەوەو دەڵێ (مرۆڤ لە بیروباوەڕدا پـەرەی سەندوە)، پێی وایە پەرەسەندنی مرۆڤ لە بیروباوەڕدا لەگەڵ پەرەسەندنەکەی لە زانستو زانیاریدا هاوسازبێ.

دەڵێ: (بیرباوەڕی سەرەتایی مرۆڤ لەگەڵ ژیانی سەرەتاییدا یەکسـان بـوە، هـەروەها زانســتو کارسازیەکەشـی. سـەرەتاکانی زانســتو کارسـازی بـاڵاترو پەرەسەندوتر نەبوە لە سەرەتاکانی ئاینو پەرستنەکان. ڕەگەزی هەقیقـەتی هیـچ کامێکیان لەوەی تریان فرەوانتر نەبوە).

بـەڵکو پێـی وایـە مـرۆڤ پەرەسـەندنی بیروبـاوەڕی پـێ ئەستەمتر بـوە لــە پەرەسەندنی زانستو کارسازیو دەڵێ: (تەقەلاکانی مـرۆڤ لـە پێنـاو ئـاین دەبـێ ئەستەمترو درێژ تر بوبێ وەك لە هی زانستو کارسازی، چونکە هەقیقەتی مـەزنی گەردون زۆر ئەستەمترو ڕێ دورترە وەك لە هەقیقەتی ئەو شـتە پەرتەوازانـەی کـە جار هەیە زانستو جاریش هەیە کارسازی چارەی دەکەن).

پێـی وایـە هەقیقـەتی پەرسـتراوێتی بـە یـەکجار بـۆ خـەڵك وەدەرنەکـەوتوە. دەڵێ: (گەڕانەوە بۆ بنەڕەتی ئاینەکانی سەردەمی نەفامی سـەرەتایی بەڵگـە نیـە بۆ مایەپوتی دینداریو گەڕان بە دوای مەحاڵ. بەڵکو ئــەوە دەگەیـەنێ هەقیقـەتی

هەرە مەزن زۆر گەورەترە لەوەی هەر هەموی بە تەواوی لە یەك سەردەمدا وەدەركەوێت).

پاشان لە بارەی مێژوی بیروباوەڕدا رای تۆژەرەوانی هێناوەتەوە. هەیانە پێی وایە هۆی پەیدابونی بیروباوەڕی بۆ زەبونو لاوازی مرۆڤ گەڕاندۆتەوە لە بەرامبەر دیاردەكانی گەردونو دوژمنانی لە هێزی سروشتیو گیانەوەران...هەیانە پێی وایە بیروباوەڕی ئاینی حاڵەتێكی نەخۆشی تاكو كۆمەڵە. هەیانە پێی وایە بنەڕەتی بیروباوەڕی دینی پەرستنی (شەوە) بوە، وەكو هەندێ هۆزو تیرە گیانەوەرێكی (شەوە)كیان بە باوكی خۆ داناوەو پەرستویانە، رەنگە دارو بەرد بوبێو بە پیرۆزیان دانابێ.

ئیتر هەمو گریمانەیەكی هێناوەتەوە كە بە بیری تۆژەرە رۆژئاواییەكان داهاتوە.

بە داخی گرانەوە ئەم دیدەوەریە[78] خزەی بۆ زۆر لە نوسەران كردوەو كۆمەڵێك تۆژەرەوەش[79] پێی باوەڕ مەندبونە، هۆی ئەم تێكەوتنەش چەند خاڵێكە:

یەكەم: وایان مەزەندە كردوە كە مرۆڤی یەكەم ئافەریدە بونەكەی كەمایەسیدار بوبێو ئامادەیی وەرگرتنی هەقیقەتە مەزنو تەواوەكانی نەبوبێ. بەڵكو تێڕوانینیان لە بارەی مرۆڤی یەكەمەوە بەجۆرێك بو زێتر بە ئاژەڵیان چواندوە تا مرۆڤ.

دوەم: وایان گومان بردوە مرۆڤ لە خۆیەوە بەبێئەوەی فێركارو رێبەرێك هەبوبێت رێڕونی بكات؛ بۆ بیروباوەڕ رێنوێن بوە. ئێ كەواش بێ چار نیە دەبێ وەك چۆن لە زانستو كارسازیدا پەرەی سەندوە لە بیروباوەڕیشدا هەروا بوبێ.

سێیەم: كە بەو مەبەستەی لە ئاینەكانیان كۆڵیوەتەوە تا مێژوەكانیان والا بكەن؛ تەنها دینە شێواوو گۆڕاو گومڕاكانیان لەبەردەمدا بوە، ئیتر ئەوانیان كردۆتە روبەری توێژینەوەكانیانو ئەوانیان تاووتوێ كردوە. بەلام زۆر دورە هەقیقەت لەو دینانە بزانرێ كە نوێنەری لارووێر بونی مرۆڤن لە بیروباوەڕدا.

---

[78] (مصطفى محمود) لە پەڕتوكەكەی بە ناوی ( **الله**) یەكێكە لەوانەی ئەم دیدەوەرییەی پەسەند كردوە.

[79] نازانم كام بیروباوەڕ پەرەی سەندوە؟ ئایە بیروباوەڕی شێواوی جولەكان یان بیروباوەڕی گۆڕێنراوی دیانان، وە یان بیروباوەڕی فەیلەسوفزانەكان؟.. چونكە ئەم بیروباوەڕانە نوێنەرایەتی بیروباوەڕێكی راست و دروست ناكەن، بەڵكو بریتین لە چەند لارووێربونێكی بیروباوەڕی.

کردۆتـە روبـەری توێژینـەوەکانیانو ئـەوانیان تـاووتوێ کـردوە. بـەڵام زۆر دورە هەقیقەت لەو دینانە بزانرێ کە نوێنەری لارووێر بونی مرۆڤن لە بیروباوەڕدا.

## تەنها قورئان دەتوانێ مێژوی بیروباوەڕ رون بکاتەوە

لەسەر روی زەویـدا هیـچ پـەرتوکێك نیـە بتوانـێ بەڕاسـتو دروسـتی مێـژوی بیروباوەڕ رون بکاتەوە، تەنها پەرتوکی خودای پـاكو هـەرە بـەرز نـەبێ، کـە لـەم بارەوە زانستێکی تێرو تەسەلی هەیە، زانستی مرۆڤیش قەت ناتوانـێ بـە تـەواوىو بێ کەموکوڕی پەی بە هەمو لایەنەکانی ئەم بابەتە ببات، لەبەر ئەم هۆیانە:

یەکەم: بەر لە پێنج هەزار ساڵ هەر شتێك لـە بـارەی مێـژوی مـرۆڤ بزانـین کەمە، ئەوەی لە دە هەزار ساڵیش دەیزانین کەمترە، پێش ئەوەش هەر بە نەزانراو دادەنرێو مێژوناسی هیچـی لـەبارەوە نازانـێ. بۆیـە زۆربـەی هەقیقەتەکـە لەگـەڵ چەپوگوپبونی مێژوی مرۆڤ تەخشانو تونا بوە.

دوەم: ئەو هەقیقەتانەی مرۆڤ بۆی ماوەتـەوە هـەزارو یـەك ناهـەقی تێکـەڵ بـوە. بـەڵکو لـە نێـو شـەپۆلە هاروهاجـەکانی ئۆقیانوسـە پـانو قوڵـەکانی درۆو ساختەو گۆڕانو دەست تێوەردان هەر بە یەکجار فـەوتاوە. بەڵگـەش ئەوەیـە لـەم سەردەمەدا یەکێك لە قـورسو ئەستەمترین فـەرمان نوسینەوەی مێـژوی کـەسو کۆمەڵانە.

گەر ئەمە وابێ، ئاخۆ نوسینەوەی مێژوی سەرانسەری ژیانی مرۆڤایەتی چۆن بێ؟!.

سێیەم: هـەندێ لـەو مێـژوەی باسـی بیروبـاوەڕ دەکـات، سـەربردەکەی لــە ئاسماندا بوە نەك لە زەوی.

بۆیە تەنهایەکێك بتوانێ مێژوی راستەقینەمان پـێ ببەخشـێ، خـودای بـەرزو بێ هاوتایە ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ﴾ سـورەتی ئـالی عیمران/٥، واتە: خودا نە لە ئاسمانو نە لە زەویدا هیچ شتێکی لێ بزر نابێ.

## مێژوی بیروباوەڕ وەکو قورئانی پیرۆز باسی دەکات:

خودا پێی راگـەیاندوین ئـادەمی تەنـهاو تـەواو ئافـەریدە کردوە، پاشـان لـە گیانی خۆی فوی پێدا کردوە، لە بەهەشتێی نیشتەجێی کـردوەو، هـەرچی خـۆىو ژنەکەی مەبەستیان بوەو حەزیان لێ کـردوە ودمـی پێـداون تەنـها یـەك دار نـەبێ،

پاشان ئیبلیس فریوی داون‌و فەرمانی خوایان شکاندو ئەژنەوای دوژمن بون‌و لە دارەکەیان خوارد.

لەبەر ئەوە لە بەهەشتێ وەدەر نان‌و دابەزاندنە سەر زەوی، پێش ئەمەش بەڵێنی پێدابون بۆ وان‌و نەوەکانیان ڕێنوێنی دابەزێنێ تا مرۆڤ ڕێوشوێن‌و شەریعەتی خوا بناسن، ئەنجا ئەو کەسەی خۆی بخاتە باوەشی ڕێنوێنیەکە ئەوا لە ژین‌و ژیانەوەدا بەختەوەری دەکات‌و فیزبەرزو سەرکێشەکانیش لە ژین‌و ژیانەوەدا دەخاتە تەنگی‌و ناهەمواری ﴿قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ۞ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ۞﴾ سورەتی بەقەرە/٣٨-٣٩، واتە: گوتمان: هەموتان لە بەهەشت وەرنە خوارێ، هەر کاتێك ڕێنوێنی منتان بۆ هات پەیڕەوی لێ بکەن، نە ترستان دەبێ نە خەم. بێبڕواکانیش بڕوایان بە نیشانەکانی ئێمە نەکرد بۆیە دۆزەخین‌و بۆ هەمیشە لە وێدا دەمێننەوە.

لە سورەتی (طاها)دا دەفەرموێ: ﴿قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى ۞ وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى ۞ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنْتُ بَصِيرًا ۞ قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنْسَى ۞﴾ سورەتی طاها/١٢٣-١٢٦، واتە: خودا فەرموی هەردوکتان (ئادەم‌و حەوا!) لە بەهەشت بڕۆنە خوارێ‌و بۆ یەکتری ببنە دوژمن، هەر کاتێ ڕێنوێنی منتان بۆ بێ، ئەوەی شوێن ڕێنوێنی من بکەوێ ئەوا گومڕاو سەرەنگرێ نابێت، ئەو کەسەش ڕو لە یادی من وەرسوڕێنێ توشی ژیانی تەنگو تریسکی دەکەین، لە ڕۆژی ژیانەوەشدا بە کوێری زندوی دەکەینەوە. دەڵێ خودایە بۆچی بە کوێری زندوت کردمەوە خۆ لە دنیایێ چاو ساغ بوم. خودا دەفەرموێ: ئایەتەکانی منت بۆ هات لە بیر خۆت بردنەوە بۆیە ئەمڕۆ تۆش لە بیر دەچیەوە.

## یەکەم نەوەی مرۆڤ خوابەیەکناس بوە

ئادەم بۆ سەرزەوی دابەزی، خودا نەتەوەیەکی لە نەوەکانی پەیدا کرد کە هەر هەمویان لەسەر یەکخوا ناسیەکی پاکو بێ گەرد بون، وەکو خودا دەفەرموێ: ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ پێشان خەڵك یەك نەتەوە بونو لەسەر یەك خواناسیو دینی هەق بون. بەڵام پاشان فرەڕێ بون ﴿فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ﴾ سورەتی بەقەرە/٢١٣، واتە: خەڵك لەسەرتاوە یەك نەتەوە بون، خودا پێغەمبەرانی هەڕەشەکارو موژدەبەخشی نارد هەروەها پەڕتوکیشمان دابەزاند تا لە ناکۆکیەکاندا دادوەری نێوان خەڵك بکەن.

ئەبا ئومامە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: جارێکیان پیاوێك پرسیارێکی لە پێغەمبەر ﷺ کردو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئادەم پێغەمبەر بو؟ فەرموی *(نعم، مكلم:* بەڵێ، قسە لەگەڵ کراو بو) گوتی: لەگەڵ نوحدا چەندیان نێوان بو؟ فەرموی: *(عشرة قرون:* دە سەدە) ئەبا حاتەمی کوڕی حیببان لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتیەوە. ئیبنو کەثیریش لە (البداية والنهاية)دا دەڵێ: (بە پێی مەرجی موسلیمی پێشەواو بە خۆشی تەخریجی نەکردوە).

لە صەحیحی بوخاریشدا هاتوە ئیبنو عەبباس دەڵێ: (نێوان ئادەمو نوح دە سەدە بوە هەمویان لەسەر ئیسلام بوینە) هەر سەدەیەك سەد ساڵە کەواتە نێوان ئادەمو نوح هەزار ساڵ بوە.

رەنگە ماوەکە لە هەزار ساڵ زۆرتر بێ چونکە ئیبنو عەبباس لەو (دە) سەدەیەدا دەڵێ لەسەر ئیسلام بونە، رێی تێ دەچێ سەدەی تر لە نێوان ئەم سەدانەدا هەبوبێ.

رەنگە مەبەست لە *(قرن:* سەدە) پشتێك یا نەوەیەك بێ وەکو خودا فەرمویەتی ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ﴾ سورەتی ئیسراء/١٧، واتە: لە دوای نوحدا زۆر نەوەمان لە ناو بردوە.

﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ﴾ سورەتی موئمینون/٣١، واتە: لـە دوای ئەواندا نەوەیەکی دیکەمان هێنا ئارا. ٣٠٩

# یەکەم لاڕێبون لە بیروباوەڕو یەکەمین پێغەمبەر

دوای ئـەوەی خـەڵك هـەموی یـەك نەتـەوەی خـوا بەیـەکتاس بـون، ئینجـا لاڕێبون‌و ترازان رویدا.

یەکەم لاڕێبون سنور بەزاندن بو لە گەورەکردنی پیاوچاکان و، پایەیان وەکو خواوەندی پەرستراو لێکرد.

لـە صـەحیحی بوخـاریدا ئیبنـو جورەیـج لـە عـەطاوە ئـەویش لـە ئیبنـو عەبباسـەوە لەراڤـەی ئـەم ئایەتـەدا گوتویـەتی: ﴿وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾سـورەتی نـوح/٢٣، واتـە: وتیـان دەست لـە خواکانتـان هەڵمـەگرن بـە تایبـەتی وەددو یەسـوعو یـەغوثو یـەعوق‌و نەسر.

دەڵێ ئەم ناوانە ناوی هەندێ پیاوچاکی گەلی نوح بـون، کـە مـردن شـەیتان سروشی بۆ ئەم گەلە کرد لە کۆڕو دیوەخانان پەیکەریان بۆ داتاشن‌و بە نـاوی وان ناودێریان بکەن، وایان کردو نەیانپەرست بەڵام ئەم نەوەیە مردن‌و زانسـت لـە بیر کراو نەما پاشان خەڵکەکە پەرستنیان.

ئەوە یەکەم لاڕێبون بو لە مێژوی مرۆڤایەتیدا ئەنجا خودا یەکەم پێغەمبـەری بۆ ناردن نوح بو بۆ ئەوەی بەڵێنەکـەی بـە ئـادەمی بـاوکی مرۆڤـی دابـو بیهێنێتـە جێ، کە بەڵێنی دابو پێغەمبەران‌و پەڕتوکان دابەزێنێ تا مرۆڤـی پـێ رێنوێـن بـێ. بەڵگەش بۆ ئەوەی نـوح یەکـەمین پێغەمبـەر بـوە فەرمودەکـەی تکاخوازیەکـە لـە هەردو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا هـاتوە ((**إن النـاس يـأتون بعد آدم نوحاً فيقولون له فيما يقولون: يا نوح! أنت أول الرسل الى أهل الأرض وسمّاك الله عبداً شكوراً**)) واتە: خەڵك لە رۆژی ژیانەوەدا بـۆ تکاکاری لـە دوای ئـادەمدا دەچنە لای نوح‌و پێی دەڵێن: ئەی نوح تۆ یەکەم پێغەمبەر بوی بۆ خەڵکی زەوی‌و خودا بە بەندەی سوپاسگوزار ناوی بردوی.

ئەو دەقانەی لە قورئاندا هەیە بە ئاشکاریی وەدەردەخەن نوح ﷺ بانگەوازی بۆ یەکخواناسی پاك و بێ گەردی کردوە بەگەلەکەی گوتوە ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ سورەتی ئەعراف/٥٩، واتە: خوا بپەرستن، جگە لە خوا پەرستراوی ترتان نیە، من لە سزای رۆژێکی سەخت لێتان ئەترسم.

﴿أَن لَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾ سورەتی هود/٢٦، واتە: تەنها خودا بپەرستن، من لە سزای رۆژێکی ناسۆر لێتان دەترسم.

﴿يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ سورەتی موئمینون/٢٣، واتە: گەلۆ! خودا بپەرستن جگە لە خودا هیچ پەرستراوێکیدیکەتان نیە.

ئەوانەی وەلامی بانگەوازەکەی پێغەمبەر نوحیان داوە هەمویان رەشۆکیو لاوازو بێدەسەلاتەکان بون. ریشسپیو سالارەکانیش خۆیان بە ژیرو هۆشمەند دەزانی بۆیە خۆیان بە گەورەتر گرت لەوەی شوێن هەقو راستی بکەونو سەرکەشیان کرد ﴿قَالَ الْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ سورەتی ئەعراف/٦٠، واتە: ریشسپیانی گەلەکەی گوتیان: ئەی نوح تۆ لە گومراییەکی ناقۆلا دای.

پێیان گوت ﴿مَا نَرَاكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلَّا الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ﴾ سورەتی هود/٢٧، واتە: ئەوانەی بە دوای تو کەوتون زەبونەکانمانن و بەبێ تێوەرامانی قوڵو بیرکردنەوەو سەرنج بوە.

ئەوانەی بەم جۆرە سەرزەنشتی موسڵمانەکانیان دەکرد دەبوایە ستایشیان بکەن کە بەو جۆرە وەدوای هەقو راستی کەوتون، چونکە هەقو راستی گەر وەدەرکەوت تێوەرامانو سەرنجدانی گەرەك نیە بەڵکو دەبێ یەکسەر پەیرەوی لێ بکرێ.

پێیان سەیر بو خودا مرۆڤێك بکاتە پێغەمبەر ﴿مَا نَرَاكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا﴾ سورەتی هود/٢٧، واتە: تۆ وەکو ئێمە مرۆڤی.

﴿فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَوْمِهِ مَا هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً﴾ سورەتی موئمینون/٢٤، واتە: پیاوە بەناو ماقوڵە بێبڕواکان گوتیان نوحیش وەکو ئێمە مرۆڤە دەیەوێ خۆی هەڵکێشێ، ئەگەر خودا مەبەستی با فریشتەی دەنارد.

داوایان لێ دەکرد هەژارو زەبونە شوێنکەوتوەکانی دەربکات ﴿وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّهُم مُّلَاقُو رَبِّهِمْ وَلَٰكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾ سورەتی هود/٢٩، واتە: من بڕواداران دەرناکەم، ئەوانە بە خودا دەگەنەوە، بەڵام من ئێوە بە هۆزێکی نەزان دەزانم.

بەم جۆرە رۆژگارێکی درێژی خایاندو مشتومڕێکی زۆر رویدا ﴿فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا﴾ سورەتی عەنکەبوت/١٤، واتە: پەنجا ساڵ کەمتر لە هەزاری لە ناویاندا بوە.

نوحیش توکی لێ کردن ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ۞ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ۞﴾ سورەتی نوح/٢٦-٢٧ واتە: نوح گوتی: خودایە هیچ بێ باوەڕێك لەسەر زەویدا بە زندویی مەیەڵە، ئەگەر بیانهێڵی تەنها نەوەی بەدکارو بێبڕوایان لێ دەکەوێتەوە.

خودا هەموی بە لافاو لە ناو بردن ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا الرُّسُلَ أَغْرَقْنَاهُمْ﴾ سورەتی فورقان/٣٧، واتە: گەلی نوح بڕوایان بە پێغەمبەران نەکرد، نقومی بن لافاومان کردن، خودا بە میهری خۆی نوح و بڕوادارانی رزگار کرد، ئیتر زەوی لە ستەمکارو زۆرداران پاك بۆوەو تەنها خواناسانی لەسەر ما.

پاشان نەوەکانی دیش لاڕێبونیان تێکەوتو خودا پێغەمبەری بۆ ناردن ﴿..ثُمَّ أَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ ۞ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ..﴾ سورەتی موئمینون/٣١-٣٢، واتە پاشان نەوەیەکی دیکەمان هێنا ئارا، هەر لە خۆیانەوە پێغەمبەرانمان بۆ ناردن.

ئەو پێغەمبەرە بۆ یەکخواناسیو خواپەرستی بانگی کردن. بەم شێوەیە میهرو چاودێری خودا بۆ مرۆڤایەتی یەکبینە بوو هەرجارەی گومراو لاڕێ بوبانن ڕێنوێنی خۆی بۆ دابەزاندنو تاریکێیی دەتاراندن ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا كُلَّ مَا جَاءَ أُمَّةً رَسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُمْ بَعْضًا وَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِقَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ سورەتی موئمینون/٤٤، واتە: پاشان یەك لە دوای یەك پێغەمبەرانمان نارد، هەر هۆزو نەتەوەیەك کە پێغەمبەرمان بۆ دەناردنو بڕوایان پێ نەدەهێنا یەك لە دوای یەك لە ناومان دەبردن، ئەوانمان کردە قسەی سەر زار، یاخوە هۆزی بێبڕوا تونا و تون بێ.

ڕاستی سەربردەی مرۆڤایەتی بەم جۆرە بوە، ململانێیەکی دورو درێژ بوە لە نێوان هەقو ناهەقدا، لە نێوان پێغەمبەرانو ئەوانەی رویان لە هەقو ڕێنوێنی وەرگێڕاوەو لە یەکخواناسی لاڕێ بونەو دەستیان بە ڕێوشوێنی باوو باپیرانو هەوەستو ئارەزوە ناهەقەکانیان گرتوە: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى قَالُوا إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا تُرِيدُونَ أَنْ تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ ۞﴾ سورەتی ئیبراهیم/٩-١٠ واتە: ئایە هەواڵی نەوەکانی پێش خۆت پێ نەگەیوە؟ هۆزی نوحو عادو سەمودو ئەوانەی پاش ئەوانیش، ئەوانە بێجگە لە خودا کەس پێیان ئاگا نیە، پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگەی رونەوە هاتنە لایان، جا ئەوانە لە روی خۆ قەفکردنەوە دەستیان بە دەم خۆیانەوە گرتو وتیان بەوەی هێناوتانە بێبڕواین، ئێمە گومانمان هەیە لەو بانگەوازەی دەیکەن. پێغەمبەران گوتیان: ئایە ئەو خودایە گومانی لێ دەکرێ کە ئافەریدگاری ئەرزو ئاسمانەکانە، کە ئێوە بانگ دەکا تا گوناهتان ببورێو، تا دەمی دیاری کراوی خۆتان دەتانهێڵێ، ئەوانیش وتیان: ئێوەش وەکو ئێمە مرۆڤن دەتانەوێ لە ڕێبازی باوو باپیرانمان لا بدەن. بەڵگەو نیشانەمان بۆ بێنن.

## له قورئاندا که له بانگەوازی پێغەمبەران رادەمێنین ئەم حەقیقەتانەمان بۆ رون دەبێتەوە :

یەکەم: خودا مرۆڤی له سەرەتادا به تەواوی‌و به رێکوپێکی‌و بۆ مەبەستێکی دیاری کراو ئافەریدە کردوە. ئەویش پەرستنی خودایە، واشی ئەفراندوە ئامادەیی هەبێ بۆ ئەم مەبەستە.

دوەم: خودا هەر لە سەرەتاوە خۆی پێ ناساندوە، وازی لێ نەهێناوە بە بیرکردنەوەو تێوەرامان پەروەردگاری بناسێ بەڵکو پێغەمبەرانی بۆ ناردوە، ژمارەشیان هێند زۆر بوە سەرجەم مرۆڤایەتی گرتۆتەوە ﴿وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ سورەتی فاطر/٢٤، واتە: هەمو نەتەوەیەك پێغەمبەری بۆ نێردراوە.

بۆیە ناوی هەمو ئەو پێغەمبەرانە نازانین که خودا ناردونی ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِنْ قَبْلِكَ مِنْهُمْ مَنْ قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ﴾ سورەتی غافر/٧٨، واتە: بەر لەتۆ پێغەمبەرێکی زۆرمان ناردوە، هەندێکیانت بۆ باس دەکەین‌و هەندێکی ترمان باس نەکردوە.

بەڵگەش بۆ ئەمە لە رۆژی ژیانەوەدا نەتەوەکان هەر هەمویان راستی والا دەکەن‌و دان دەنێن خودا پەیامبەری بۆ ناردون‌و بانگی کردون بۆ رێنوێنی خودا ﴿... كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ۞ قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ ۞﴾ سورەتی مولك/٨-٩.

خودا لەبەر میهری خۆی‌و بۆ بەجێگەیاندنی ئەو بەڵێنەی بە ئادەمی باوکی مرۆڤایەتی دابو ئەم هەمو پێغەمبەرەی پەیتا پەیتاو یەك لە دوای یەك هەناردوە ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾ سورەتی نیساء/١٦٥، واتە: پێغەمبەرانم بۆ ئەوە ناردوە تا خەڵك لە ئاست خودا بیانویان نەمێنێ.

﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ سورەتی ئیسراء/١٥، واتە: سزادەری کەس نابین تا پێغەمبەری بۆ رەوانە دەکەین.

سێیەم: بنەڕەتی بانگەوازی سەرجەم پێغەمبەران یەك شتە، كرۆكو ناواخنی بانگەوازەكەشیان یەكخواناسیە.

چوارەم: دینی سەرجەم پێغەمبەران تەنها ئیسلام بووە ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ سورەتی ئالی عیمران/٨٥، واتە: هەر كەسێك جگە لە ئیسلام ئاینی تر بگرێتە بەر لێی وەرناگیرێو لە ریزی دۆڕاواندانە.

پێغەمبەر نوح دەڵێ ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ سورەتی یونس/٧٢، واتە فەرمانم پێكراوە ببمە موسڵمان.

خودا لە بارەی تەوراتەوە دەفەرموێ: ﴿يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا﴾ سورەتی مائیدە/٤٤، واتە: پێغەمبەران تەسلیمی خودا بون دادوەری جولەكەیان پێ دەكرد.

– پێغەمبەر موسا بەگەلەكەی دەڵێ ﴿إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ﴾ سورەتی یونس/٨٤.

– خودا فەرمانی بە پێغەمبەر ئیبراهیم كردوە ئیسلام پەیڕەو بێ، ئەویش گوتی ﴿أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ سورەتی بەقەرە/١٣١، ﴿وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ سورەتی بەقەرە/١٣٢، واتە: ئیبراهیمو یەعقوبو ئەم ئاینەیان بە نەوەكانی خۆیان راسپاردو گوتیان رۆڵەكانم خودا ئەم ئاینەی بۆ ئێوە هەڵبژاردوە، بە موسڵمانی نەبێ نەمرن.

– پێغەمبەر یعقوب لە منداڵەكانی پرسی لە دوای من كێ دەپەرستن؟ گوتیان ﴿قَالُوا نَعْبُدُ إِلَهَكَ وَإِلَهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ سورەتی بەقەرە/١٣٣، واتە: خودای تۆو باوانت (ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاق) یەك خودایەو ئێمە بۆی موسڵمانو گەردەن كەچین.

– شاژنی سەبەء گوتی ﴿رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ سورەتی نەمل/٤٤، واتە: پەروەردگارا! پێشتر ستەمم لە خۆم کردبو ژیوانمو لەگەڵ سلێماندا موسڵمانمو گەردەن کەچم بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

– یەکێك لە نزاکانی پێغەمبەر یوسف ئەوە بو ﴿تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ سورەتی یوسف/١٠١، واتە: بە موسڵمانی بممرێنەو بمگەیەنە ریزی پیاوچاکان.

– پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو ((**إنا معشر الأنبياء ديننا واحد والأنبياء إخوة لعلات**)) واتە: ئێمەی پێغەمبەر ئاینمان یەك بوە، پێغەمبەرانیش لەگەڵ یەکتردا لە باوکدا بران.

– ئەو جۆراو جۆرییەی لە شەریعەتەکاندا دەیبینین ئەوە ناگەیەنێ ئاینەکان جیاواز بن، چونکە خودا لەبەر چەند حیکمەتێك لە کاتێکدا فەرمان بە شەرعێك دەکاتو لە کاتێکی تردا بە شەرعێکی تر رەنگە لەیەك شەرعیشدا شتی وا هەبێ، وەکو لەسەرەتادا خودا فەرمانی وابو لە نوێژدا رو لە (قودس) بکرێتو پاشان فەرمانەکەی نەسخ کردەوەو فەرمانیدا رو لە (کەعبە) بکرێت.

شەریعەتی پێغەمبەرانیش بەم جۆرەیە، ئەوەی دواتر هی پێش خۆی نەسخ کردۆتەوە تا ئەو شەریعەتەی بۆ موحەممەد ﷺ دابەزیوە کۆتا شەریعەتەو ئەوانی پێش خۆی نەسخ کردۆتەوە.

پێنجەم: هۆی هاوبەشپەرستی و پەرستنی بێ لە خودا ئەوە نیە کە (عەقاد)و رۆژئاواییەکان دەیڵێن گوایە بیروباوەڕ بە تێپەڕبونی رۆژگاران پەرەی سەندوە. بەڵکو سەبارەتەکەی ئەوە بوە لە رێی پێغەمبەران لایانداوەو هەناردراوی پێغەمبەرانیان فەرامۆش کردوە ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا﴾ سورەتی طاها/١٢٤.

لەبەر ئەوە بوە وەدوای هەوەستو ئارەزویان کەوتونو وازیان لە رێنوێنی هێناوە ﴿إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنْفُسُ وَلَقَدْ جَاءَهُمْ مِنْ رَبِّهِمُ الْهُدَى﴾ سورەتی نەجم/٢٣، واتە: تەنها وەدوای گومانو هەوەست دەکەون، لەلای خوداوەش رێنوێنیان بۆ هاتوە.

﴿وَلاَ تَتَّبِعُوا أَهْوَاءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا مِنْ قَبْلُ وَأَضَلُّوا كَثِيرًا وَضَلُّوا عَنْ سَوَاءِ السَّبِيلِ﴾
سورەتی مائیدە/٧٧، واتە: وەدوای کەسانێ مەکەون کە پێشتر گومڕا بون‌و کەسانێکی زۆریشیان بە گومڕا بردوە، هەموشیان لە ڕێی ڕاست گومڕا بون.

لە بارەی جولەکانیش دەفەرموێ: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ وَنَسُوا حَظًّا مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ﴾ سورەتی مائیدە/١٣، واتە: چونکە پەیمانیان شکاند نەفرەتمان لێکردن‌و دڵمان ڕەق کردن، وشەکانی تەوراتیان لە جێی خۆی دەگۆڕی، بەشێکی زۆریشیان لە بیر کرد.

لە بارەی دیانانیش دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَى أَخَذْنَا مِيثَاقَهُمْ فَنَسُوا حَظًّا مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ سورەتی مائیدە/١٤، واتە: ئەوانەی گوتیان ئێمە نەتەوەی عیساین، پەیمانمان لێ وەرگرتن، بەشێکی ئامۆژەکانیان لە بیر چو، بۆیە تا ڕۆژی دوایی ناکۆکیان لە نێواندا دەبێ.

لاڕێبونی دیانەکانیش وەدەردەخات ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ سورەتی تەوبە/٣١، واتە: جگە لە خودا ئەحبارو ڕاهیبان دەکەنە فەرمانڕەواو گەورەی خۆیان، هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەم دەکەنە خودا، کەچی فەرمانیان پێ کرابو خودای تاک‌و تەنیا بپەرستن. پاکی بۆ ئەو خودایە کە هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن.

بۆیە پێغەمبەران پاکانەی خۆیان لەو کەسانە ڕادەگەینن کە لە ڕێوشوێنی ئەوان لایانداوە ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنْتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَهَيْنِ مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِنْ كُنْتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ ۞ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ . .﴾ سورەتی مائیدە/١١٦-١١٧ واتە: خودا فەرموی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم تۆ بە خەڵکت گوتوە لە باتی

خودا من‌و دایکم بپه‌رستن؟ عیسا ده‌ڵێ: خودایه پاکی بۆ تۆ قه‌ت ناشێ شتی وا بڵێم ئه‌گه‌ر گوتبم ده‌زانی، هه‌رچی له نه‌فسی من دایه ده‌یزانی به‌ڵام من له نه‌فسی تۆ هیچ نازانم، تۆ زانای به نهێنی‌و په‌نامه‌کیه‌کان. تۆ چت فه‌رمان بوبێ من ئه‌وم راگه‌یاندوه، وتومه: خودای په‌روه‌ردگاری من‌و خۆتان بپه‌رستن.

# تێڕوانینی نەتەوە گـــومڕاکـــان لە ئاست پەرستراودا

لەم توێژینەوەیەدا مەبەستم نیە مێژوی لاڕێبونــی بیروبـاوەڕ سـاغ بکەمـەوە، چونکە لاڕێبون جۆری زۆرە، بۆیە قەت ناکرێ هەر هەمویان کـۆ کرێتـەوەو ڕێگـەی لاڕێ بونەکەیان بناسرێ جا سودی زانینی مێژوی لایـەنی تـاریك چیـە، ئاشکراشـە بێبڕوایی یەك نەتەوەیە.

مەبەستی ئێمە ئەوەیە شتێك لە بارەی نەتەوەکان بزانین چۆن تێکەوتونە تـا نرخ و بەهای مەزن و ناوازەی بیروباوەڕی ئیسلامیمان بۆ دەرکەوێ.

ئەوانەی ناهەق دەناسن و تێی دەگەن، هەق و ڕاستی چاکـتر دەناسـن ئەگـەر گەردن کەچی هەقەکە بن، ئەوانەی پەیڕەو لـە ئیسـلام دەکـەن و لایـەنی بەرامبـەر ناناسن کە ناهەقیە، ئەوا ترسیان لێ دەکرێ بۆ ڕێبازی ناهــەق هــەڵخزین. عومـەری کوڕی خـەتتاب ڕاسـتی گوتـوە (ئەگـەر کەسانێکی وا بـۆ ئیسـلام پـەیدا بـون، نەفامێتیان نەدەناسی ئەوا ڕێسمانی ئیسلام هەودا هەودای لێ گورج دەبێتەوە).

هەڵبـەت ئـەو کەسـەی تـاریکی شـەوی دیتـوە چاکـتر ڕەوتـی ڕونـاکی ڕۆژ دەناسێ. تەندروستیش تاجی سەری لەش ساغانەو تەنها نەخۆش دەیبینێ.

سـەیید قوتــب - بەهەشــتی بــێ - پــەی بــەم هەقیقەتــە بــردوە بۆیــە لــە پەڕتوکەکەیدا بە ناوی (*خصائص التصور الإسلامي*: تایبەتمەندیـەکانی تـێڕوانینی ئیسلامی) دەڵێ: (مرۆڤ پـەی بـەوە نابـات ئـەو پەیامـە چـەند زەروریـە، دابڕان و یەخـە لـە یەخـە بونـەوە لــەو گومڕاییانــەی مرۆڤایــەتی لــە نێــو تونەکیـەکانیدا سەرگەردان کردوە زەروریە، سەقام گرتن لەسەر ئـاوەڕێکی ئـاڵاو واڵای بیروبـاوەڕ چـەند زەروریـە؟... مەگـەر ئـەو کاتـەی زل و زەلـۆری تـەپوتۆز و قوڕولیتـەی ئـەو بیروباوەڕ و تێڕوانین و فەلسەفەو ئەفسانە و، هزرو خەیاڵ و دروشم و نەریت و ژیـوار و باری ئەو نەفامیە دەناسێ. ئیسـلام کـە هـات دیـتی لـە هـەمو شـوێنێکدا ویژدانـی مرۆڤایەتیان سواق داوە... مەگەر ئەو کاتەی ئـەو گـەڕەلاوژێ و تێکـەڵ و هاڵۆزیـە بناسـێ کـەپاشماوەی گۆڕاو و دەسـت تێــوەردراوی بیروبـاوەڕە ئاسمانیـەکان و فەلسەفەو وەسەنیەت و ئەفسانەکانی مرۆڤی تێکـەڵ بـە سـەرچاوە خواوەندیـەکان کردوە).

## چەند وێنەیەك لە تێڕوانینە گومڕاكان:

تەنها سێ وێنە دەخەینە ڕو: یەكەمیان بیروباوەڕی وڵاتێك دەنوێنێ كە خەڵك پێیان وایە پێشان شارستانِ بون. دوەمیان: لە هەق لاڕێبونی خەڵكانێكی خاوەن ئاینێكی ئاسمانیە. سێیەمیان: بتپەرستی عارەبەكانی پێش سەردەمی پێغەمبەر ﷺ.

# پەروەردگـــار لە لای یۆنـانـیەکـــاندا[80]

تۆژەرەوەکان پێیان وایە یۆنانیەکان لە کۆندا نەتەوەیەکی ژیارمەند بونە. با ئێمەش لە بیروباوەڕیان بڕوانین.

یۆنانیەکان جۆپیتەر (Jupiter)یان پـێ پـەروەردگاری پـەروەردگاران بـوە، کەچی شێوەکەشی لە شێوەی شەیتان نزیکتر بوە تا لـە پـەروەردگارە پاکـەکان. رك ئەسـتورو سەرکێشێکی ئـارەزو بـازو ژەمـەنبوردە بـوەو هیـچ بایـەخێکی بـــە کاروباری پەروەردگارو ئافەریدەکان نەداوە تەنها بەو کارانە نەبێ دەسـەلاتو پـێ درێژیەکانی دەپاراست.

لـە (ئسـقولاب)ی خواوەنـدی نوژداریش تـوڕە دەبـو، چونکـە نەخۆشـەکانی چارەسەر دەکردو لە باجی روحی ئەو مردوانەی بێبەش دەکرد کـە لەسـەر پشـتی هەردی بەرەو هەناوی دۆزەخ دەچون.

لە (پرۆمثیوس)ی خواوەندی زانیاریو کارسازی توڕە دەبو لەبـەر ئـەوەی مرۆڤـی فێر دەکرد لە کارسازیدا ئاگر بەکار بێنێو زانیـاری بکاتـە هـێزێك رکەبـەری هـێزی پەورەردگارانی پێ بکات. حوکمێکی نەبراوەشـی بەسـەردا بـڕی بـەلام دلـی ئـاوی نەدەخواردەوە بیکوژێ یان لە ریزی خواوەندەکان دایبڕێنــێ. بـەلکو لـە داهێنـانی جۆری سزادانیدا هونـەری دەنوانـد، لـە شـاخێکی زۆر بـەرزی بەسـتەوەو بـالندەی کێوی دەنارده سەر بە درێژایی رۆژ جەرگیان دەخواردو بەشەویش وەکـو خـۆی لێ دەهاتەوە تا بۆ بەیانی دوبارە لێی بخۆنەوە... بۆ هەمیشە لەو سـزا بەردەوامـەدا دەبێو تکاو پاڕانەوەشی قبولْ ناکرێ.

(هـێزیود)ی شـاعیرو فەیلەسـوف خـەیالی وا رۆیشـتوە سـەبارەتی توڕەبونـی خواوەند لــە (پرۆمثیـوس) ئـەوە بـوە پرۆمثیـوس لـە خۆراکـی پـەورەردگارەکاندا بەشی خواوەندی وا داناوە ئێسکی زۆر بێو بەزو گۆشتیشی کەم بێت.

جۆپیتەری خواوەند وای زانیوە لە زانیاریو داناییو زرنگو ژیریدا خۆی لـەو بە بەرزتر دادەنێ چونکە (پرۆمثیوس) لــە نـاو پـەوەردگارەکاندا بـە فرەزانیـاریو زیرەکیەکی زۆر ناسراو بو خواوەندی گەورە هێندە پێی ناسراو نەبو.

ئەوەش لەبیر نەکەین (هێزیۆد)ی شاعیر ئەوپەڕی کردو کۆششی خۆی بـەکار هێناوە تا پاکانەی (جۆپیتەر) بکاتو بە پیرۆزو مەزنی بخاتە بەر مێشـکی خـەلك،

---

[80] خصائص التصور الإسلامي بەدەستکارییەکی کەمەوە –سید قطب لاپەڕە/١١.

لەگەڵ ئاستی ئەو پەرستنە پەرەسەندوە بگونجێ دینی یۆنانیە کۆنەکان پێی گەیشتبو.

شتێکی تر کە بگێڕەوەی جیاجیا لە بارەی جۆپیتەر دەیلێن ئەوەیە: (هیرە)ی ژنی دەخەڵەتاندو خواوەندی هەورێی دەنارد، تا لەو کاتەی کە لەسەر عەرشی ئۆلەمپدا لەگەڵ ئاشق و ماشقەکانیدا رادەبوێرێ، بەری خۆرێ بگرێ و نەهێڵێ ژنەکەی لێ واگا بێنێ.

تەنانەت جارێکیان ژنەکەی لە ناکاودا دیتی وا (جانیمید)ی مەیگێڕی ماچ دەکات کە شوانێکی زۆر جوان و کەشخە بو و رۆژێکیان لە ئاقاردا دەیبینێ و دەیرفێنێ و بەرەو ئاسمان بەرزی دەکاتەوە.... جۆپیتەر تۆمەتی ئاشقبونی جانیمیدی رەت نەدەکردەوەو بە ژنەکەی دەگوت: تۆ نازانی جیاوازی لە نێوان چێژی هەنگوینی پیاڵەو هەنگوینی لێو چۆن چۆنیە؟.

یۆنانیەکان بەم جۆرە لە خواوەند گەیشتون، پێیان وابوە چەندین خواوەند هەن یەکتری سزا دەدەن، دەخۆن و دەخۆنەوە، ژن دێنن، خواوەند ناپاکی لەگەڵ خێزانیدا دەکات، نێربازی دەکات و پاساویشی بۆ دێنێتەوە!.

وەرە بیرکەوە ئەم چەشنە بیروباوەڕە چتۆ کاریگەری لە دەرونی هەوادارانی جێ دێڵێ؟، چۆن کار دەکاتە سەر رەوشتی تاک و کۆمەڵ؟ چ شیرازەیەکی هەڵەو لاڕێ دەچنێ؟!.

# خودا له‌ دیدی جوله‌کـــاندا

دیـنی نـه‌وه‌ی ئیسـرائیل (جوله‌کـه‌) تـێڕوانینی بتپه‌رسـتیو گـه‌ماری نه‌ته‌وه‌په‌رستی له‌گه‌ڵ تێکه‌ڵو ئاوێته‌ بوه‌.

به‌نو ئیسرائیل (ئیسـرائیل یه‌عقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمـه‌ – سلاویان پێشکه‌ش–)، پێغه‌مبه‌رانیان بۆ هاتوه‌، یه‌که‌م پێغه‌مبه‌ر ئیسـرائیل بـوه‌، ئه‌و یه‌کخواناسیه‌ پاکو بێ گه‌رده‌ی بۆ هێنان که‌ ئیبراهیمی باوکی فێری کردبـون. پاشان پێغه‌مبه‌ری گـه‌وره‌یان موسا ﷺ هـه‌مان بانگـه‌وازی یه‌کخواناسـی له‌گـه‌ڵ شه‌ریعه‌تێکی موسایی بۆ هێنان له‌سه‌ر بنچینه‌ی یه‌کخواناسی بو.

به‌ڵام بـه‌ تێپـه‌ڕ بونـی ڕۆژگـار لاڕێبـونو تێڕوانینیـان بـۆ ئاسـتی بتپه‌رسـتان دابه‌زی. ئه‌فسانه‌و تێڕوانینی وایان له‌ باره‌ی خواوه‌ له‌ په‌ڕتوکـه‌ (پـیرۆز)ه‌کـه‌یانو له‌ ناوه‌ڕۆکی ته‌ورات نوسیوه‌، مه‌گه‌ر نشـێوترینو په‌سـترین تـێڕوانین بتپه‌رسـتی ئیغریقیو بتپه‌رستیه‌کانی دی شان له‌ شانی بده‌ن.

هه‌ڵبـه‌ت ئـه‌و بیروبـاوه‌ڕه‌ یه‌کخواناسـیه‌ی خـودا له‌سـه‌ر ده‌سـتی پێغه‌مبـه‌ر ئیبراهیمی باوکیان دایمه‌زراند، بیروباوه‌ڕێکی پاکو بێگه‌ردو هه‌موگرو کامدار بو بـه‌ هۆیه‌وه‌ یه‌کلاکه‌ره‌وانه‌ به‌رانگژی بتپه‌رستی بـۆوه‌، قورئـان وامـان بـۆ ده‌فـه‌رموێ. ئیبراهیمی پێغه‌مبه‌ر به‌ر له‌وه‌ی بمرێ وه‌کو یه‌عقوب منداڵـه‌کانی ئـامۆژ کـردو بـه‌م بیروباوه‌ڕه‌ فه‌رمانی پێ کردن ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَاهِيمَ ۞ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ ۞ قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ ۞ قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ۞ أَوْ يَنْفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ۞ قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ۞ قَالَ أَفَرَأَيْتُمْ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ ۞ أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ ۞ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ ۞ الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ ۞ وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ ۞ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ۞ وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ ۞ وَالَّذِي أَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ ۞ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ۞ وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ۞﴾ سوره‌تی شوعه‌راء/٦٩–٨٤، ﴿وَمَنْ يَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَنْ

سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ ۞ إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ۞ وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ۞ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي قَالُوا نَعْبُدُ إِلَهَكَ وَإِلَهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ۞ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ۞ وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَى تَهْتَدُوا قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ۞ قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ۞﴾ سورەتی بەقەرە/١٣٠-١٣٦.

بەڵام نەوەکان لە ڕێی ئەم یەکخواناسیە پاکو ئەم بیروباوەڕە بێگەردو ئەو باوەڕە ئاخیرەتئامێزە، ڕەتیان برد، ئیدی خۆیان نەگرتەوە تا سەرلەنوێ موسای پێغەمبەر هاتو بیروباوەڕێکی پاکو بێخەوشی هێنا. بەڵام دیسان سەقامیان نەگرتو لاڕێ بونەوە، پێغەمبەر موسا هێشتا هەر لە ناویاندا بو لاڕێ بون. یەك لەوانە ئەو گوڵکەیان دەپەرست کە (سامری) لە زێڕو زەبەرێ ئافرەتانی میسر دروستی کردبو ﴿قَالُوا مَا أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَكِنَّا حُمِّلْنَا أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ الْقَوْمِ فَقَذَفْنَاهَا فَكَذَلِكَ أَلْقَى السَّامِرِيُّ ۞ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلاً جَسَدًا لَّهُ خُوَارٌ فَقَالُوا هَذَا إِلَهُكُمْ وَإِلَهُ مُوسَى فَنَسِيَ ۞﴾ سورەتی طاها/٨٧-٨٨.

پێش ئەوەش داوایان لە موسا عليه السلام کردبو بتێکیان بۆ داتاشێ تا بیپەرستن ﴿وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ فَأَتَوْا عَلَى قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَى أَصْنَامٍ لَّهُمْ قَالُوا يَا مُوسَى اجْعَل لَّنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ سورەتی ئەعراف/١٣٨، واتە: کە بەنو ئیسرائیلمان لە دەریا پەڕاندەوە بەلای هۆزێکدا چون بتیان

دەپەرست، بە موسایان گوت: وەکو ئەوانە بتێکمان بۆ دابنێ بیپەرستین، ئـەویش گوتی ئێوە هۆزێکی نەفامن.

قورئان زۆر لاڕێبون و تێڕوانینی گەندەڵ و هاوبەشپەرستی و بتپەرستی دیکـەی یاد کردوە، تەنانـەت کوڕیـان بـۆ خـوا بڕیـار داوە ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ: عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ﴾ سورەتی تەوبە/٣٠، واتە: جولەکەکان گوتیان: عوزەیر کوڕی خودایە.

خودایـان بـە ڕژدو هـەژار وەسـف کـردوە ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنْفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ﴾ سـورەتی مـائیدە/٦٤، واتە: جولەکە گوتیان دەستی خودا گرێ دراوە، هەی دەسـتیان گـرێ درێ، لەبـەر ئەو قسەیە نەفرەتیان لێ کرا. بەڵکو دەستی خودا والایە چۆنی بوێ دەیبەخشێ.

﴿لَقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا وَقَتْلَهُمُ الْأَنْبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ سـورەتی ئـالی عیمـران/١٨١، واتـە: خودا ژنەوتی وتەی ئەوانە بـو کـە وتیـان خـودا هـەژارەو ئێمـە دەوڵەمـەندین ئـەم وتەیان لەسەر تۆمار دەکەین، هەروەها پێغەمبەرانیشیان بە ناهەق کوشتوە.

نەتەوەپەرستیان بە جۆرێك بـو بیروباوەڕیـان وابـو خودایـان نەتەوەپەرسـت بێ، بۆیە بە یاسای خوڕەوشـت پرسـینەوەیان لەگـەڵدا ناکـات مەگـەر لەوشـتانەی لەگەڵ یەکتریان ڕەفتار کردوە، بەڵام ئەگـەر لەگـەڵ غـەوارەکان (ناجولەکـەکان)دا ڕەفتێکی نابەجێش بکەن لێپرسینەوەیان بۆ نیە.

یەکێك لەو گەمارە نەتەوەپەرستیە ئەوەیـە قورئـان دەیخاتـە ڕو: ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِنْ تَأْمَنْهُ بِقِنْطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُمْ مَنْ إِنْ تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَا يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَائِمًا ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الْأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ سـورەتی ئـالی عیمـران/٧٥، واتـە: نامـەوەران ئەگـەر هـەندێکیان دینـارێکی پـێ بسـپێری دەتداتـەوە، هـەندێکیان ئەگـەر دینارێکیـان پـێ بسـپێری ناتدەنەوە مەگەر هەمیشە لەسەریان ڕاوەستی. ئەمـە لەبـەر ئەوەیـە دەڵێـن ئێمـە لەڕاسـت نـەخوێندەواراندا بـەرپرس نـین، درۆ بـە خـودا هەڵدەبەسـتن، دەشـزانن درۆیە.

پەرتوكە دەستتێوەردراوەكەیان شتی وای لە ئامێزە هیچی وای لە هی بتپەرستە ئیغریقیەكان كەمتر نیە. لە ئیصحاحی سێهەمی سیفری تەكویندا هاتوە: (دوای ئەوەی ئادەم لە بەری درەختەكەی خوارد -بە پێی وتەی نوسەری ئیصحاحەكە درەختی خێرو شەڕ بوە- (ئادەمو حەوا) هەردوكیان گوێیان لە دەنگی خودا بو كە لەگەڵ هەڵكردنی بای رۆژێ لە بەهەشتدا هاموشۆی دەكرد. لە ناوەڕاستی بەهەشتێ خۆیان لە خوا شاردەوە. خودا بانگی كردە ئادەمو گوتی: تۆ لە كوێی؟. گوتی: گوێم لە دەنگت بوو لێت ترسام لەبەر ئەوەی روتم بۆیە خۆم شاردۆتەوە. خودا گوتی: كێ فێری كردی بزانی روتی؟ دیارە لە بەری ئەو درەختەت خواردوە كە فەرمانم دابو نەیخۆی؟. "خواوەند گوتی: ئەوەتانێ، مرۆڤیش وەكو ئێمەی لێهاتوە خێرو شەڕ دەناسێ. رەنگە ئەم جارەیان لە بەری درەختی ژیانیش بخوات، بیخواتو بۆ هەمیشە بژێ.

بۆیە خودا لە بەهەشتی عەدن دەری كرد تا لەسەر ئەو زەویە كار بكات كە لێوەی هێنراوە. ئیدی مرۆڤی دەركردو بەخۆشی لە رۆژهەلاتی بەهەشتی عەدنی كرۆبیم نیشتەجێ بو، كلپەی شمشێرێكی هاروهاجیش كرا بە پاسەوانی درەختی ژیان.

ئەم وتانە دیارە نەزانیو نەفامیە.

دەڵێ خودا نەیزانیوە ئادەم لە كوێیە تاكو خۆی پێی گوتوە. هەروەها وەكو مرۆڤ دەرواو هاتوچۆ دەكات.

سەبارەتی دەركردنی ئادەمیش گوناه نەبوە -وەكو قورئان یادی دەكات- بەڵكو لەبەر ئەوە بوە نەبادا مرۆڤیش بەری درەختی ژیان بخواتو تاهەتایە نەمرێت!.

دەڵێ خودا شەڕو خێری بە مرۆڤ نەناساندوە، بەڵكو ئەو كاتە ناسیویەتی كە لەبەری درەختەكەی خواردوە. ئەمانە هەموی درۆو دەلەسەیە بە خودای هەڵدەبەستن. لە وتەكانیان وا دەفامرێتەوە بێ پایانی ژیانی خودا بۆ ئەوە دەگەرێننەوە خودا لە بەری (درەختی ژیان)ی خواردبێ... پاكی بۆ خودا لەو وتە نابەجێیانە.

جا وەك چۆن نەزانییان داوەتە پاڵ خودا، خەمباریو پەشێمانیشیان داوەتە پاڵ لەو كردەوانەی كردونی. دەڵێن گوایە خودا لە ئەفراندنی مرۆڤ خەمی خواردوە بینیویەتی لە سەردەمی پێغەمبەر نوحدا پەشێویو بەدكاری زۆر بوە:

(پەروەردگار دیتی لەسەردەمی نوحدا بەدکاری مرۆڤ لەسەر زەویدا زۆر بوەو، تێڕوانینی هزری دڵی ڕۆژ لە ڕۆژ بەدترو خراپترە. جا پەروەردگار لە دڵی خۆیدا خەفەت دایگرتو داخی لەوە خوارد مرۆڤی لەسەر زەویدا ئەفراندوە. پەروەردگار گوتی: مرۆڤی ڕوی زەوی کە من ئەفراندومن تونایان بکەن.. مرۆڤو هەمو گیانەوەرو باڵندەو هەرچی لەسەر ڕوی زەویش دەڕوات. چونکە من پەژارەمەندم لەوەی ئافەریدەم کردون، بەلام نوح، نا، چونکە بەخششی لە چاوەکانی پەوەردگار دۆزیوەتەوە).

خوێنەری بەڕێز! گوێ بگرە ئەو ئەفسانەیەی لە ئیصحاحی یازدەی سیفری تەکویندا هاتوە: (دوای ئەوەی زەوی بە نەوەی نوح ئاوەدان بۆوە)، (سەرپاکی زەوی یەك زمان بو، جا بەرەو ڕۆژهەلاتێ کۆچیان کرد لە خاکی شنعاردا بەخششیان دۆزیەوەو لەوێدا نیشتەجێ بون. هەندێکیان بە یەکتریان گوت: بلێین با خشتێك دروست بکەینو تەواو وشکی بکەینەوە، ئیتر خشتیان لە باتی بەرد هەبوو بەردیش لە جیاتی قوڕ هەروەها گوتیان: دەی با بۆ خۆمان شارێك بنیاد بنێینو کەلوێکی بەرزی وا دروست بکەین سەری لە ئاسمان بدات، ناوێکیشی لێ بنێین تا بەروی زەویدا پەرشو بلاو نەبین.

ئینجا پەروەردگار دابەزی تا تەماشای ئەم شارو کەلوە بکات کە مرۆڤ بنیادی ناوە. پەروەردگار گوتی: ئێستاکە یەك گەلو یەك زمانو سەرەتای دەست بەکار بونیانە. ئێستاکەش کەس ڕێگریان نیە لەوەی دەیانەوێ بیکەن. دەی با دابەزین و لەوێدا زمانیان پەرتەوازە بکەین تا هەندێکیان نەتوانن ژنەوای هەندێکی تر بێن. پەروەردگار لەوێی سەر ڕوی زەویدا تەفرو بلاوی کردن، ئیدی وازیان لە بنیادنان هێنا. بۆیە بەم جێگەیە دەڵێن (بابل)، لەبەر ئەوەی لەوێدا پەروەردگار زمانی سەر زەوی پەرتەوازە کردو لەوێدا تەفرو پەرشو بلاوی کردن بەسەر ڕوی زەویدا).

ئەوە چ ئەفسانەیەکە، هەقیقەت چەواشە دەکات، هەر ئەوەتە ئەدگاری پێوە دەهێڵێ. ئەوە چ خودایەکە ئەم ئەفسانەیە بەرجەستەی دەکات؟ خودایەك لە مرۆڤ بترسێ، بەر لەوەی یەك دەنگو کۆك بن دژایەتیان بکات. لە هەرێمو ناوچەکانی سەر ڕوی زەویدا پەرگەندەیان بکاتو زمانیان تێکەڵو پێکەڵ بکات. کردەی شەڕیان داوەتە پاڵ خودا، هەروەها پەشێمانبونەوەشیان داوەتە پاڵ خودا هەروەکو لە سیفری صەمۆئیلی دوەمی ئیصحاحی بیستو چوارەمدا دەڵێ:

(پەروەردگار هاتە ئیسرائیلو هەر لە سبیانێوە تاکو میعاد مایەوە، ئەوانەی هەڵدێرانە ناو بیری درندان حەفتا هەزار پیاو بونو مردن. فریشتە دەستی درێژ کردە سەر ئۆرشەلیم تا بەربادی بکات. بەڵام پەروەرگار لە شەڕ پەشیمان بۆوەو بە فریشتەی لە ناوبەری گەلی گوت: ئیتر بەسە، هێواش بە).

ئەگەر قورئان جێبێڵین باسی گومرایی‌و لارێبونی جولەکە دەکاتو وەسفە نابەجێیەکانیان لە بارەی خوداو گۆڕانو دەستتێوەردانی تەورات وەدەر دەخات.

ئەگەر تەماشای (تەلمود)ەکەیان بکەین کە زاناو حاخامەکانیان نوسیویانەو پێیان لە تەوراتیش گرنگترە.. ئەوا ئەفسانەو گومڕایی وای تێدا دەبینین هێدمە دەمانگرێ! نەك تەنها لە بیرو باوەڕیش بەڵکو لە زۆر بواری تری شەریعەتیشدا. هەر ئەوەندە دێنینەوە کە پەڕتوکی *(الكنز المرصود في قواعد التلمود:* گەنجینەی نیشان لە یاساکانی تەلموددا) لە بارەی شکۆی خواوەندا باسی لێوە کردوە، پێیان وایە خودا ئاتاجی خوێندنو فێربونەو گاڵتەو گەمە دەکات. تەلمودەکەیان دەڵێ: (رۆژ دوازدە سەعاتە: لە سێ سەعاتی یەکەمدا دادەنیشێو شەریعەت دەخوێنێتەوە. لە سێ سەعاتی دوەمدا حوکم دەدات. لە سێ سەعاتی سێیەمدا بژێوی بە جیهان دەدات. لە سێ سەعاتی دواییدا دادەنیشێو یاری لەگەل نەهەنگ "شای ماسییان" دەکات).

گوێ بگرە ئەو ئەنتیکەیە (خودا هیچ ئیشی نیە تەنها ئەوە نەبێ لەگەڵ فریشتان خۆی فێری تەلمود دەکات). هەر فریشتەش نا بەڵکو لەگەڵ (ئەسمودیە)ی شای شەیتانانیش: (ئەو نەهەنگە چۆنە کە پەروەردگار یاری لەگەڵدا دەکات؟) نەهەنگێکی زۆر گەورەیە بە هاسانی دەتوانێ بچێتە ناو بازنەی ماسیەك درێژیەکەی (٣٠٠) سێ سەد فەرسەنگ بێت.

لەبەر گەورەیی قەبارەکەی خودا لەوە ترسا گەر زاوزێ بکەن دنیا وێران بکەن. بۆیە (مێینەکەی لێ بێبەش کرد، خۆ ئەگەر وای نەکردبایە درندە دنیایان دادەگرت. بۆیە بە هێزی خواوەندی خۆی نێرینەکەی بەند کردو مێینەکەشی کوشتو لە خوێی گرتو کردیە خۆراکی بڕواداران لە فیردەوس).

ئەوەش دەخەنە سەر ئەو ئەفسانەیەی کردۆتیانە بیروباوەڕ (خودا لە دوای روخانی پەیکەردا یاری لەگەڵ نەهەنگ نەکردوە) هەروەها (لە پاش روخانی پەیکەر ئارەزوی نەکردوە لەگەڵ حەوادا سەما بکات پاش ئەوەی هەر بە جلکی خۆی ئارایشی کردو پرچی بە کاکۆڵ بەستوە).

هەی توناوتون بن، هەر قسەی بێبڕواکانی پێشویانە کاوێژی دەکەنەوە.. قسەی نەتەوە گومڕاو هاوبەشپەرستەکانە.

لە تێڕوانینی ئەواندا خودا جیاوازی لەگەڵ مرۆڤ نیەو وەکو مرۆڤ بیر دەکاتەوە، وەکو وان دەکات، یاری دەکات، سەما دەکات، پەژارە دایدەگرێ، دەگرێ، بۆچی؟.

بۆ روخانی پەیکەری جولەکان کە پێغەمبەر سلێمان دایتاشیوە! کە پێیان وایە پەیکەرەکە هێمای شکۆمەندی جولەکانە.

دەڵێن خودا هەر لەو رۆژەی پەیکەریان روخاندوە تا ئەمڕۆکەش سێ لە چوار بەشی شەو دەگریێو وەك نەعرەتەی شێر دەنەڕێنێو دەڵێ: (توناو تون بم، بەخۆم رێم دا ماڵم وێران بکرێو پەیکەر بسوتێندرێو منداڵو نەوەکانم تاڵان بکرێ).

بەڵکو درۆو دەلەسەو هەڵبەستەی ناقۆڵاتریش هەڵدەبەستنو دەڵێن خودا لەبەر پەژارەو خەفەتی روخانی پەیکەر زاتەکەی گرژبوەو پوکایەوە -پاکیو بەرزی بۆ ئەو خودایەی دەلەسەی پێ هەڵدەبەستن- (خودا روبەری چوار ئاسمانی داگرت دوای ئەوەی بەردەوام لە هەمو رۆژگارێکدا سەرجەم ئاسمانەکانو زەوی داگرتبو).

وا وەسفی خودای بەرزو شکۆمەند دەکەن کە خۆی زەبون بکات، لە کاتێکدا بەندەکانی -کە مەبەستیان جولەکەیە- شکۆمەندی دەکەن (ئای ئەو پادشایە بەختەوەرو ئاسودەیە شایەنی ئەو ستایشو شکۆمەندیەیە خەڵك بۆی دەکەن. بەڵام ئەو بابەی نەوەکانی لە بەدبەختی بەجێ هێشتوە شایان نیە).

دەلەسەیەکی دیکەیان بە خودا هەڵبەستوە دەڵێن: خودا لە خۆی دەداتو دەگریێو فرمێسکان هەڵدەرێژێ، هەموی لەبەر ئەو بەدبەختیو دەردەسەریەیە کە جولەکە دەیچێژن (خودا پەژارەیەکی زۆر دایدەگرێ لەبەر ئەوەی جولەکەی لە رەوشێکی سەختو بەدبەختی بەجێ هێشتوە، تەنانەت هەمو رۆژێك شەق لە رومەتی خۆی دەدات و، دو دڵۆپ فرمێسکی لە چاو بەردەبێتەوە ناو دەریا، سەرانسەری جیهان گوێ بیستی دەنگەکەی دەبێو ئاو تێکهەڵدەشێوێ زۆربەی جارانیش زەوی دەکەوێتە لەرزە، لە ئەنجامدا بومەلەرزە پەیدا دەبێ).

هەڵبەستەیەکی تریان ئەوەیە دەڵێن خودا گوناه و هەڵە دەکاتو دان بە هەڵەو تاوانی خۆشی دادەنێو گوناهپۆشی دەکات. بە درۆو بە بوختان دەڵێن

خودا به هەڵە مانگی ئەفراندوەو، مانگیش به پەروەردگاری گوتـوە: (هەڵـەت کـرد منت له خۆر بچوکتر ئافەریدە کرد)، خوداش ئەژنەوای بوو دانی بـه تـاوانی خـۆی ناو گوتی: (کوشتیەکم بۆ سـەربڕن تـا گوناهەکـەمی پـێ رەش بکەمـەوە، چونکـە مانگم له خۆر بچوکتر ئافەریدە کردوە). نازانم چۆن پێیان وایە خـودا سـەرگەردی گوناهپۆشی دەبەخشێ! ئاخۆ بەکێی ببەخشێ؟.

ئەو ئاوەزەی ئەم جۆرە بوختانو دەلەسەیەی بە خوا هەڵبەستاوە ئەو پەڕی بێنمودیو بێنرخی کردوە، ئاوەزێکیش پێی بڕوا بکات هەروەکو ئەوە. سوپاس بۆ خودا ئێمە وا نین‌و رێنوێنی رێی راستی کردوین.

یەکێکی تر لە گەمژەکاریەکانیان پێیـان وایـە بیروبـاوەڕ ئەوەیـە کـە دەڵێـن: (جار هەیە خودا ئاوەزی دەڕوات، بۆ وێنـە وەك ئـەو رۆژەی لـە نـەوەی ئیسـرائیل توڕە بو، سوێندی خـوارد لـە ژیـانی هەمیشـەیی بێبەشـیان بکـات، بـەڵام ئـاوەزی هاتـەوە سـەر خۆیو ژیـوان بـۆوەو سـوێندەکەی بـەجێ نـەهێنا چونکـە دژی دادپەروەری بو).

کار هەر لەوەندە نەوەستاوە سوێند بەنەزانیو بەبێ ئاوەزی بخـواتو سـتەم بکـاتو پەشـیمان بێتـەوە، بـەڵکو پێیـان وایـە خـودا ئاتـاجی باتیدانـەوەی سوێندەکانیەتی، لـە تەلمودەکـەیان دەڵێـن: (ئەگـەر خـودا سـوێندێکی نایاسـایی خوارد ئاتاجی کەسێکە باتی سوێندەکەی بداتەوە، جا یەکێك لـە هۆشمـەندەکانی نەوەی ئیسرائیل گوێی لە خودا بـو دەیگـوت: کـێ بـاتی سـوێندەکەم دەداتـەوە؟ هەمو حاخامەکان کە زانیان هۆشمەندەکە باتی نەداوەتەوە بە (کـەر)یـان هـەژمار کرد، چونکە باتی سوێندی خودای نەداوەتەوە، لەبەر ئەوە فریشتەیەکیان لەنێوان ئەرزو ئاسمان دامەزراند بەناوی (می)تا لە کاتی پێویستو ئاتاجیدا باتی سـوێندی خودا بداتەوە)[٨١].

ئەوانەی رابورد چەند وێنەیەك بون لە بیروباوەڕی شێواوو گـۆڕاوی جولـەکان کە بنچینەی دینیانی رەنگڕێژ کردوە.

---

[٨١] ئەوە کەمێك بو لەو قسانەی کە جولەکە لە تەلمودەکەیاندا نوسیویانە.

# لاڕێبونی عەرەبەکان لە ڕێی یەکخواناسیدا

عەرەبەکان لەسەر ئاینی پێغەمبەر ئیبراهیمی باپیرە گەورەیان بون. تا نزیکەی (٤٠٠) چوار سەد ساڵ بەر لە هاتنی پێغەمبەر ﷺ هەروا بون، ئەو کات سەرکردەیەکی وایان لەناودا پەیدا بو خەڵك گوێدێری قسەکانی دەبونو کەس لە فەرمانی دەرنەدەچو. ئەو سەرکردەیە ناوی عەمری کوڕی عامری خوزاعی بو کو ئاینەکەی گۆڕین.

* لە صەحیحی بوخاریدا ئەبا هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی **((إن أول من سيّب السيوب وعبد الأصنام أبو خزاعة عمرو بن عامر، وإني رأيته يجرّ أمعاءه في النار))** واتە: یەکەمین کەس سود وەرگرتنی لە حوشترێك کە دوازدەجار بە مێ زابێ حەرام کردبێ، عەمری کوڕی عامری خوزاعییە، دیتم لەناو ئاگردا هەناوی لە دو خۆی ڕادەکێشا.

* لە هەردو صەحیحەکەی بوخاریو موسلیمدا ئەبا هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: **((رأيت عمرو بن عامر الخزاعي يجرّ قصبه في النار، كان أول من سيّب السيوب))** واتە: عەمری کوڕی عامری خوزاعیم لەناو دۆزەخ دا دیت هەناوی لە دو خۆی ڕادەکێشا، ئەو یەکەمین کەس بو سائیبەی داهێنا.

* لە صەحیحی بوخاریدا: خاتو عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **((رأيت جهنّم يحطم بعضه بعضاً، ورأيت عمراً يجر قصبه هو أوّل من سيب السيوب))** واتە: دۆزەخم دیت خۆی تێکوپێك دەشکاند، عەمریشم دیت هەناوی خۆی لە دو خۆی ڕادەخشاند، یەکەمین کەس بو سائیبەی داهێنا.

عەمر ئاینی عەرەبانی گۆڕیو بۆ بتپەرستی بانگی کردن، شتی غەوارەو تازەی خستە نێو دینی خواو بە ئارەزوی خۆی حەرامو حەڵاڵی دادەنا. یەك لەوانە خودا لە قورئاندا یادی کردوە ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلَا سَائِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾

سورەتی مائیدە/١٠٣، واتە: خـودا سـود وەرگرتـنی لـەو چـوارە حـەرام نـەکردوە: بەحیرە(وشترێکە پینج جار زابێ‌و جاری پێنجەم بێچـوی نـێرە بوبـێ، جـا گـوێیـان دەقەڵاشتەوەو ئازادیان دەکرد)، سائبە(وشـترێکە "دە" یـان دوازدە جـار بـە مـێ زابێ)، وەصیلە(وشترێکە دو زگ مێ زابێ)، حام(وشترە نێرێکـە بـۆ ئـاوس کردنـی ئـاژەڵی مـێ "دە" جـار کـەڵکیان لێ وەرگرتبـێ). بـەڵام بێبڕوایـان درۆ بـە خــوا هەڵدەبەستن‌و زۆربەیان ئاوەزیان نیە.

گێڕانەوەکان جیاوازیان هەیە لە گێڕانەوەی چۆنیەتی بڵاوکردنەوە بتپەرستی لە دورگەی عەرەبیدا، هەیە دەڵێ: عـەمر جنۆکـەی بینیـوەو بتـە بزربوەکـانی ژێـر خاکی سەردەمی نوحی پێ نیشان داون کـە کـاتی خـۆی گـەلی نـوح پـەرسـتویانن، ئەویش دەری هێناوەو بەسەر عەرەبەکان دابەشی کردوە.

هەیە دەڵێ بەشام تێپەڕیوەو ئەوانی دیتوە بت دەپەرستن، داوای بتێکیان لێ دەکات ئەوانیش بتێکی دەدەنێ، دەیهێنێتەوە مەککەو لەوێدا دایدەمەزرێنێ.

## بۆچی عەرەبەکان پەیڕەوکاری عمر بون؟

هۆی ئەوەی عەرەبەکان پەیڕەویان لـە فـەرمانی عـەمر کـرد ئـەوەبو عـەمری کوڕی لیحیی شوێنپایەکی بەرزی لە ناویـاندا هـەبو. لـەو کاتـەی دەسـتیان بەسـەر مەککەو کەعبـەدا گـرت‌و هـۆزی جورهومیـان ئەفـەرۆز کـرد، ســەرکردەی هــۆزی خوزاعە بو.

عەرەبەکان کردبویانە پەروەردگار، هەر شتێکی تازەی داهێنابا بە مـو لێیـان لا نـەدەداو دەیـانکردە رێوشوێن. چونکـە لـە وەرزی حـەجدا نـانی دەدا خــەڵک‌و بەرگی پـێ دەبەخشـین. نزیکـەی "دە" هـەزار وشـتری سـەردەبڕی‌و "دە" هـەزار بەرگیشی دەبەخشی.

دەڵێن: هەر عەمر بو خەڵکی بۆ پەرستنی "لات" بانگ کردوە. "لات" پیاوێك بو لە (تائیف) ئاردی گەنم‌و جۆی لەسەر بەردێك بۆ حاجیەکان دەکردە هەویر. کە مرد، عەمری کوڕی لیحیی گوتی نەمردوە بەڵکو چۆتە ناو بەردەکە ئەنجا فەرمانی بە خەڵکەکە کرد بیپەرستن.

دەگێڕنـەوە دەڵێـن هـەر ئـەو بـو دروشمـی لەبیەیکـەی گـۆڕی کـە هــەر لـە سەردەمی ئیبراهیمی پێغەمبەر ﷺ تا ئەو کـات هـەر بـەمجۆرە بـوە (لبيـك اللـهم

لبيك لا شريك لك لبيك)، جارێکیان عەمر بە دەوری کەعبەدا دەسوڕاوەو لەبیەیکەی دەگوت لەو دەمەدا شەیتان خۆی هێنا سەر شێوەی پیاوێکی پیرو لەگەڵ عەمر لەبیەیکەی دەگوت، گوتی (*لبيك لا شريك لك*) پیاوی پیر گوتی (*إلا شريكا هو لك*) عەمر خۆشنود نەبوو گوتی ئەمە چیە؟ پیرەمێرد گوتی: بلێ (*تملكه وما ملك*) ئەوە بلێ، ئاساییە. عەمریش هەڵیبڕیو خەڵکیش پەیڕەویان لێ کرد.

## سەرەتای لاڕێبون

ئیبنو ئیسحاق بۆمان دەگێڕێتەوە سەرەتای لاڕێبونی عەرەب لە نەوەی پێغەمبەر (ئیسماعیل)ەوە چۆن بەردیان پەرستوە. لە سەرەتادا کەعبەیان زۆر پێ گەورە بوەو بەجێیان نەدەهێشت تا ژمارەیان زۆر بوو جێیان تەنگ بو، جا هێدی هێدی بە روی زەویدا بڵاوەیان دەکرد تا جێنشینیان فرەوان بێ. هەر یەکێك دەڕۆیشت بەردێکی لە کەعبە هەڵدەگرتو لەگەڵ خۆی دەیبرد لەبەر ئەوەی پێی مەزن بو. لە کوێ هەواریان هەڵدابا بەردەکەیان لەوێ دادەناو وەکو تەواف کەعبە بە دەوریدا دەسوڕانەوە. بەرەبەرە وای لێهات بەردەکەیان دەپەرست، پاشان هەر بەردێکی تریان پێ باش با ئەویان دەیانپەرست.

سەرنج بدە پاشان چیان لێهاتوە:

ئەبا رەجای عەطاریدی دەڵێ: لەسەردەمی نەفامیدا بەردمان دەپەرست، ئەگەر بەردێکی باشترمان بدۆزیباوە هی یەکەممان فڕێ دەداو ئەومان لە جێی دادەنا. ئەگەر بەردیشمان وەچنگ نەکەوتبایە مشتێك خۆڵمان کۆ دەکردەوە مەڕێکمان دەهێنا بەسەریدا دەماندۆشیو پاشان بە دەوریدا دەسوڕاینەوە. یەکێك لە سەمەرەکانی نەفامی ئەوە بو ئەگەر پیاوێك گوزەری بکردبایە چوار بەردی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت سێیان بۆ قەدەری خۆیو چوارەمیان بۆ پەرستن.

## بتی عەرەبەکان

عەرەبەکان چەندین بتی جۆراو جۆریان دەپەرست، هیشامی کوڕی موحەممەدی سائیبی کەلبی دەڵێ: کۆنترین بتیان (مەنات) بو، لەدەم کەناری دەریای سور لە نێوان مەککەو مەدینەدا لە روبەرێکی بچوك سەقام کرابو.

سەرجەم عەرەبەکان بە گەورەیان دادەنا. ئەوسو خەزرەجو ئەوانەش کە بۆ مەککەو مەدینەو دەوروبەریان دەهاتن، بەگەورەیان دەگرتو قوربانیان بۆ

سەردەبڕی‌و دیارییان بۆ دەبرد، بەلآم کەس نەبو وەکو ئەوس‌و خەزرەج بەگەورەیان بگرێ. ئەوس‌و دراوسێکانیان لە مەدینە خەڵك ئاسا حەجیان دەکردو هەمو دروشمەکانیان لەگەڵ خەڵك جێبەجێ دەکرد، بەلآم دەبوایە لە لای مەنات سەریان بتراشن‌و چەند رۆژێکیش لە لایدا دەمانەوە، پێیان وابو گەر ئاوەها نەکەن حەجەکەیان بە تەواوی نەکردوە. (مەنات) هی هوزەیل‌و خوزاعە بو، لە فەتحی مەککەدا پێغەمبەرﷺ عەلی نارد هەپرونی کرد.

لە (تائیف)یشدا بتێکی لە (مەنات) تازەتریان هەڵنابو بە ناوی (لات)، گاشە بەردێکی چوارگۆشە بو، مجێورەکەی لە هۆزی (سەقیف)بو. خانوێکیان بۆ دروست کردبو، قورەیشیەکان‌و هەمو عەرەبەکانیش بە گەورەیان دەگرت، عەرەبەکان ناوی کوڕەکانیان بە *(زید اللات)*و *(تیم اللات: بەندەی لات)* ناودێر دەکرد.

شوێنەکەشی لە جێی منارەکەی مزگەوتە لاچەپەکەی ئەمڕۆی تائیف بو، ئەو بتە هەروا ماوە تا ئەو کاتەی هۆزی سەقیف موسڵمان بو پێغەمبەرﷺ موغیرەی کوڕی شوعبەو ئەبا سوفیانی ناردو روخاندیان‌و سوتاندیان.

ئیبنوجەریر لە تەفسیرەکەیدا لە موجاهید دەگێڕێتەوە لەبارەی ئایەتی ﴿أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّىٰ﴾ دەڵێ: لات پیاوێك بو قاویتی بۆ حاجیان ساز دەکرد، کە مرد خەڵك لە لای گۆڕەکەیدا -بە نیازی پەرستنکاری- دەمانەوە.

(ئەبالجەوزاء)یش لە ئیبنوعەبباس دەگێڕێتەوە: کە لات پیاوێك بوە قاویتی بۆ حاجیان ساز کردوە. بوخاری وای گێڕاوەتەوە.

پاشان بتێکی تریشیان دروست کرد بە ناوی (عوززا). (زالمی کوڕی سەعد) لە دۆڵی دارخورما لەسەر (ذات عرق) دروستی کرد. خانوێکیشیان بۆ بنیاد نا. خەڵك دەنگێکیان لێ گوێبیست دەبو.

(کەلبی) لە ئیبنوعەبباسەوە دەگێڕێتەوە کە: عوززا شەیتانێکی مێینەی هەبو، دەچوە لای ئەو سێ دار سەمورەیەی لە دۆڵی نەخلە دابو. پێغەمبەر ﷺ کە مەککەی فەتح کرد، خالیدی کوڕی وەلیدی ناردو پێی فەرمو: برۆ دۆڵی نەخلە، لەوێدا سێ دار سەمورە دەبینی، یەکەمیان ببڕەوە، ئەویش چو بریەوە، هاتەوە لای پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو: چت دیت؟ گوتی نەخێر، فەرموی دوەمیش ببڕەوە، ئەویشی بڕی‌و هاتەوە لای پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو: چت دیت؟ گوتی: نەخێر،

فەرموی سێیەمیش ببڕەوە. بڕیەوە.. ئـەوجا شـەیتانەکە هـات. شـێوەکەی وەکـو ئافرەتێکی حەبەشی پرچ هاڵۆزی گڵوازە بو، هەردو دەستی خستبوە سەر شـانیو جنجڕۆکی لە خۆ دەدا، مجێورێکیشی لە پشت راوەستابو. ئەنجا خالید ئـەم دێرە شیعرەی گوت:

**كفرانك لا سبحانك إني رأيت الله قد أهانك**

پاکیت ناکەم بێبڕوام پێت وا خوا ئاوا ریسوات دەکا.

ئەم دێرە شیعرەی گوت و تا هـێزی هاتـێ شمشـێرێکی لـە تۆقـی سـەری داو کردیـە دوپارچـە پاشـان سوتاو بـوە خۆڵـەمێش. ئـەنجا دارەکـانی هەڵکێشـاو مجێورەکەشی کوشت. کە ئەمەی ئەنجامدا گەڕاوە لای پێغەمبەرﷺو رابـردەی بـۆ گێڕاوە.

عـوززا هـی خـەڵکی مەککـە بـو، لـە شـوێنێکی نزیـك عــەرەفات بـو، عــوززا درەختێك بو لە لایدا قوربانیان سەر دەبڕی ودەپاڕانەوە.

کەلبی لە پەڕتوکەکەیدا بە ناوی (الأصنام) دەڵێ: قوڕەیـش زۆر بـتی تـری لـە نـاو کەعبەو دەوروپشتیدا هەبو. (هوبەل)یان پێ لەهەر هـەموان گـەورەتر بـو. ئـەوەی مـن پێـم گەیشـتوە بـەردێکی بـە نرخـی رەنـگ سـور بـو لـە شـێوەی مرۆڤـدا بـو. عەرەبەکان ئەگەر ناکۆکیـان لـە کـارێکدا هەبوایـە یـا بیانویسـتبا سـەفەرێك بکـەن دەهاتنە لایو باسکە تیرانەیان[٨٢] دەکرد.

ئەباسـوفیان لـە شـەڕی ئوحـوددا دەیگـوت: هوبــەل زاڵ بــو. پێغەمبــەرﷺ فەرموی: بڵێن: خودا بەرزترو بەسامترە.

بتێکی تریان هەبو بەناوی (ئیسافـو نائیلە). هــەندێ لـە بێـژەرەوان دەڵێـن: ژنێكو پیاوێك بون لە ناو کەعبەدا زینایان کردو خوداش کردنیە بەرد. قوڕەیشیش لە لای کەعبەی دانان تا خەڵك چاوترسا بێ. بەڵام کە رۆژگارێکی درێـژی بەسـەردا تێپەڕیو خەڵك بتیان پەرست، ئەوانیشیان پەرست. عەرەبـەکان قوربانیشـیان بـۆ سەردەبڕین.

---

[٨٢] باسکە تیرانە: چەند باسکە تیرێکیان دێناو لەسەر هەندێکیان دەنوسی بەڵێ لەسەر هەندێکی تریش نەخێر، ئەنجا رەمەکیانە –دوای تێکەڵ کردنیان– تیرێکیان هەڵدەگرت و بە پێی بەڵێ و نەخێرەکە بڕیاریان دەدا. وەرگێڕ.

پێغەمبەرﷺ لە فەتحی مەککەدا (٣٦٠) سێ سەدو شەست بتی لە دەوری کەعبەدا بینیو سەری کەوانەکەی لە دەمو چاو دەوەژەندن‌و دەیفەرمو: ﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾ سورەتی ئیسراء/٨١.

﴿قُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ سورەتی سەبەء/٤٩.

ئینجا بتەکان سەر بەرەو خوار بەردەبونەوەو تێکدەشکان پاشان فەرمانی کرد لە مزگەوت فڕێ درێنە دەرەوەو بسوتێنرێن. ئەم روداوە لە هەردو صەحیحاندا لە ئیبنو مەسعود گێڕدرایەتەوە بەڵام ئەوەیان یاد نەکردوە کە دەڵێ (ئینجا بتەکان... تاد) لە جیاتی (کەوان)یش دەڵێ: بە تیرۆگە دارێك لێی دەدان و... تاد.

پەرستنی بت بە چەشنێکی وا پەرەی سەند، تەنانەت هەر ماڵێك بتێکی هەبو دەیانپەرست. ئەگەر یەکێك سەفەری بکردبا یەکەم ئیش ئەوە بو بتەکەی بە خۆی دادەهێنا کە دەشگەڕاوە هەروا.

ئیبنو ئیسحاقی کەلبی دەڵێ: بتی ذولخولصە هی دەوس‌و خوثعەم‌و بوجەیلەو ئەوانەی لە هەرێمەکەیان دەژیان، هی ئەوان بو. بەردێکی سپی بو، شتێکی بە نەخشی چەشنی تاجی لەسەر بو. خانوێکیشی بۆ کرابو.

ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ بە (جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی) فەرمو: (ذولخولصە)مان لە کۆڵ ناکەیەوە؟ ئەویش بەتین‌و تەوژم بۆی بەڕێ کەوت، لەوێدا خەثعەم‌و باهیلە لەگەڵیدا بەشەڕ هاتن بەڵام شکاندنی. خانوەکەی (ذولخولصە)ی روخاندو ئاگری تێبەردا.

لە بوخاری‌و موسلیمیشدا جەریری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو: (ئەرێ لە خەمی (ذولخولصە)مان نارەخسێنی؟.

خانوێك لە خوثعەم هەبو پێیان دەگوت کەعبەی یەمانی.منیش بەخۆ بە سەدوپەنجا سوارچاکی نەبەردو قارەمان روم کردە (ذولخولصە). گوتم: ئەی پێغەمبەر من لەسەر ئەسپ سەقام ناگرم. پێغەمبەر ﷺ دەستی لە سینگم دا شوێنی پەنجەکانی لە سینگم نەخشا فەرموی: (خودایە سەقامی پێ ببەخشەو رێنوێن‌و رێنوێنکاری بکە). ئەوەبو چوە ئەوێ‌و بتەکەی شکاندو سوتاندی.

(دەوس) بتێکی هەبو بە ناوی (ذوالکفلین) بونە موسڵمان پێغەمبەر ﷺ طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی ناردو سوتاندی.

بەنی حاریثی کوڕی یەشکور بتێکیان هەبو بە ناوی (الشری). (قضاعة)و (لخم)و (جذام)و (عاملة)و (غطفان)یش بتێکیان لە کەنارەکانی شام هەبو پێیان دەگوت (الأقیصر).

ئەگەر بمانەوێ درێژە بەم بابەتە بدەین زۆر دەخایەنێ.

## شەوەزەنگی سەردەمی ناردنی پێغەمبەرﷺ:

بەر لە هاتنی پێغەمبەرﷺ روناکی ئاسمانی پێغەمبەران نەمابو، تەنها تروسکێییەکی کز نەبێ کە بەشی ئەوەی نەدەکرد خەڵکی پێ لەسەر رێوشوێنی پەروەردگار رێنوێنو راستەڕێ بکرێ، چونکە ئەم رێوشوێنە فەوتا بو لەگەڵ جۆرەها ناهەقو ناڕاستی تێکەڵ ببو. لە فەرمودەدا هاتوە: (خودا بەر لە پێغەمبەرﷺ تەماشای خەڵکی زەوی کرد، خەشمی لە عەرەبو ناعەرەبان گرت تەنها لە هەندێ نامەوەران نەبێ).

دەقی مێژویی ئەوەی بۆ پاراستوین کە چوار هۆشمەندی قورەیش لە کاتی جەژنگێڕانیان لە لای بتێکدا، لە گەلەکەیان دادەبڕێنو دورە پەرێز دەبن. ئەم هۆشمەندانەش ئەوانە بون: وەرەقەی کوڕی نەوفەل، عوبەیدوڵلای کوڕی جەحش، عوسمانی کوڕی حوەیرثی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا، زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل. ئەو کات بەیەکتریان گوت: سوێند بە خوا هەمومان دەزانین گەلەکەمان ناڕاستنو لە ئاینی پێغەمبەر ئیبراهیمی بابەگەورە لایانداوە، بەرد چیە ئێمە بەدەوریدا بسوڕێینەوە کە نە دەبیستێو نەدەبینێ، نە زیان ونەقازانج دەبەخشێ. هەیاران! با بۆخۆمان دین وەدۆزینو واز لەو پڕوپوچاتیە بێنین. پاشان هەر یەکەو بەلایەکدا بڵاوەی کردو بەدوای دینی ئیبراهیمی پێغەمبەر کوتنە گەڕان.

وەرەقەی کوڕی نەوفەل، لە ئاینی نەصرانیەکان گیرسایەوەو سەرگەرمی خوێندنەوەی نوسراوەکانیان بو تا شارەزاییەکی چاکی پەیدا کرد.

عوبەیدوڵلای کوڕی جەحش هەر بەگومانو بێئەنجام ماوە تا بوە موسڵمان، پاشان لەگەڵ موسڵمانەکان بۆ حەبەشە کۆچی کردو ژنەکەشی لەگەڵدا بو کە ناوی دایکی حەبیبەی کچی سوفیانی مەسلەمە بو. چوە حەبەشەو بوە دیان وبەگاوری مرد.

عوسمانی کوڕی حوەیرث چوە لای قەیسەری پادشای رۆمو بوە گاورو شوێنپایەکی باشیان وێدا.

بەڵام زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل، هەروا ماوە نە بوە جولەکەو نە بوە گاور، لە گەلەکەی کەنار گیر بوو وازی لە پەرستنی بتو خواردنی گۆشتی مردارو خوێنو گۆشتی قوربانیەکانی بت هێنا. بەرهەڵستی لە زیندە بەچاڵ دەکردو دەیگوت من لەسەر دینی ئیبراهیمم. رەخنەی لە ناڕاستی گەلەکەی دەگرت.

لە صەحیحی بوخاریدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێی رازی بێت دەڵێ: پێش ئەوەی سروش دابەزێ پێغەمبەرﷺ لە خواروی دۆڵی (بلدح) -کە لە رۆژئاوای مەککە دایە- زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلی دیت.

خوانێکیان بۆ لای پێغەمبەرﷺ هێنا، بەڵام زەید نەیخواردو گوتی: من گۆشتی قوربانی بتەکانتان ناخۆم تەنها ئەوە دەخۆم کە ناوی خوای لێ هاتوە.

زەید رەخنەی لە سەربڕینی قورەیشیەکان دەگرتو دەیگوت خودا بەرانی ئەفراندوەو بارانی بۆ لە ئاسمانو روەکی بۆ لە زەوی فەراهەم هێناون، سەرباری ئەمە ناوی خوای لێ ناهێنن؟. لەبەر ئەوە زەید گۆشتی قوربانی بتی نەدەخوارد.

موسای کوڕی عوقبە دەڵێ: سالمی کوڕی عەبدوڵڵا بۆی گێڕامەوە دەڵێ پێم وایە تەنها لە ئیبنو عومەری دەگێڕێتەوە- گوتی: زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل بۆ شام بەڕێ کەوت تا دینێك وەدۆزێو پەیڕەوی لێبکات. زانایەکی جولەکەی دۆزیەوە، لە بارەی دینی جولەکەی لێ پرسیو گوتی: رەنگە بێمە سەر دینی ئێوە. گوتی: ناتوانی بێیە سەر دینی ئێمە تا بەشی خۆت لە تورەیی خودا وەردەگری. گوتی: جا من لە تورەیی خودا هەڵاتوم. تا بتوانم خودا لە خۆم تورە ناکەم، باشە کەسێکی دیم پێ نیشان دەدەی؟ گوتی کەس نازانم مەگەر حەنیفیەك، زەید گوتی: حەنیفی چیە؟ گوتی: دینی ئیبراهیمە عليه السلام نە جولەکە بوە نە گاور، بێ لە خودا هیچی نەپەرستوە. ئەوی جێ هێشت.

ئەم جارە زانایەکی گاوری دیت، هەمان داوای لێ کردەوە، گوتی: ناتوانی دینی ئێمە وەرگری تا بەشی خۆت لە نەفرەتی خودا وەردەگری. گوتی: وا من لەنەفرەتی خودا هەڵاتومو تا بتوانم نەفرەتی خودا هەڵناگرم، کەسی تر دەناسی؟ گوتی: مەگەر حەنیفی. گوتی حەنیفی چیە؟ گوتی: نە جولەکە بوە نە گاور بەڵکو تەنها خودای پەرستوە.

که زەید گوێی لە قسەکانیان بو، ڕۆیشتو دەستی بەرز کردەوەو گوتی: خودایە شایەد بە ئەمن لەسەر دینی (ئیبراهیم)م.

هەورەها دەڵێ: لەیث دەڵێ: هیشامی کوڕی عورووە لە باوکیەوە ئەویش لە ئەسمای کچی ئەبابەکر دەگێڕێتەوە گوتویەتی: (زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلم دیتوە پشتی بە دیواری کەعبەدا بو دەیگوت: قوڕەیشیەکان! بەو خودایە کەستان لەسەر دینی ئیبراهیم نین تەنها من نەبێ. زەید زیندە بە چاڵ کراوی ڕزگار دەکردو دەیگوتە ئەو پیاوانەی دەیانویست کچی خۆیان بکوژن: مەیکوژە من بەخێوی دەکەم. دەیبرد تا هەراش دەبو پاشان بە باوکی دەگوت: ئەگەر مەبەستتە دەتدەمەوە، ئەگەر نا هەر لۆت بەخێو دەکەم). وتەی بوخاری تەواو.

لە بارەی زەیدەوە لە پێغەمبەریان پرسی ﷺ فەرموی: ((**يحشر ذاك امة وحده بيني وبين عيسى ابن مريم**)) قال إبن كثير إسناده جيد حسن، واتە: زەید کە زندو دەکرێتەوە بەتەنیا خۆی نەتەوەیەکە لە نێوان منو عیسا دایە.

خاتو عائیشە –خوا لێی ڕازی بێت – دەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((**دخلت الجنة فرايت لزيد بن عمرو بن نفيل دوحتين**)) قال إبن كثير إسناده جيد، واتە: چومە ناو بەهەشتو دو درەختی بەرزو گەورەم دیت هی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل بو.

بەڵێ، لەناو ئەم هەمو تاریکیەدا خودای گەورە گزنگی ئیسلامی پەخش کردو خەڵك بە خۆری ئیسلام ڕێیان روناك بۆوەو بە ڕێنوێنی ئیسلام ڕاستەڕێ بون.

سوپاسو ستایش هەر بۆ خودایە.

## ﴿ سەرچاوەکان ﴾


١. الله في العقيدة الإسلامية للشيخ حسن البنا.
٢. الله : لعباس محمود العقاد.
٣. الله جل جلاله لسعيد حوى.
٤. الابانة عن أصول الديانة : لأبي الحسن الأشعري.
٥. الإسلام عقيدة وشريعة : لمحمود شلتوت.
٦. الأسماء والصفات : للبيهقي.
٧. الإيمان : لأبي عبيد القاسم بن سلام.
٨. الأيمان والحياة : د. يوسف القرضاوي.
٩. البداية والنهاية : لابن كثير.
١٠. تطهير الاعتقاد : للصنعاني.
١١. تفسير القرآن العظيم: لابن كثير.
١٢. التوحيد : لابن خزيمة.
١٣. التوحيد : للزنداني .
١٤. جامع الرسائل : لابن تيمية.
١٥. جريدة الأهرام.
١٦. الحديث حجة بنفسه: للشيخ ناصرالدين الألباني.
١٧. حقائق الإسلام وأباطيل خصومه: للعقاد.
١٨. خصائص التصور الإسلامي : لسيد قطب.
١٩. الدين : لمحمد عبدالله دراز.
٢٠. شرح العقيدة الواسطية : لمحمد خليل الهراس.
٢١. صحيح الجامع الصغير: للشيخ ناصرالدين الألباني.
٢٢. العقائد: للشيخ حسن البنا.
٢٣. العلم يدعو إلى الإيمان: أ . كريستي موريسون.
٢٤. الفتوة الحموية: لشيخ الإسلام.
٢٥. الفوائد المجموعة: للشوكاني.
٢٦. في ظلال القرآن : لسيد قطب.
٢٧. الكنز المرصود في قواعد التلمود.
٢٨. لسان العرب: لابن منظور.
٢٩. لوامع الأنوار البهية: للسفاريني.
٣٠. مجموع الفتاوى : لابن تيمية جمع ابن قاسم.
٣١. مشكاة المصابيح :تحقيق الألباني.
٣٢. معارج القبول : للشيخ حافظ الحكمي.
٣٣. مع الله: للشيخ حسن أيوب.
٣٤. منهج ودراسات لآيات الأسماء والصفات : للشنقيطي.
٣٥. منهج جديد لدراسة التوحيد: لعبدالرحمن عبدالخالق.
٣٦. وجوب الآخذ بأحاديث الآحاد: للألباني.

# فەرهەنگۆک

خوێنەری بەڕێز..

واتای زۆربەی ئەم فەرهەنگۆکەیەم لە فەرهەنگان دەرهێناوە، هەر فەرهەنگەشم بە پیتێك هێما كردوە:

(خ): فەرهەنگی خاڵ، شێخ محمدی خاڵ.

(هـ): هەمبانە بۆرینە، هەژار موكریانی.

(م): فەرهەنگی مەهاباد، گیوی موكریانی.

(ق): قاموسی زمانی كوردی (أ ، ب)، عبدالرحمن أمین زەبیحی.

أ

| | |
|---|---|
| ئابوتاب | جوانو رێكو پێك (هـ). |
| | رازاوەو بە رەونەق (ق). |
| ئاتاج | چاو لە كۆمەڵ، موحتاج (هـ). |
| ئاپۆرە | كۆمای خەڵك پێكەوە (هـ). |
| | كۆمەڵو جەماوەری خەڵك كە دەوریان لە شتێك دابێ (ق). |
| ئاخنین | تێپەستاوتن، بەزۆرتێراكردن (هـ). |
| | ترنجاندن (خ). |
| ئارێ | بەڵێ. |
| ئاوارتن | دەربواردنی شتێك لە شتێك (الإستثناء) (خ). |
| ئاوارتە | شتی دەربردراو (مستثنی) (خ). |
| ئاسەوار | شوێنەواری كۆن، پاشماوەی رەچەڵەك (هـ). |
| ئادان | زەوی بە پیت (هـ. خ). |
| ئاوەر | باوەڕو یەقین، دڵنیایی (خ). |
| ئاوەز | هۆش، فام (العقل) (هـ). |
| ئافەریدە كردن | (خلق) (م). |
| ئافەریدە | (المخلوق) (م). |
| ئافەریدگار | (الخالق) (م). |

| | |
|---|---|
| ئاهەرا | کوێرەوەری (ﻫ). |
| ئاوبوێر | دڵۆپەکردنی بانو دیوارو شتیتر بەهۆی کونو درزەوە. |
| ئامێز | باوەش (ﻫ). |
| ئالودە | گیرۆدە، خوپێگرتو (ﻫ). |
| ئاسا | وەکو (ﻫ). |
| ئەبڵەق | مۆلەق بونی چاو (ﻫ). |
| | چاوی داپچڕاو کە تەماشای جێگایەکی تایبەتی نەکات (خ). |
| ئەسپەردەکردن | سپاردن (خ). |
| | هەر شتێکی بە کەسێك درابێ بە ئەمانەت (ق). |
| ئەژدەنگ | گیانداری زلی قەبەی ناشیرین (خ). |
| | عفریت (م). |
| ئەفەرۆزکردن | دەرکردنو دورخستنەوەی یەکێك (النفي) (خ). |
| ئەفراندن | (خلق) (م). |
| ئەژنەوابون | گوێڕایەڵی، بەرفەرمانی (الإطاعة، السمع والطاعة) (م). |
| ئەنگێزە | هۆ، مایەی سەرەکی (ﻫ). |
| | هەر شتێکی کەسێك هان بدا بۆ کردنی کارێك، (الباعث، الدافع) (ق). |
| ئەزرەت | حەزرەت، هەزرەت. |
| ئەفسوس | وتەی دەربڕینی خەفەت، داخو خەفەت (خ). |
| ئەرکبار | ئەرك: التكليف. |
| | ئەرکبار: المكلّف. |
| ئەلیا | تامەزرۆ |
| ئەنتیکە | عەنتیکە، سەیروسەمەر. |
| ئێست | پشو، وچانێکی کەم (ﻫ). |
| | وەستانێکی کەم لە کاتی کردار یان گوفتارێکدا (خ). |

| | |
|---|---|
| بانگبەر | ئەو کەسەی بانگەوازی ئیسلام بە خەڵك رادەگەیەنێ (داعی). |
| باتی دانەوە | بریتی (خ). |
| | لە بری، جیات (ه). |
| | بات: هەرکار یاشتێکی وەبەر شتێ یا کارێکی دیکە بکەوێ یا وەبەری بخرێ (ق) کەفارەت. |
| باك | ترس (ه.خ.ق) |
| | پەروا (ق). |
| بەرتوان | لە تواناداا هەبون (القابلیة). |
| بەردبوەکان | (المتحجرات). |
| بەرچاوەکی | ئەو شتانەی بەچاو دەبینرێن جیهانی بەرچاوەکی (العالم المشهود) |
| بەڵگەخوازی | بەڵگە هێنانەوە (الإستدلال). |
| بەژ | بەشی وشکایی لە زەوی (خ). |
| بەربیر | هێنانە بەربیر (التصور). |
| بەند | الفصل. |
| برست | وزە، هێزو توانا (ه). |
| بروا | الایمان. |
| بریکار | وەکیل (ه). |
| بنچینە | (القاعدة). |
| بولێڵە | ماوەیەك پاش ئاوابونی رۆژ لە ئاسۆ کە دنیا نە بەتەواوی روناك بێ و نە تەواویش تاریك (ق). |
| بێژین | وتن. |
| بێژیار | المروي عنه |
| بێژانەوە | وتنەوە (الروایة) فەرمودەناسی. |
| بێژەرەوە | الراوي |
| بیانوبڕین | بیانو نەهێشتن (إقامة الحجة). |
| بێسوچی | (البراءة)، بێخەتایی. |
| بیروباوەڕ | العقیدة. |
| بیر | الفکر. |
| بیرمەند | المفکر. |
| بێرون | چۆڵو بیابان (ه). |

| | |
|---|---|
| پابەند | المقيد |
| پاکی کردن | تسبيح |
| پاشاگەردانی | تێکەڵو پێکەڵیو هەرکەس هەرکەسی (هـ). |
| | بێ سەروبەری (الفوضى). |
| پاڵە | کریکار (هـ). |
| پا | بەرانبەر (هـ). |
| پاشینان | الخَلَفْ. |
| پاکانە کردن | البراءة. |
| پاساودان | تعليل (م). |
| پەرواز | فرین (هـ). |
| پەرتەوازە | ئاوارە (هـ). |
| | پەرتو بڵاو. |
| پەرگەندە | التشتت (م). |
| پەرژان | دەست گەیشتن بۆ کردنی کارێك (خ). |
| پەیدەرپەی | پەیتا پەیتا (هـ). |
| | مستمراً، بدون إنقطاع (م). |
| پەزمەندە | پاشکەوت (هـ). |
| پەنامەکی | نادیار، جیهانی پەنامەکی: عالم الغيب. |
| پەسڵان | رۆژی قیامەت (هـ). |
| پەرستکار | العابد. |
| پەرستار | یاریدەدەری نەخۆش، سستەر(هـ). |
| پەیڕەو | بەرنامە، دەستوری کار (المنهج)(هـ). |
| پەی بردن | تێگەیشتن، زانین (هـ). |
| | (الإدراك) (م). |
| پەڵە | لەکە (هـ). |
| پەرەم پەرەم | هەلا هەلا، هەپرون هەپرون (التقطع والإنكسار إلى جزئيات)(م). |
| پەیداکردن | هێنانەدی (الإيجاد). |
| پرینگانەوە | سڵەمینەوە، تەکینەوە. |

## پ

| | |
|---|---|
| پیادە | بەپێ ڕۆیشتن، پراکتیزە کردن، (تطبیق). |
| پیتۆڵ | فرەزان، فەیلەسوف. |
| پێخوست | بەرپێ دراو (ھ). |
| | شوێنێکە زۆر بەسەریدا ئاموشۆ بکرێ (خ). |
| پیسار | بێنوێژی ژن، خوێنی مانگانە، حەیز (ھ). |
| پێشەنگ | سەرجەلەی کاروان (القدوة، الأسوة)(ھ). |
| پێشکە | مێشولە (خ). |
| پێکان | لەشتدان بە تێگرتنی شتێك بۆی (الإصابة)(خ). |
| | ھەنگاوتن (ھ). |
| پێز | کێش‌و ھێز (ھ). بەرەکەت. |
| پێشینان | پیاوچاك‌و زانایانی پێشان (السلف). |
| پێودانگ | ئەندازە، ڕێوشوێن‌و دەستور (ھ). |
| پێناو | خاتر، ھۆ، ڕێگە (ھ) (الوسیط). |
| پوکەڵ | بەتاڵ‌و ناوخالی، پوچ (ھ) (باطل). |
| پۆزش | عوزر.تەوازۆ |
| پوان | رزین، پۆرتکان (ھ). |
| پۆرتکاو | رزیو، پواو (ھ). |
| پروکان | ھەڵپروزان لەگەرمانا (خ). |

## ت

| | |
|---|---|
| تامەزرۆگاری | الترغیب. |
| تاسە | حەزرەت. |
| تاو وتوی | سەنگ وسوك کردنی دو دەفر کەشتێکیان تێدابێ تا بەقەد یەکیان لێ بێ (خ). |
| تارومار | پەرش‌و بڵاو (خ). |
| | تێك‌و پێك، لەناوچو (ھ). |
| تاڵوکە | پەلەپەل‌و دەست‌و برد (خ). |
| تەمتومان | تەم. |
| تەخشان | بڵاوکردن (ھ). |
| تەوس | پلارھاویشتن (خ). |

| | |
|---|---|
| | قسەی بە تێکولْ (ھ). |
| تەکولۆ | مخالف. |
| تەکینەوە | دورکەوتنەوە، کشانەوە لەکارێ (ھ). |
| تەنینەوە | داگرتنەوە (ھ). |
| | پەرەسەندنو بڵاوبونەوەی شت (خ). |
| تەواومەندێتی | الکمال. |
| تەنتەنە | سەنسەنە، جەلالو شکۆ (ھ). |
| ترۆپ | ترۆپك: دوندی کێو، بڵندترین شوێن لە دار (ھ). |
| ترەکین | دەرزیردن (ھ). |
| | قەڵەشانی شت (خ). |
| توانج | سەرکۆنە، تانە (ھ). |
| تۆمانج | بوختان(م). |
| توناوتون | بەیەکجاری فەوتانو ئاسەوار نەمان (ھ). |
| توك | دوعا لێکردن، نزای خراپ (ھ). |
| تکاخوازی | الشفاعە. |
| توێکل | توێژی تەنکی سەر شتان (خ). |
| تۆکمە | شتی ناوپری قایم (ھ). |
| تونا | فەوتاو، لەبەین چو(ھ) (الفناء). |
| تۆزکاڵ | کەمترین ئەندازە (ھ). |
| تۆژینەوە | بە بەنجو بنەوانی کارێکدا رۆیشتن (ھ). |
| تێپەری | المبالغة. |
| تێسرەواندن | لێدان لە پرو لە ناکاو (ھ). |
| تێروانین | التصور. |

چ

| | |
|---|---|
| جەنجاڵ | هەراو هۆریا، زەنازەنا (ھ). |
| جڵەو | هەوسار، رەشمە، قامچی لغاو (ھ). |
| جنین | وردکردن بە چەقو (ھ). |
| جێباوەڕ | باوەڕپێکراو (الثقة). |
| جمە | بەسەریەکدا کەوتنی مەردوم لە شوێنێکدا (ج). |

| | |
|---|---|
| | **چ** |
| چاپوگوپ | درۆودەلەسە. |
| چاوگ | سەرچاوە، مصدر (خ). |
| چەندوچۆن | التفصیل. |
| چەمك | مەفهوم. |
| چەوێڵ | شتی چەوتی لار (خ). |
| چوستی | چالاكی (ھ) (الكفاءة). |
| چیغ | پەردەی لە قامیش كە بەدەوری رەشماڵدا رای دەنگێون (ھ). |
| چین | ریزێك لە شت (خ) (طائفة). |
| | **خ** |
| خاپەرۆك | پاشەرۆكو وردەی شتێكە كە مابێتەوە (خ). |
| خانەوادە | بنەماڵە. |
| خەلەفاو | هۆش نەماو لەبەر پیری (ھ). |
| خرۆشان | هَیَجان (م). |
| | **د** |
| دادیار | دادپەروەر، دادوەر. |
| دارماڵ | پراوپڕ (ھ). |
| دابەستی | حەیوانی لە ماڵ راگیراو بۆ قەڵەوبون (ھ). |
| داڵدە | پەنا. |
| داخوازی | مقتضی. |
| داكۆكی | پشتیوانی، لاگیری، تەقەلا، كۆش (ھ). |
| دانستە | تایبەتی (ھ). |
| دانسقە | كەم وێنەو نایاب (ھ). |
| دەستور | ودم. |
| دەمەوەری | زۆر بلێیی (ھ). |
| | خوار دەستێكە لە گفتوگۆدا بەدەمتدا بێتەوە (خ). |
| دەستەبەر | زامن ، كەفیل. |
| دڕدۆنگ | بە گومان،دودڵ (ھ). |

| | |
|---|---|
| | کەسێکە لە یەکێك دڵگیر بوبێ (خ). |
| دژمەند | دژکار، نقیض، ضد. |
| دژوار | سەخت (ھ). |
| دزێو | ناحەز، ناشیرین (ھ). |
| دنە | ھانە، ھەڵخراندن (تحفیز) (ھ). |
| دیان | گاور، فەلە، خاچپەرست. |
| دیدەوەری | بیردۆزە (النظریة). |
| دیدەوەر | بیردۆز، خاوەن دیدەوەری. |
| دیدەوان | چاودێر، ئێشکگری بان قەڵا. |
| | ر |
| راداشتن | ئاماژە، إشارة (م). |
| راگواستنەوە | نقل. |
| راستاڵی | الإستقامة. |
| رادەداری | التفاوت. |
| راکراوە | البسط. |
| راگر | القیوم. |
| رام | کەوی (ھ). |
| رەھا | ئازاد، مطلق. |
| رەگازۆ | رەگ داکوتان. |
| رەت | لەرێ ھەڵەنگوتن. |
| رەمەکی | مرۆڤی کەس نەناسو لە چینی بەرەوژێر، ئاسایی (ھ). |
| رەشکەوپێشکە | ئەمو رەشایی بەرچاو لەبەر بێحوکمی، نوسینی تێکەڵو پێکەڵوناخۆش (ھ). |
| رەزم | إیقاع. |
| رەخسکاو | کامڵ. |
| رەچاوکردن | لەبەرچاو گرتن (مراعاة). |
| رەوش | الوضع. |
| رەھەند | البعد. |
| رەھندە | دەربەدەر، رەھەندە (خ). |
| رەفت | رەفتار. |
| رەوت | ئەرزی رۆیشتن، سیاق. |

| | |
|---|---|
| رەخ‌وپو | لا. |
| رەبەن | رەهبان. |
| رەواز | شوێنێ کە زۆر رێگەی هاتوچۆی خەڵکە (هـ). |
| رەتان | ماندوبونی گیاندار لەبەر زۆر لنگدانی (خ). |
| رکێف | دەسەلات. |
| رمونن | وتەیەکە گیانداری ئێسك قورسی پێ دەچوێندرێ (خ). |
| رێوشوێن | دەستوری کار، (النهج). |
| رێبیر | بیروباوەرێکە کە مەردوم لەسەری بێ (مبدأ) (خ). |
| رێبەست | لەمپەر (الإعاقة). |
| رێسمان | گوریس، پەت، کندر. |
| رێخت | سروشت (الفطرة) (خ). |
| ریزبەندی | التسلسل. |
| ریزپەڕ | لەریز دەرچو، (شاذ). |
| رێژگە | صیغة. |
| روەت | قەدرورێز. |
| رۆژگار | الدهر. |
| رۆژگاریەکان | الدهریین. |

ز

| | |
|---|---|
| زایەند | الجنس. |
| زێد | نیشتمان، زاگە (هـ). |
| زنجیرە | (سند)ی فەرمودە ناسی. |
| زەیستان | ژنێ کە تازە منداڵی بوبێ. |
| زایەڵە | دەنگدانەوە (هـ). |

ژ

| | |
|---|---|
| ژەمەنبوردە | ژەمبوردە: کەسێکە لەپاش نەخۆشیو نەخواردنێکی زۆر ئارەزوی خواردنی کرابێتەوە (خ). |
| ژنەوتن | بیستن (خ.هـ). |
| ژێدەر | بنەما، رەگەزی وشە، (منشأ، مصدر) (هـ). |
| ژیوار | باری ژیان، چۆنیەتی ژیان (حاڵەت) (هـ). |

| | |
|---|---|
| ژێربێژی | منطق. |
| ژینوژیانەوە | دنیاوئاخیرەت. |

## س

| | |
|---|---|
| سەرزەنشت | لۆمە (ھ). |
| سەرپشك | الإختيار. |
| سەروساخت | ئاسیاویو ئاشنایی لەگەڵ یەکێك (خ). |
| سەنگرانەوە | سڵ کردن، پرینگانەوە، تەکینەوە. |
| سەرەنگرێ | رەت بردە، ھەلەنگوتە (ھ). |
| سەرمەشق | نمونە بۆ فێرکردن (ھ). |
| سەھندە | مەردومی لاساری نەگریس (خ). |
| سەیرمان | التعجب. |
| سا | بە هۆی. |
| سەبارەت | بە هۆی، بەگوێرەی (ھ). |
| سەرگوزەشتە | چیرۆکی رابوردە (ھ). |
| سەمەر | سەیرو ئەنتیکە. |
| سەرومڕ | ھەمیشە (خ). |
| سەرگەرد | بەلا گەردان، قوربان (ھ). |
| سەراسیمە | داماو، سەرگەردان (ھ). |
| سەرکۆنە | سەرزەنشت (العتاب) (ھ). |
| سەلار | جوانو شۆخو شەنگ. |
| سەقام | ثابت، القرار. |
| سفت | چنراوێکە کە شاش نەبێ (خ). |
| سفتوسوێ | ئازارو ئێشی برین (خ). |
| سۆ | گومان. |
| سۆما | هێزی دیتن (ھ). |
| سۆراخ | بە دوی شتی گومبودا گەڕان (المبحث) (ھ). |
| سوان | لە رێکخستن رێكو لوس بون (ھ). |
| سروش | الوحي. |
| سیخناخ | شتی پڕی ئاخنراو (خ). |

## ش

| | |
|---|---|
| شاقاو | هەنگاوی زل (هـ). |
| شەتەكدان | داپێچانی توند (هـ). |
| شڕۆڵ | مەردومی ڕیپاڵی شڕپۆخ (خ). |
| شڕوشیتاڵ | شتومەكی شڕی هەلا هەلا (خ). |
| شنینەوە | لەرین لەبەربا (هـ). |
| شینبون | سەوزبونی گیاودار (هـ). |
| شێمانە | الإحتمال. |
| شیرازە | بن درونی پەڕەكتێب پێكەوە(هـ) (النظام). |
| شوێنپایە | المقام. |

## غ

| | |
|---|---|
| غەوارە | بێگانە، غەریبە (هـ). |

## ف

| | |
|---|---|
| فەراهەم | ئامادە، تەیار (هـ). |
| فەروفیت | خێروبەرەكەت (هـ). |
| فراژو | بەخۆداهاتنو گەشەكردن (خ). |
| فرەزان | زۆرزان (هـ). |
| فزە | سرتەی كەم، دەنگی بەحال، نكە (هـ). |
| فیز | الكبر. |
| فروسمان | الإيحاء. |

## ق

| | |
|---|---|
| قەرەبو | التعويض. |

## ك

| | |
|---|---|
| كارا | زۆرئیشكەر، فعال. |
| كارامە | مەردومی دەرهاتوی كارزان (خ). |
| كاكڵ | ناوەڕۆكی بادامو گوێزو هەردەنكێك (خ). |
| كاوێژ | جونەوەی ئاژاڵ شتی ناو سكی خۆی بەیەق كردنەوەی بۆ ناو دەمی (خ). |
| كام | ئارەزو (خ)، ئاوات |
| كامگار | بە ئاوات گەیشتو. |

| | |
|---|---|
| کەمایەسی | کەمو کوریو ناتەواوی (ھ). |
| کەوشەن | سنور (ھ). |
| کەلو | بورج. |
| کەوی | رام (ھ). |
| کەشمو نەشم | جوانیو نازوعیشوە (ھ). |
| کەشەنگ | شەکەت (المرهق) (ھ). |
| کڵۆڵ | چارەڕەش (ھ). |
| | مەردومی بەدبەخت (خ). |
| کرۆک | ناواخن. |
| کردگار | الصانع. |
| کۆدەنگی | الإجماع. |
| کۆک | ساز، نێوان خۆش (ھ). |
| کۆسکەوتو | بەدبەخت بون (ھ). ئاتاج بونو بیٚ یاریدە مانەوە. |

## گ

| | |
|---|---|
| گاڵە | داخستن (ھ). |
| گاڵدان | داخستنی دەرگاو پەنجەرە (ھ). |
| گاور | فەلە، خاچ پەرست (ھ). |
| گەندەڵ | رزیو (فاسد) (ھ). |
| گەمژە | گەوج، گێژ (ھ). |
| گەف | هەڕەشە (ھ). |
| گەمار | چلك، پیساتی (ھ). |
| گەوزان | تل خواردن لەسەر تەنیشت (ھ). |
| گزی | فێڵ (ھ) (خیانەت). |
| گلێربونەوە | خلۆربونەوە. |
| گوزارە | واتا، نیاز، قسەیەك، رونکردنەوە (ھ). هەواڵ. |
| گوزارشت | تعبیر. |
| گۆڕەوشار | فشارو پێکهاتنەوەی گۆڕ بۆ مردو. |
| گوشاد | فرەوان (ھ). |
| گوزەر | رابردن، بورین (ھ). |
| گوناهپۆشی | كفارة الذنوب. |
| گیرسانەوە | بەندبون لە شوێنێ (ھ). |
| گیرۆدە | گرفتار (ھ). |

## ل

| | |
|---|---|
| لارێبون | لەرێ لادان (الإنحراف) (هـ). |
| لالوتی | کەسێ کە دەنگی لە یەکێك گۆڕیوە (الإنکار) (هـ). |
| لامل | عیناد. |
| لاکەلا | بزاوی سەربەخۆی لە دەسەلات بەدەر (هـ). |
| لاواز | ضعیف. |
| لەکارخستن | تعطیل. |
| لەمپەر | بەرگر، کۆسپ (هـ). |

## م

| | |
|---|---|
| ماك | ریشەو بناغەی شت (خ). |
| | هۆی دروست بون (هـ). |
| مامۆتك | زۆرعاقلو زانا (هـ). |
| | گزیرو دەمڕاستی دێ یان گەڕەك (خ). |
| مانەند | وەکو. |
| مایەپوت | نابوت (هـ). (مفلس، بدون رصید). |
| مەن | کێشانەیەکە(هـ)(صاع). |
| مراز | نیازی دڵ (هـ). |
| مشتومالّ | خاوێن بونەوەی تیرو کانزا (هـ) (التزکیة). |
| مشور | تەگبیرورِا (هـ). |
| مشورخۆر | سەرپەرشت، ئاگاداری کار (هـ). |
| مۆتەکە | کابوس |

## ن

| | |
|---|---|
| ناخ | ژورەوەی هەر شتێك (هـ) (النفس). |
| ناسۆر | برینێکە درەنگ چاك بێتەوە (خ). |
| ناگزور | دەستەنگ (هـ). |
| نامەوەر | خاوەن نامەکان (أهل الکتاب). |
| ناساز | ناکۆك، ناگونجاو (المتناقض). |
| ناوێزە | بژاردە، تایبەتی (الفرید) (هـ). |
| ناوزەد | ناونان. |
| ناودێر | ناونراو، بەناوبانگ (هـ). |
| ناکام | کەسێکە بە کامو خواستی خۆی نەگەیشتبێ (خ). (ناکامڵی بروا). |
| نامۆ | بیانی، بێگانە، غەوارە، غەریبە (هـ). |

| | |
|---|---|
| ناواخن | شتێکە ئاخنرابێتە دو توێی شتێکی ترەوە (خ). |
| نەرێ | النفي. |
| نەژاد | رەسەن، رەچەڵاك، بنچینە (ه). |
| نەشم | الأسلوب (م). |
| نغرۆبون | تغوّر (م). |
| نکولی | الإنكار. |

و

| | |
|---|---|
| وەڵامە | تەفسیر (م). |
| ودم | روخسەت، ئیجازە، دەستور، رێپێدان، ئیزن. |
| واژە | گوتە، قسە (لفظ) (ه). |
| وەنەوز | نوچبردن بەدەم خەوەوە. |

ه

| | |
|---|---|
| هاوێر | لێکجیاکردنەوەی بەرخ و مەڕ (ه). |
| هاوچون | وەکو یەك. |
| هەرامە | وانێك (ه) فلان. |
| هەمبەر | بەرانبەر (ه). |
| هەڵزنان | هەڵچون بەرەو باڵا (ه). |
| | هەڵزناو: بۆ فەرمودەی معلّق. |
| هەموگر | الشامل. |
| هەتەر | "١" مەودای حوکمی چاو "٢" سەروبەرکردنی تیر بەئامانج نەکەوتن "٣" سور لەسەر مەبەست (ه). |
| هەڵبەت | بێگومان، بێ سۆ (ه). |
| هەڵبواردن | خۆلێ لادان (ه). |
| | بواردن و پەڕاندنی شتێك لەناو چەند شتێکدا ناوبەناو (خ). |
| هەڕمێن | رمێن، برەو (ه). |
| هەمبانەبۆرینە | هەمبانەیەکە لە چیرۆکی کەونارادا. دەڵێن دەستیان تێ روکردوەو هەرچی ویستویانە تیابوەو بەدەستیانەوە هاتوە(ه). |
| هەژمارکردن | حیساب کردن. |
| هەوادار | لاگر (ه). لایەنگیر. |
| هەماهەنگی | التنسيق. |
| هاوژینێتی | التعايش. |
| هەموار | رێكوپێك کەوتو (ه).رێی خۆش. |

| | |
|---|---|
| هەزارەزیلە | کۆمەڵێ زۆر لە منداڵە ورتکە (ه). (إزدحام، ضوضاء، للناس والحشرات) (م). |
| هەڵبەستراو | (الموضوع)ی فەرمودەناسی. |
| هەڕەشەگار | النذیر. |
| هەڵوەستە | وێستانێکی کەم بە دیار شتێکەوە (خ). |
| هەندەکی | الجزئي. |
| هەموەکی | الکلي. |
| هەرد | شوێنی هەڵەتو بەردەڵانی (خ). |
| | عارد، زەوی، شاخی سەختو پڕبەرد (ه). |
| هەرەوەزی | گەلەکۆمەکی. |
| هەنگی | هەنگێ: ئەوسا، ئەودەم (ه). |
| هەنوکە | ئێستا (ه). هەوکە. |
| هەنگامە | هەراوهۆریا (ه). |
| هەڵکورمان | بڕێتی لەکزکردن لە لاپەڕو بندیواران (ه). |
| هەرزە | مەردومی هەڵەی چڵفڕ (خ). |
| | سەرسەختو لاسار (ه) (سفیه). |
| هزر | بیر، فکر (ه). |
| هێن | فیسار. |
| هێدمە | الصدمة. |
| هێکڕا | لەناکاو. |

ی

| | |
|---|---|
| یارانی رێبازو کۆمەڵ | أهل السنة والجماعة. |
| یادگە | الذاكرة. |
| یەکتا | تەنیای بێ وێنە (الأحد) (ه). |
| یەکخواناسی | یەکخواپەرستی، یەکتاناسی، خوابەیەکناسین، (التوحید). |
| یەکبینە | پەیدەرپەی (خ). |
| یەکڕاست | یەکەوسەر، دەستبەجێ. |

# ﴿ ڕشتەی بابەتەکان ﴾